نووسینی : ئی. ئێیچ. کار

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە
ئاسۆس محەمەد مەلاقادر



کوردستان ٢٠٠٥

# مێــــــــژوو چـــــییە؟

نووسینی

ئی. ئێیچ. کاڕ

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە

ئاســــۆس محەمــەد مـــەلا قادر

کوردستان - هەولێر
٢٠٠٥

**ناوی کتێب: مێژوو چییه؟**

- نووسینی: ئی. ئێیچ. کارِ
- وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: ئاسۆس محەمەد مەلا قادر
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- بەرگ: هۆگر سدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٥
- ژمارەی سپاردن: ١٢٨
- تیراژ: ١٠٠٠
- نرخ: ٢٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب - ١٥ - (١١٨)

**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

**هەولێر - پشت رۆژنامەی خەبات**

**پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@maktoob.com**

**ژمارەی تەلەفۆن: ٢٢٦٠٣١١**

# ناوەڕۆک

# کتێبەکانی پێنگوین

# مێژوو چییە؟

ئەدوارد هالیت کار لە ساڵی ١٨٩٢ لە دایکبووە، لە لەندەن لە قوتابخانەی مێرچنت تەیلەر خوێندویەتی و کۆلێژی سێینەیی پیرۆزی لە زانکۆی کێیمبرجدا تەواو کردووە، کە تییدا زانایەکی ترسنۆکانە بووەو لە کلاسیکناسیدا پلەی شەرەفی باڵای لە یەک کاتدا لە بنەمای دوو بابەتدا بەدەستهێناوە.

لە ساڵی ١٩١٦- دا بەشداری نووسینگەی دەرەوەی کردووەو دوای ئەرک و فەرمانێکی زۆر لەو نووسینگەیەدا لە دەرەوەو ناوەوەدا، پەیوەندی بە - F.O - وە کردووە، لە ساڵی ١٩٣٦-شدا وازیهێناوەو لە کۆلێژی زانکۆی وێلزدا، ئابریستویت، بۆتە پرۆفیسۆری وێلسن بۆ سیاسەتی نێو دەوڵەتی.

کار لە ١٩٤١-١٩٤٦ جێگری سەرنووسەری (Times) بووەو لە ١٩٥٣-١٩٥٥ مامۆستای فێرکەربووە لە کۆلێژی بالیۆل، ئۆکسفۆرد، لە ساڵی ١٩٥٥-دا بۆتە هاوڕێیەکی کۆلێژی سێینەی پیرۆز لە زانکۆی کێیمبرجدا و لە ١٩٦٦دا هاوڕێیەکی فەخری کۆلێژی بالیۆل بووە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد - دا.

لە ساڵی ١٩٢٠- شدا CBE بەدەستهێناوە.

سەبارەت بەکتێبەکەی «مێژووی رووسیایی شورەوی» وەک مێژوونووسێک باشترین ناوبانگی هەیە، بە شێوەیەک رۆژنامەی گاردیان «بەگرنگترین کارەکانی مێژوونووسێکی بەریتانی ئەم سەدەیە» ئاماژەی پێداوە، و رۆژنامەی تایمزیش بە «دەستکەوتێکی مێژوویی بەرچاوی» لە قەڵەمداوە.

لە ساڵی ١٩٤٥-دا دەستی بە مێژووەکەی کردو بۆ نزیکەی سی ساڵ کاری تێداکرد.

ئەم مێژووە چواردە بەرگە لەگەڵ پوختەیەک دەربارەی شۆڕشی رووسیا: لینین بۆ ستالین.

چەند بەشێکی مێژووەکە دەزگای پێنگوین بڵاویکردۆتەوە وەک: شۆڕشی بەلشەفی ١٩١٧-١٩٢٣ ( لە سێ بەرگدا)؛ پاشا گەردانییەکە (interregnum)، ١٩٢٣-١٩٢٤؛ سۆشیالیزم لە وڵاتێکدا، ١٩٢٤-١٩٢٦ (لە سێ بەرگدا)؛ هەروەها بناخەکانی ئابوورییەکی رەنگڕێژکراو ١٩٢٦-١٩٢٩ (لە دوو بەرگدا، بەرگی یەکەم ئار. دەبڵ یوو. دەیڤس هاوکاری نووسینەکەی کردووە).

بڵاوکراوەکانی دیکەشی بریتین لە: دەرکراوەکانی رۆمانتیک (١٩٣٣)، قەیرانی بیست ساڵە، ١٩١٩-١٩٣٩ (١٩٣٩)، مەرجەکانی ئاشتی (١٩٤٢)، کاریگەری سۆڤیەت لەسەر جیهانی

ڕۆژئاوا (١٩٤٦)، کۆمەڵگەی نوێ (١٩٥١) هەروەها لە ناپلیۆنەوە بۆ ستالین و چەند گوتارێکی دیکەش (١٩٨٠).

ئی. ئێیچ. کار لە ١٩٨٢-دا مردو ڕۆژنامەی تایمز لە ژیاننامەکەیدا ئەمەی نووسیوە، نووسینەکانی بەزۆری وەک شێوازەکەی گرنگ و بیرتیژبوون.

بەهۆی کارامەیی ناتەواوی نەشتەرگەر، کار توێکا زانی (anatomy) رابردووی ئەم دواییانەی دەرخست.. بێگومان شوێن پەنجەو کاریگەرییەکی بەهێزی لەسەر وەچەی مێژوونووس و بیرمەندە کۆمەڵایەتییەکانی دوابەدوای یەکدا بەجێهێشتووە.

ئار. دەبڵ یوو. دێیڤس، لە ساڵی ١٩٢٥-دا لە دایک بووە، پرۆفیسۆری فەخری توێژینەوە ئابوورییەکانی یەکیەتی سۆڤیەتیش بووە لە زانکۆی بێرمینگهام لەسەنتەری توێژینەوەکانی رووسی و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا، کە لە نێوان ساڵانی ١٩٦٣-١٩٧٨ بەڕێوەبەری ئەم سەنتەرە بووە.

دێیڤس لە زانکۆی لەندەن دەرچووەو لە زانکۆی بێرمینگهامیشدا پلەی دکتۆرای بەدەستهێناوە.

لە دانانی کتێبی بناخەکانی ئابوورییەکی ڕەنگرێژکراودا هاوبەشی ئی. ئێیچ. کار-ی کردووە، ١٩٢٦-١٩٢٩، بەرگی (پێنگوین، ١٩٧٤)، دوای ئەوە کاری لەسەر کتێبی چەند بەرگی، مێژووی پیشەسازی سۆڤیەت کردووە، کە بەرگی چوارەمی بەناوی قەیران و پەرەسەندن لە ئابووری سۆڤیەتدا ١٩٣١-١٩٣٣، لە ساڵی ١٩٩٥-دا بڵاوکرایەوە.

هەروەها چەند توێژینەوەیەکی دەربارەی یەکیەتی سۆڤیەت نووسیوەو بەچاپ گەیاندووە، کە نوێترییان بریتییە لە: مێژووی سۆڤیەت لە شۆڕشی گۆرباشۆڤدا.

ئی. ئێیچ. کار
مێژوو چی یە؟
جۆرج ماکۆلی تریڤلیان
چەند گەڵاڵە نامەیەکن لە
کانوونی یەکەم - ئاداری ١٩٦١
لە زانکۆی کێمبرجدا پێشکەشکراون.

چاپی دووەم
لەلایەن
ئار. دەبڵ یوو. دێیڤش
بەچاپ گەیەندراوە

# پێشەکی چاپی دووەم

کاتێک لە ساڵی ١٩٦٠ ڕەشنووسی یەکەمی شەش گەڵاڵەنامەی، مێژوو چییە،- م تەواوکرد، جیهانی ڕۆژئاوا هێژ لە گێژاوی دوو جەنگی جیهانی و دوو شۆڕشی مەزنی ڕووسیاو چیندا دەخولایەوە.

سەردەمی متمانە بەخۆبوونی بێ تاوانانەی ڤکتۆریا و باوەڕی ئۆتۆماتیکی بەپێشکەوتن، زۆر لە جێگەی خۆیان نەبوون.

جیهان شوێنێکی شڵەژاوبوو تەنانەت لە مەترسیش دابوو.

سەرەڕای ئەوە هێماکان بە شێوەیەک کەڵەکە بووبوون، کە لە چەند مەترسییەکمانەوە سەر هەڵبدەین. بە شێوەیەکی فراوان قەیرانی ئابووری جیهانی وەک دەرئەنجامێکی جەنگەکە بەربینی دەکرا، کەچی ڕووی نەدا. تاڕادەیەک بەبێ ئەوەی تێبینی ئەوە بکەین ئیمپراتۆریەتی بەریتانیمان لەبەریەک هەڵوەشاند.

قەیرانی هەنگاریا و سویز چەکەرەی دەکرد، یان خاخۆش دەبوو.

لە ستالین داماڵین لە یەکیەتی شوورەویدا و لە مەکارتی داماڵین لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، پێشکەوتنێکی سەنگینیان هێنایە ئاراوە.

ئەڵمانیا و ژاپۆن بەخێرایی لەکاولکاری تەواوی ساڵی ١٩٤٥ ڕزگاربوون و چەندین پێشکەوتنی ئابووری سەرنج ڕاکێشیان ئەنجامدا.

فەرەنساش لە سایەی دەستەڵاتی دوگۆل-دا هێز و توانای خۆی دووبارە زیندوو دەکردەوە.

لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاشدا دەردو چەڵەمەی ئایزن هاوەر کۆتایی پێدەهات؛ سەردەمی هیواو خۆشی کیندی -ش لە سەرووبەری بەرەبەیان دابوو. لە کەرەشەکان - باشووری ئەفریقا، ئێرلەندە، ڤیتنام- هێشتا ڕێگەی هاوڕێیەتیان لێدەگیرا.

بازاڕی دراو گۆڕینەوەش لەسەرتاسەری جیهاندا دەبوژایەوە.

بەهەرحاڵ، ئەم هەلومەرجانە پاساوێکی سەرزارەکیان دەهەنبەر گوزارشتکردن لە گەش بینی و باوەڕ بە داهاتوو ڕەخساند، کە گەڵاڵە نامەکانم لە ساڵی ١٩٦١-دا بەم هەلومەرجانە بەکۆتا هێنا.

ئەم هیوایانە و ئەم قایلبوونەش بیست ساڵ دواتر پووچەڵ بوونەوە.

جەنگی سارد بەچڕیەکی دوو ئەوەندەوە دەستی پێکردەوە، کە مەترسی چەکی ناوەکی دەرەکی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا.

قەیرانی دواکەوتووی ئابووری تۆڵە سەندنەوەیەکی هێنایە بوون و وڵاتە پیشەسازییەکانی کاولکردو شێرپەنجەی بیکاریشی لەسەرەتاسەری کۆمەڵگەی ڕۆژئاوادا بڵاوکردەوە.

بەدەگمەن وڵاتێک لەو دەمەدا لە دوژمنایەتی توندوتیژی و تیرۆریزیم بەدوورمایەوە.

شۆڕشی وڵاتە نەوت بەرهەمهێنەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست گۆڕانێکی گرنگی لە هێزدا بە زیانی نەتەوە پیشەسازییەکانی رۆژئاوا بەرپاکرد.

جیهانی سێیەم لە کارلێکراوە بەرەو پۆزەتیڤ و فاکتەرێکی جێگەی گومان لە کاروبارەکانی جیهاندا گوێزرایەوە. لەم هەلومەرجانەدا هەر گوزارشتکردنێک لە گەشبینی دەبێتە جێگای پێکەنین.

پێغەمبەرانی پەژارە لای خۆیانەوە هەموو شتێکیان هەیە.

وێنەی چارەنووسی مەترسیداری رۆژی دوایی، کە بەدرێژە پێدانێکی خۆڕاگرییەوە لەلایەن نووسەرو رۆژنامەنووسە سەرنج راکێش و هەستیارەکانەوە وێنەکرابوو لە رێگەی میدیاکانیشەوە دەگوێزرایەوە، فەرهەنگۆکی گفتوگۆ و قسەی رۆژانەی خزاندە نێوەوە.

بۆ چەندین سەدە بەربینیکردنێکی میللی کۆتایی جیهانی پێنەدەچوو گونجاو و راستبێت.

تا ئێستا هەستی هاوبەش دووپارێز و کۆتی گرنگ فیت دەدات.

یەکەمیان تایبەتمەنکردنی بێ هیوایییە بەداهاتووە هەرچەندە وای لێتێدەگەین لەسەر چەند راستییەکی نکوڵی لێنەکراو بنیادنرابێت، وەلێ هەر پێکهاتەیەکی تیۆری رووتە.

زۆربەی خەڵکی بە شێوەیەکی سادەو ساکار باوەڕ بەمە ناکەن، ئەم بێ باوەڕییەش لە هەڵسوکەوتیاندا روون و بەرچاو دەبێت.

خەڵکی خۆشەویستی دەکەن، وەچە دەخەنەوە (خێزانەکانیان سک پڕ دەکەن) زاووزێدەکەن و بەدڵسۆزییەکی زۆرەوە پەروەردەیان دەکەن.

سەرنجی قوڵ و تایبەتی و گشتی بەتەندروستی و پەروەردەکردن دەدرێ بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی وەچەی داهاتوو.

سەرچاوە نوێکانی وزە بەبەردەوامی دەدۆزرێنەوە. داهێنانە نوێکان کارایی بەرهەم زیاد دەکەن.

فرەیی، پاشەکەوتکارە بچووکەکان، لە قەواڵە پاشەکەوتکراوە نەتەوەییەکان و بنیادنانی کۆمەڵگە و یەکەمتمانە پێکراوەکان - دا دەخرێنە کار.

لە پێناو پاراستنی کەلەپووری نەتەوەیی و رۆنانسازی و شتی هونەری لە پێناو قازانج و سوودی وەچەکانی داهاتوودا، تاسە و هەوەسی بەندوباو پێشاندەدرێت. ئەوەش پاڵمان پێوە دەنێت بگەینە ئەو ئەنجامەی، کە باوەڕ بەقەڵاچۆکردنی زووینە بەگروهێک رۆشنبیری تووڕەو هەڵچووەوە بەندیوارە، کە بەرپرسی پشکی زۆرینەی چاوڕاوی باون.

کۆت و پارێزکردنی دووەم پێوەندە بە سەرچاوە جوگرافییەکانی ئەم بەربینی کردنانەی فەلاکەتی جیهانییەوە، کە بە شێوەیەکی بەندوباو پاوەنکراو، دەبێ بڵێم، ئەم فەلاکەتانە لە ئەوروپایی رۆژئاواو لقە دەریاییەکانییەوە سەرهەڵدەدەن.

ئەمەش جێگای سەرسوڕمان نییە.

ئەم وڵاتانە بۆ ماوەی پێنج سەدە سەروەرانی بێ رکەبەری جیهانبوون.

ئەو دەوڵەتانە دەبێ تاڕادەیەک بەماقوولییەوە بانگەشەی تیشکی شارستانی لە ناوەڕاستی جیهانێکی دەرەکی تاریکستانی بەربەریدا گوزارشتبکەن.

سەردەمێک، کە بەزۆری مەیدانخوازی ئەم بانگەشەیە دەکات و رەتیشی دەکاتەوە بەدڵنیاییەوە فەلاکەت دێنێتە ئاراوە.

ئەمانە هیچیان وەک یەک جێگای سەرسوڕمان نین، کە مەڵبەندی شڵەژان و مەڵبەندی قوڵترین بێ هیوایی رۆشنبیری لە بەریتانیا دا بن؛ لە هیچ شوێنێکی دیکەدا دژیەکی نێوان پایە و شکۆی سەدەی نۆزدەهەم و گەوجییەتی سەدەی بیستەم و دژیەکی نێوان هێز و توانایی سەدەی نۆزدەهەم و پایە نزمی سەدەی بیستەم، بەم شێوەیە کاریگەر و ئازاراوی نەبوو.

ئەم رەوشە دەرونیەش لەسەرتاسەری ئەوروپاو رەنگە بەڕادەیەکی کەمتریش لە باکووری ئەمریکادا بڵاوبووبێتەوە. هەموو ئەم دەوڵەتانەش بە شێوەیەکی چالاک بەشداری سەردەمی فراوانخوازی گەورەی سەدەی نۆزدەیانکرد، وەلێ بیانووم نیە نا پێم وابێ ئەم رەوشە دەروونیە لە شوێنی دیکەی جیهانیدا باوە.

لە لایەکەوە دانانی بەربەستی ئەستەم لەبەردەم پێوەندیکردندا و لە لایەکی تریشەوە بەردەوامی تکانی چاووڕاوەکانی جەنگی سارد هەر هەڵسەنگاندنێکی هەستیار دەرباری رەوش لە یەکیەتی شورەوی زەحمەتدەکەن.

وەلێ یەکێک کەم دەتوانێ باوەڕ بکات، کە لە وڵاتێکدا ژمارەیەکی زۆری خەڵکی دەبێ لەوە وریابن، کە بارودۆخەکان زۆر لە بارودۆخی بیست و پێنج یان پەنجا یان سەد ساڵێک بەر لە ئێستا، باشترن، بەهەرحاڵ سکاڵا بەند و باوەکانیان و بێ هیوایی فراوان دەربارەی داهاتوو بەسەر رەوشەکەدا - زاڵن.

هەریەک لە یابان و چین لە ئاسیادا هەریەکە بەرێگەی جیاوازی خۆیان لە پێگەیەکی بەرەو پێش چووندان.

لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقا، تەنانەت لەو ناوچانەشدا، کە لە باری شڵەژاوی و پاشاگەردانیش دان، ئەوا نەتەوە تازە پێگەیشتووەکان بە ئاراستەی داهاتوویەک کۆشش دەکەن، کە هەرچەندە بە شێوەیەکی کوێرانەیە، بەڵام باوەڕیان پێیەتی.

ئەنجامگیرییەکەم ئەوەیە، کە شەپۆلی گومانگەرایی و بێ هیوایی هەنووکە جگە لە کاولکردن و گەندەڵی هیچی تری لێ ناکەوێتەوە، هەروەها وەک شتێکی هاوپێچی ئاوەز هەر باوەڕێک بەپێشکەوتن یان هەر هیوایەک بە پێشکەوتنی زیاتر لە لایەن رەگەزی مرۆڤەوە بەلاوە دەنێت، بریتییە لە شێوەیەکی بژاردەگەرایی - بەرهەمی بژاردەی گروهە کۆمەڵایەتییەکان دەستەبەری و ئیمتیازاتەکانیان بە شێوەیەکی زەق و بەرچاو بە هۆی قەیرانەکەوە داماڵراوە، وڵاتە بژێردەکانیش سەردەستەیی بێ رکەبەریان لە باقی جیهاندا شکستی خوارد.

ڕۆشنبیران هەڵگری سەرەکی پەرچەمی ئەم بزووتنەوەیەن، خۆراک پێدەرەکانی ئایدیایی گروهی فەرمانڕەوای کۆمەڵایەتی، کە بەکاریدەهێنن (ئایدیاکانی کۆمەڵگەیەک ئایدیاکانی پۆلە فەرمانڕەواکەیەتی).

شتێکی گرنگ نییە، کە کۆمەڵێک ئەو ڕۆشنبیرانەی ئێمە نیازمانن ڕەنگە لە ئەسڵدا سەر بەچەند گروهێکی دیکەی کۆمەڵایەتی بن، بوونە ڕۆشنبیریش، سەبارەت بەوانە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەچنە نێو بژاردەی ڕۆشنبیرییەوە.

ڕۆشنبیرانیش بەپێناس گروهێکی بژاردە (êlite) دروستدەکەن. هەرچۆنێک بێت، ئەوەی لەم پیڤاژوودا گرنگتر بێت ئەوەیە، کە تەواوی گروهەکان لە کۆمەڵگەیەکدا واز لە ژمارەیەکی دیاریکراو تاسە و هەوەس و ڕاجیایی دەهێنن، بەهەرحاڵ توکمەشن (مێژوونووسیش بەزۆری لە هەڵسوکەوتکردن لەگەڵیاندا بەگومانەوە پاساو دەهێنێتەوە).

ئەمەش بەتایبەتی لە نێوان ڕۆشنبیراندا ڕوودەدات. ئاماژە بەگفتوگۆ ڕۆتینیەکانی نێوان ڕۆشنبیران نادەم، کە لەسەر بنچینەی قبووڵکردنی گشتی پێشینە گریمانکردنە سەرەکییەکانی کۆمەڵگە ئەنجامیان داون، بەڵکو ئاماژە بەمەیدانخوازییەکانی ئەم پێشینە گریمانکردنانە دەدەم.

لە کۆمەڵگە دیموکراتییەکانی ڕۆژئاوادا ئەم جۆرە مەیدانخوازیانە مادامێک بەژمارەیەکی دیاریکراوی بیر جیاوازەکانەوە بەندیوارین، لە خۆبردووشن، هەروەها ئەوانەی مەیدانخوازییەکان پێشکەشدەکەن دەتوانن خوێنەران و گوێگرانیش بدۆزنەوە.

ڕەنگە گاڵتەجاڕی بیر تەسک بڵێ، کە ئەوان بەخۆیان دەبوورن، چونکە نە ژمارەیان زۆرەو نە کاریگەری تەواویشیان هەیە تا ببن بەمەترسی.

بۆ ماوەی چل ساڵ زیاتر نازناوی، ڕۆشنبیرم لێبوو؛ بەڵام لەم ساڵانەی دوایدا بەزۆری وا خۆم دەهاتە بەرچاو و واش دەهێنرامە بەرچاو، کە ڕۆشنبیرێکی ڕا جیاوازبم.

ڕاڤەکردنێکیش لەبەردەستدایە.

دەبێ من یەکێبم لەو ژمارە کەمەی ڕۆشنبیران، هێز نووسینیان پەرەپێداوە، نەک لە ئەوپەڕی پەرەسەندا، بەڵکو لە زەردەپەڕی (after glow) ئاوابوونی سەردەمی باوەڕی ڤیکتۆری گەورەو گەشبینی دا، هەروەها تەنانەت ئەمڕۆش بۆ من زەحمەتە بیر لە جیهانێکی بەردەوام و لەبەریەک هەڵوەشاوی ئەستەم بۆ چارەسەرکردنی بکەمەوە. لەلاپەڕەکانی دوای دا هەوڵدەدەم خۆم لە خواستە باوەکانی نێوان ڕۆشنبیرانی ڕۆژئاوا بەدوور بگرم، بەتایبەتیش ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆی وڵاتەکەم، تاوەکو پێشانی بدەم چۆن و بۆچی پێم وایە ئەوان لەڕێی ڕاستەقینە لایانداوەو بەهەرحاڵ لە بارەی داهاتووشەوە بانگەشەی تێڕوانینێکی هاوسەنگتر و ماقوڵتر بکەم، ئەگەر بۆ گەشبینییەک نەبێت.

## یەکەم

# مێژوونووس و راستیەکانی

مێژوو چییە؟ نەبادا هەر یەکێک وابیربکاتەوە پرسیارەکە بێ مانایە یان زێدەیە، دوو بڕگەی یەک بە دوای یەکی پێوەند بەچاپی یەکەم و دووەمی، مێژووی کێیمبرجی مۆدێرن، وەک دەقێکم دەهێنم.

ئاکتن لە راپۆرتی تشرینی یەکەمی (١٨٩٦-دا بۆ کارمەندانی چاپخانەی زانکۆی کێیمبرج دەربارەی ئەو کارەی بۆ چاپکردن لە ئەستۆی گرتبوو، دەڵێ:

هەلێکی ناوازەی تۆمارکردنە، بەرێگەیەک زۆرترین سوودی بۆ زۆرترین ژمارە هەبێ، تەواوی ئەو مەعریفەیەی، کە سەدەی نۆزدەهەم خەریکە بەدەستیەوە بدات...

بە هۆی دابەشکردنی دادپەروەرانەی کـــار دەتوانین ئەوە بکەین، هەروەها بۆ ئەوەی دوا بەڵگەنامە و پێگەیشتووترین دەرئەنجامەکانی توێژینەوەی نێودەوڵەتی بگاتە دەستی هەموو مرۆڤێک.

ناتوانین لەم وەچەیەدا مێژووی کۆتایمان هەبێت؛ وەلێ دەتوانین لە بارەی مێژووی تەقلیدی (یان زاراوەیی)- یەوە هەڵسوکەوت بکەین، هەروەها دەتوانین ئەو خاڵەی لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی دیکە لەسەر رێگاکە پێیگەیوین، نیشانبدەین، بە شێوەیەک ئێستا تەواوی زانیارییەکان لەبەردەستدان، هەموو پرسێکیش دەتوانرێ چارەسەر بکرێ[1].

کتومت نزیکەی شەست ساڵ دواتر پرۆفیسۆر جۆرج کلارک لە پێشەکیە گشتییەکەیدا بۆ چاپی دووەمی مێژووی هاوچەرخی کێیمبرج رەخنەی لەم باوەڕەی ئاکتن و هاوکارەکانی گرتووە، بە شێوەیەک دەشێ رۆژێک لە رۆژان، مێژووی کۆتایی بهێندرێتە ئاراوە، بەردەوامبووەو دەڵێ:

مێژوونووسەکانی وەچەیەک دواتر چاوەڕێی هیچ جۆرە هیواو ئاواتێکی لەم چەشنە ناکەن. ئەوان وا پێشبینی کارەکەیان دەکەن، کە چەندین بارە جێگای یەکتری بگرنەوە.

ئەوان وا دادەنێن، کە مەعریفەی رابردوو لە رێگەی عەقڵێک یان زیاتر لە عەقڵێکی مرۆڤەوە گەیشتۆتە ئێمە و لەلایەن ئەوانە پرۆسێس کراوە، جا لەبەر ئەوە ناتوانرێ لە گەردیلەی کرۆکی رووت پێکبهێنرێت، کە ناتوانن هیچ شتێک بگۆڕن... وادیارە دۆزینکارییەکە بێ کۆتاییە، و هەندێک زانای بێ ئارام پەنا دەبەنە بەر گومانگەرایی، یان بەلایەنی کەمەوە لەو بنەمایەدا، کە هەر یەکێکیان لەویتر دەچێ و راستییەکی «بابەتیانە»ی مێژووی نییە، چونکە تەواوی بڕیارە مێژووییەکان کەسەکان و تێڕوانینەکانیش دەگرنەوە [٢].

لە هەر کوێیەک زاناکان هەریەک بەم جۆرە ئابڕۆبەرییەوە دژی ئەوەی تریان بوو، بوار بۆ لێکۆڵینەوە کراوە دەبێت. هیوام وایە، کە ئاستی توانستەکیم (up- to - date) ئەوەندە بێ، کە بزانم هەر شتێک لە ١٨٩٠-ەکاندا نووسرابێت دەبێ بێ مانا بێت.

وەلێ هێژ ئەوەندەش پێشکەوتوونیم خۆم بەدەست ئەو تێڕوانینەوە بدەم، کە هەر شتێک لە ١٩٥٠-کاندا نووسرابێت پێویستە بەمانابێ.

لە راستیدا، رەنگە پێشتر بەسەر دڵتدا هاتبێت، کە ئەم لێکۆڵینەوەیە لادەداتە نێو هەندێک شت تەنانەت لە سروشتی مێژووش فراوانترن.

کێشمە و بەیەکدادانی نێوان ئاکتن و سێر جۆرک کلارک بریتییە لە رەنگدانەوەیەکی گۆڕانەکە لە تێڕوانینی گشتیماندا دەربارەی کۆمەڵگە لە ماوەی نێوان ئەم دوو راگەیاندنەدا.

ئاکتن بەئاشکرایی قسە لە بارەی باوەڕی راستەقینە و بیر روونی شیکردنەوەی بێ لایەنانەی متمانە بەخۆکردنی سەردەمی دواتری فیکتۆری، دەکات؛ سێر جۆرج کلارک بێ ئاگایی و شێواوی گومانگەرایی وەچەی وجودی دەنگدەداتەوە.

کاتێک هەوڵدەدەین وەڵامی پرسیاری، مێژوو چییە؟ بدەینەوە بە شێوەیەکی هۆشیارانە بێت یان ناهۆشیارانە بێت وەڵامەکان پێگەمان لەکاتدا رەنگدەداتەوەو بەشێک لە وەڵامی پرسیارێکی فراوانتر پێک دەهێنێت، ئەویش ئەوەیە چ تێڕوانینێکمان هەیە لە بارەی ئەو کۆمەڵگایەی کە تێیدا دەژیین.

ترسم لەوە نییە، کە رەنگە بابەتەکەم بەپشکینینێکی وردتر بێ هودە دەرچێ.

تەنها لەوە دەترسم، کە رەنگە سەرکێشش بم لە دەرگای پرسیارێکی زۆر گەورەو گرنگ بدەم.

سەدەی نۆزدەهەم دەهەنبەر راستییەکان سەردەمێکی گرنگ بوو.

«مستەر گراد گریند لە پەرتووکی سەردەمە سەختەکاندا گوتویەتی، ئەوەی دەمەوێ بیڵێم راستییەکانە... تەنها راستین لە ژیاندا دەویسترێن.

مێژوونووسانی سەدەی نۆزدەهەم بەگشتی بەقسەکەی قایلبوون.

کاتێک رانکە لە ١٨٣٠-یەکاندا لە نەقایلبوونێکی لۆژیکیدا لە دژی بەئاکارکردنی مێژوودا، تێبینی ئەوەیکرد، کە ئەرکی مێژوونووس ئەوەبوو، بەسادەیی پیشاندانی ئەوەی لەراستیدا چۆن بووە (wie es eigentlich gewesen)، ئەمەش دانایییەکی قوڵ نییە سەرکەوتنێکی سەرسوڕهێنەرانەی هەبوویێت.

سێ وەچەی مێژوونووسانی ئەڵمانی و بەریتانی و تەنانەت فەرەنسیش دەچوونە جەنگەوە واژە جادووییەکانیان دەگوتەوە، (ewie es eigentlich gewesen) وەک نووشتەیەکی دروستکراو، وەک تەواوی نووشتەکانی دیکە بۆ ئەوەی لەماندوبوونی ناچاربوونی بیرکردنەوە لە بارەی خۆیانەوە بیان پارێزن.

بابەتگەراکان سەنگ و کاریگەری خۆیان بۆ ئەم پەرستنەی راستییەکان هاوبەشکردووەو دڵ بەگومانیش لە داکوتانی بانگەشەکەیان بۆ مێژوو وەک زانستێک. بابەتگەراکان گوتویانە یەکەم جار راستییەکان لە رێگەی ئەزموونەوە بزانەوەو دواجار دەرئەنجامەکانت لەو راستیانەوە هەڵبهێنجە.

لە بەریتانیای گەورەدا، ئەم تێڕوانینە دەربارەی مێژوو بەتەواوی دەقاودەقی ئەو لایسایییە ئەزموون چییە بوو، کە لە لۆکە (Locke)ەوە بۆ بیرتراند رووسڵ هێڵی لێککشانی بەندوو بایوو لە فەلسەفەی بەریتانیدا. تیۆری ئەزموونی مەعریفە جیابوونەوەیەکی تەواو لە نێوان خودو بابەت - دا پێشینە گریماندەکات.

راستییەکان وەک لێ وردبوونەوە هەستییەکان لە دەرەوە کار دەکەنە سەر سەرنج دەرو وابەستەی هۆشیارییەکەشی نابن.

پرۆسێسی وەرگرتنەکە کارلێکراوە: زانیارییە سەرەتاییەکان وەرگیراون، دواجار مێژوونووس کاریان لەسەر دەکات. فەرهەنگی بچووکی ئۆکسفۆردی ئینگلیزی، فەرهەنگێکی بەسوودە، بەڵام بەلای کاری فێرگەی ئەزموونی - دا دەکا، کە بەئاشکرایی جیاوازی دوو پرۆسێس بە بێسناسکردنی راستییەک دەردەخات «ک» زانیارییەکانی لە شارەزاییەوە چنگ دەکەون لەدەرئەنجامەکان جیاوازن. رەنگە ئەمەش ئەوەبێ، کە پێی دەگوترێ تێڕوانینی ئەزموونی زیندەگی مێژوو.

مێژوو لە جەستەیەکی راستییە تەتەڵەکراوەکان (ascertaine) پێک دێت.

راستییەکان لە بەڵگەنامەکان و نووسینەکان و هتد... دا چنگ مێژوونووس دەکەون، وەک

ماسی لەسەر خوانی ماسی فرۆشدا دەستدەکەوێت.

مێژوونووس کۆیاندەکاتەوەو دەیانباتە ماڵەوەو لێیان دەنێ و بە چ شێوازێک حەزی لێیان بێ بەکاریاندەهێنێ. ئاکتن چێژەکانی چێشتلێنانی زۆر سادەبوون و دەیویست بەسادەیی بەکاریانبهێنێت.

ئاکتن لە نامەی زانیارییەکانیدا بۆ دانەرە هاوبەشەکانی چاپی یەکەمی، مێژووی هاوچەرخی کێیمبرج، داوای ئەوەی ئاشکرا کرد کە دەبێ جەنگی واترلوو فەڕەنسی و ئینگلیز و ئەڵمانی و هۆڵەندییەکان بەیەکەوە وەک یەک قایل بکات؛ بە شێوەیەک کەس بەبێ تاقیکردنەوەی لیستی دانەران نەتوانێ بڵێ قەشەی ئۆکسفۆرد لە کوێ خامەی دانا، یان فێربێرن یان گاسکیت و لیبەرمان یان هاریسن ئەوەیان بەجێ گەیاند(٣).

تەنانەت سێر جۆرج کلارک، هەرچەندە هەڵوێستێکی رەخنەیی لە بەرامبەر ئاکتن - دا دەگرێتە بەر، ئەوا خۆی دژی «کرۆکی قایمی راستییەکانە، لە مێژوودا و، کرۆکی دەوردراو بەبەرگێکی شیاو بەگفتوگۆی راڤەکردن» پێدەچێ ئەوەی لەبیرکردبێ، کە بەشی کرۆکی میوە لە کرۆکە رەقەکە بەکەڵکترە.

یەکەم جار راستییەکانت بەڕاستی بەدەستبهێنەو دواجار بخزێ ناو مەترسی گۆڕانی وردە لمەکانەوە بە شێوەیەک بریتییە لە ژێری کۆتایی ئەزموونی و ئەزموونی زیندەگی قوتابخانەی مێژوو.

ئەوەش گوتەی ویستراوی رۆژنامەنووسی گەورە سی پی. سکۆت دێنێتەوە یاد: راستییەکان پیرۆزن، بەڵام بۆچوونەکان بەلاشن.

ئێستا کە بەئاشکرایی ئەوە نییە و نابێت. ناچمە سەر گفتوگۆکردنێکی فەلسەفی دەربارەی سروشتی مەعریفەی رابردوو.

لەبەر ئەم ئامانجانە با ئەو راستییە گریمان بکەین، کە قەیسەر لە رووباری رۆبیکن پەڕییەوەو ئەو راستییەش، کە مێزێک لە ناوەڕاستی ژوورێکدا هەیە هەردووکیان بریتین لە راستی وەک یەک یان دەکرێ بەراورد بکرێن، بەشێوەیەک هەریەک لەم دوو راستییانە هۆشیاریمان دەبەنە ناو هەمان شێواز یان شێوازێک بەراوردبکرێ یان ئەوەتا هەردووکیان هەمان تایبەمەندی بابەتیان هەیە بەهۆی بەندیواربوون بەو کەسەوە، کە دەیانناسێ. وەلێ تەنانەت لەسەر بنچینەی ئەم سەرکێشی و ناماقوڵی تەواوی گریمانەکە، گفتوگۆکەمان لەم بارەدا بەو ئاستەنگە دەکەن، کە تەواوی راستییەکان لە بارەی رابردووەو راستی مێژووی نین، یان بەگومانەوە لەلایەن مێژوونووسانەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت.

ئەو پێوەندگە کامەیە کە ڕاستییەکانی مێژوو لە ڕاستییەکانی دیکە دەربارەی ڕابردوو جیا دەکاتەوە؟

ڕاستی مێژووی چییە؟ ئەمە پرسیارێکی گرنگە، کە دەبێ کەمێک وردتر تێی بڕوانین.

بەگوێرەی تێڕوانینی ئەزموونی زیندەگی، کۆمەڵێک ڕاستی بنچینەیی دیاریکراو هەن، کە بۆ هەموو مێژوونووسان وەک یەکن و، گەرمۆڵەت هەبێ بڵێین، بڕبڕەی پشتی مێژوو پێکدەهێنن- بۆ نموونە، ڕاستییەکە ئەوەیە، کە جەنگی هاستینگز لە ساڵی ١٠٦٦دا ڕوویداوە. بەڵام ئەم تێڕوانینە دوو سەرنجدانی دەوێ. سەرنجی یەکەم: ئەو کارەی بەپلەی یەکەم مێژوونووس خەریکی دەبێ وەک ئەم ڕاستیانە نین.

گومانی تێدا نییە گرنگە بزاندرێ، کە جەنگی گەورە لە ١٠٦٦دا ڕوویداوە نەک لە ١٠٦٥یان ١٠٦٧دا، هەروەها گرنگە بزاندرێ، کە لە هاستینگز- دا ڕوویداوە نەک لە ئیستبوورن یان برایتن - دا

دەبێ مێژوونووس ئەم شتانە بەهەڵە کۆنەکاتەوە. وەلێ کاتێک خاڵ گەلێکی بەم شێوەیە دەکەونە بەرچاو» ئەوا گوتەی هاوزمانم دێتەوە یاد، کە وردی و دروستی ئەرکە، نەک چاکە.(٤)

پەسنکردنی مێژوونووسێک لەبەر وردی و دروستییەکەی وەک پەسنکردنی بیناسازێک وایە لەبەر بەکارهێنانی تەختەی باش یان لەبەر بەکارهێنانی کۆنکرێتی باش تێکەڵ کراو لە بیناکەیدا، هەروەک دەشێ.

ئەمەش مەرجێکی پێویستی کارەکەیەتی، بەڵام ئەرکە سەرەکییەکەی نییە.

کت و مت ئەمەش ئەم جۆرە کارەیە، کە ماف بە مێژوونووس دەدات پشت بەزانستە یارمەتی دەرەکانی مێژوو ببەستێت وەک - شوێنەوارناسی، نەخش و نیگارناسی کۆن، دراو ناسی و کرۆنۆلۆژیاو هتد.

مێژوونووس داوا ناکات کارامەیی تایبەتی هەبێت، وەک ئەوەی پسپۆر دەتوانێ بنەچەک و سەردەمی پارچە گڵێنەیەک یان مەرمەڕ دیاریبکات، یان دەتوانێ نووسینێکی نارِوون شیبکاتەوەو بخوێنێتەوە، یان حیسابێکی دوورو درێژی گەردوونی پێویست ئەنجامبدات بۆ چەسپاندنی مێژوویەکی ورد و دروست.

ئەو ڕاستیانەی پێیان دەگوترێت ڕاستی بنچینەیی و بۆ هەموو مێژوونووسەکان وەک یەکن و بە شێوەیەکی گشتی زیاتر دەگەڕێنەوە سەر پۆلی ماددە خاوەکانی مێژوو تا خودی مێژوو.

سەرنجی دووەم ئەوەیە، کە پێداویستی چەسپاندنی ئەم ڕاستییە بنچینەییانە لەسەر هەر

جۆرایەتییەک لە خودی راستییەکاندا ناوەستێ، بەڵکو لەسەر ئەو بڕیارە پێشوەختە دەوەستێ، کە مێژوونووس داویەتی.

جگە لە دروشمی سی. پی سکۆت، ئەمڕۆ هەموو رۆژنامەنووسێک دەزانێ، کاراترین رێگە بۆ کاریگەری لەسەر راووبۆچوون بریتییە لەوەی بە هۆی هەڵبژاردن و رێکخستنی راستییە گونجاوەکانەوەیە.

بەبڵاوی گوتراوە، کە راستییەکان لە بارەی خۆیانەوە قسە دەکەن.

بێگومان ئەمەش راست نییە.

راستییەکان تەنها کاتێک قسە دەکەن، کە مێژوونووس داوایان لێبکات: ئەوەش ئەوەیە، کە مێژوونووس بڕیار دەدات بنچینەیەک بۆ ئەم راستیانە دابنێت و هەر ئەویشە بڕیاردەدات بە چ شێوەیەک پەیڤاژوویێک بێت.

پێم وایە یەکێک بووە لە کەسایەتییەکانی پیراندیلۆ، کە گوتوویەتی راستی وەک گونییە وایە - بەڕێکو ڕەپی ناوەستێ تاکو هەندێک شتی تێدا دانەنێی.

تاکە هۆکاری ئەوەی بۆچی بزانین، کە جەنگەکە لە هاستینگز لە ساڵی ١٠٦٦-دا روویداوە ئەوەیە مێژوونووسان ئەو رووداوە بە بوویەرێکی مێژوویی گەورە دادەنێن.

ئەوەش مێژوونووسە لە پێناو چەند هۆکارێکی خودی خۆیدا بڕیار دەدات، کە پەڕینەوەی قەیسەر لە رووبارێکی بچووکی وەک روبیکن بریتی بێ لە راستییەکی مێژوویی، لەکاتێکدا بەملیۆنان خەڵکی دیکەی پێشتر یان دواتر لەم رووبارە پەڕیونەتەوە، کەچی بە هیچ گلۆجێک سەرنجی هیچ کەسێکی رانەکێشا.

ئەو راستییەی، کە تۆ نیو کاتژمێر بەر لە ئێستا بەپێ، یان بەپایسکلێ، یان بەئۆتۆمبیلێک گەیشتوویتە ئەم بینایە، هەر راستییەکە دەربارەی رابردوو کت و مت وەک ئەو راستییەیە، کە قەیسەر لە رووباری روبیکن پەڕیوەتەوە.

بەڵام رەنگە ئەمە لەلایەن مێژوونووسانەوە پشتگوێ بخرێ.

پرۆفیسۆر تالکۆت پارسنس جارێک رایگەیاند، کە زانست بریتییە لە، پێڕۆیەکی هەڵبژێری مەعریفی دیاردیدەر بەراستی[٥].

رەنگە لە تواناشدا هەبێت بەشێوەیەکی سادەتر دابنرێ. وەلێ مێژوو ئەوەیە، کە لەنێو شتەکانی دیکە دایە. مێژوونووس وەک پێویست دەبێ هەڵبژێر بێ.

باوەڕکردن بەکرۆکی رەقی راستییە مێژووییەکانی بەشێوەیەکی بابەتی و سەربەخۆیانە دەربارەی

مێژوونووس هەن و بریتییە لە هەڵەیەکی پێچەوانەی سروشت، تەنانەت زۆر ئەستەمە ریشەکێش بکرێت.

با بڕوانینە ئەو پرۆسێسەی، کە بەهۆیەوە راستییەکی رووت دەربارەی رابردوو دەبێتە راستییەکی مێژوو.

لە ساڵی ۱۸۵۰- لە ستالی بریج وێیکز لە ئەنجامی چەند کێشەیەکی بچووکدا، جەماوەرێکی تووڕە بە ئەنقەست تا مردن بەشەق لە فرۆشیارێکی نانی زەنجەفیل - یان هەڵدا.

ئایا ئەمە راستییەکی مێژووییە؟ بێ دوودڵی ساڵێک بەر لە ئێستا دەمگوت، نەخێر و لەلایەن شایەت حاڵێکەوە لە چەند یادگارییەکی کەم زانراودا تۆمارکراوە[٦]؛ وەلێ نەمبینی مێژوونووسێک بەشایەنی باسکردنی بزانێ.

دکتۆر کیتسن کلارک لەگەڵاڵە نامەیەکی فۆردیدا لە زانکۆی ئۆکسفۆرد-دا[٧] ئاماژەی بەوەدا، ئایا ئەوە دەبێتە راستییەکی مێژوویی؟ هێژ پێم وایە نەخێر.

پێشنیار دەکەم ئەو رەوشەی ئێستا ئەوەیە، کە بۆ ئەندامییەتی هەڵبژاردنی یانەی راستییە مێژووییەکان پێشنیارکراوە.

ئەوەش ئێستاکە پشتیوانێک و کۆمەڵێک دەستەبەر (sponsors)-یشی دەوێ.

رەنگە لە ماوەی چەند ساڵێکی داهاتووی کەمدا ئەم راستییە یەکەم جار لە پەراوێزەکانی گوتارو کتێبەکانی دەربارەی سەدەی نۆزدەهەمی بەریتانیان، دەربکەوێت و دواتر لەدەقەکەدا دەربکەوێت، ئینجا رەنگە لە ماوەی بیست تا سێ ساڵدا ببێتە راستییەکی چەسپاوی مێژوویی.

بەپێچەوانەوە، لەوانەیە هیچ کەسێک ئەوە ئەنجام نەدات، لەم بارەشەدا دەچێتەوە نێو بار خراپی جیهانی لە بیرکراوی راستییە مێژووییەکانی کە دەربارەی رابردوون، لەوەشەوە دکتۆر کیستون کلارک بەگیانێکی ئازایانەوە هەوڵیدا لەوە رزگاریبکات.

چییە ئەوەی بڕیاردەدا کامە لەم دوو رووداوانە روودەدا؟ پێم وایە ئەم کارە یان ئەوەتا وابەستەی تێزەکە دەبێت یان وابەستەدا راڤەکردنەکە دەبێت، کە بەپشتیوانی ئەوەش دکتۆر کیتسن کلارک ئاماژەی بەم رووداوە داوە، کە مێژوونووسەکانی دیکەش وەک شتێکی شەرعی و گرنگ قبوڵی دەکەن.

وەک راستییەکی مێژوویی رەنگە پێگەکەی بەرووی پرسی شرۆڤە و راڤەکردندا بکرێتەوە.

ئەم رەگەزەی راڤەکردنیش دەچێتە ناو هەموو راستییەکی مێژووەوە.

ئایا بوارم دەبێ یادەوەرییەکی کەسێ باس بکەم؟

کاتێک چەندین ساڵ بەر لە ئێستا لەم زانکۆیەدا وانەی مێژووی کۆنم دەگوتەوە، وەک

بابەتێکی تایبەت، یۆنان لەسەردەمی جەنگەکانی فارسدا - م هەبووە؛ دوازدە تا پازدە بەرگم لەسەر ڕەفەکانمدا کۆکردەوەو ڕاستییەکانم لەناو ئەم بەرگانەدا تۆمارکردو پێم وابوو هەموو ڕاستییەکی پێوەند بەم بابەتەوەوە لەوێدا هەیە.

با گریمان بکەین ئەو کارە زۆر لە ڕاستییەوە نزیک بوو، کە ئەو بەرگانە تەواوی ئەو ڕاستیانەیان لە خۆ دەگرت، کە دەربارەی بابەتەکە بوون، لەوانەی دواتر زاندرابوون، یان دەکرا بزاندرێن.

هەرگیز بەسەر دڵمدا نەهات لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەوە بکەم بە چ ڕووداوێک یان بەچ پرۆسێسێکی بەریەک کەوتنەوە ئەو هەڵبژاردنە بچووکەی ڕاستییەکان لە نێوان دە هەزار ڕاستیدا، کە کەسێک زانیونی، بەزیندوویی ماونەتەوە تا دەبنە ڕاستی مێژوو گوماندەبم، کە تەنانەت ئەمڕۆکەش یەکێک لەچاو پیسییەکانی مێژوویی کۆن و ناوەڕاست ئەوەیە وەهمی ئەوەمان پێدەبەخشێ، کە تەواوی ئەو ڕاستیانەی لەبەردەستماندان لە چوارچێوەیەکی ئاسان بۆ کۆنترۆڵکردن دان: جیاکردنەوەی بێزار کەرانە (Nagging) لە نێوان ڕاستییەکانی مێژوو - و - ڕاستییەکانی دیکە دەربارەی ڕابردوو لەبەرچاو وندەبێ، چونکە ڕاستییەکەم زاندراوەکانیش هەموویان ڕاستی مێژوون.

هەروەک بێری، کە هەر لەسەردەمەکانی مێژووی کۆن و ناوەڕاستدا کاریکردووە، گوتویەتی، تۆمارەکانی مێژووی کۆن و ناوەڕاست بەکون و کەلەبەر ڕازێندراونەتەوە.

مێژووی بە باگوزەیەگی(*) نەقشی گەورەی خودان چەند بەشێکی لە دەستدراو ناوزەند کردووە[٨]. وەلێ ترسی سەرەکی لە کون و کەلەبەرەکاندا نییە.

وێنەکەمان، دەربارەی گریک لەسەدەی پانزەی پێش زایندا بە شێوەیەکی سەرەکی لەبەر ئەوە ناتەواو نییە چونکە زۆربەی هەرە زۆری بەشەکانی بەرێکەوت لە دەست چوونە، بەڵکو بەگشتی لەبەرئەوەیە وێنەیەکە گروهێکی بچووکی خەڵک لە شاری ئەتینا کێشاویانە. تەواوێک دەزانین دەربارەی ئەوەی گریکی سەدەی پێنجەم تێڕوانینی چی بووە دەربارەی هاوولاتییەکی ئەتینی؛ بەڵام زۆر بە ئەستەم دەزانین دەربارەی تێڕوانینی گریکییەک بۆ هاوولاتییەکی سپارتایی و کۆڕنیتییەک یان تیبییەک - ناو نەهێنانی فارسێک، یان کۆیلەیەک یان ناهاوولاتیە نیشتەجێبووەکانی دیکە لە ئەتینیدا. وێنەکەمان پێشینە هەڵبژێردراو پێشینە دیاریکراوە ئەمەش بەزۆری بەهۆی ڕێکەوتەوە نییە ئەوەندەی خەڵکی بەهۆشیاری یان بەبێ هۆشیاری بەتێڕوانینێکی تایبەتی فکرەیەی ئەو ڕاستیانە چۆشدراون کە پشتیوانی ئەو تێڕوانینەی شایانی پاراستنە دەکەن. بەهەمان شێوەیە، کاتێک لە مێژووی هاوچەرخ - دا دەربارەی ئەو سەردەمانەم خوێندەوە، کە خەڵکی سەردەمەکانی

ناوەڕاست بەدڵ خەریکی ئاین بوونە، ئەوا سەرم سوڕدەمێنێ، چۆن ئەمە بزانین، ئینجا ئەگەر ڕاستیش بێ هەموو ئەوانەی دەربارەی مێژووی ناوەڕاست بە، ڕاستی - یان دەزانین تاڕادەیەک هەموویان لەلایەن وەچەی ئەو مێژوونووسە هەواڵیانەوە بۆ ئێمە هەڵبژێردراون، کە لەڕووی کارەوە لە تیۆر و پراکتیزی ئایندا کاریاندەکرد، و لەبەر ئەوە پێیان وابوو ئەوە زۆر گرنگە و هەموو شتێکی پێوەند بەمەشیان تۆمار دەکرد. نەک شتی دیکە.

وێنەی جووتیاری ڕووسی وەک لە خواترسێکی ئایندار بەهۆیی شۆڕشی ١٩١٧-ەوە تارومارکرا.

وێنەی مرۆڤی چەرخی ناوەڕاست وەک ئایندارێکی لە خواترس، ئینجا ڕاست بێ یا ڕاست نەبێ، شتێکی تێک نەشکاوە، چونکە نزیکەی تەواوی ئەو ڕاستیانەی دەربارەی ئەو مرۆڤەن، خەڵکانێک بۆ ئێمە پێشینە هەڵبژێراوی کردوون، کە باوەڕیان بەوە هەبووەو ویستویانە خەڵکی دیکەش باوەڕیان بەوە هەبێ، کۆمەڵێکی دیکەش، کە دەشیا بەڵگەی دژیەکیمان تیایاندا پیرۆزبیایەوە، لەنێو باساندا نەماون.

کاریگەری (dead hand) وەچەی مێژوونووس و نووسەر و مێژوو گێڕەوەکانی پێش ئێستا بەبێ گونجاویەتی دووبارە بوونەوەی نموونەی ڕابردوو، بڕیاری لەسەر دراوەو دیاریکراوە.

پرۆفیسۆر باراکلۆ، کە خۆی وەک پسپۆری چەرخەکانی ناوەڕاست ڕاهێنابوو، دەنووسێت: هەر چەندە مێژوو لەسەر ڕاستی بنیادنراوە، بەڵام لەڕاستیدا بە هیچ شێوەیەک شتێکی ڕاست نییە، بەڵکو بریتییە لە زنجیرەیەک بڕیاری قبوڵکراو[٩].

با بێینەوە سەر ڕەوش و هەلومەرجی مێژوونووسی هاوچەرخ، بەڵام بەمەترسییەکی وەک یەکەوە.

پێدەچێ مێژوونووسی کۆن یان چەرخی ناوەڕاست سوپاسگوزاری ئەو پرۆسێسەی شەنەکردنە (winwowing)بێ، کە بەتێپەڕینی ڕۆژگار بەشی سەرەکی ڕاستییە مێژووییەکانی خستۆتە بەردەستییەوە.

هەروەک لیتۆن ستراچی بەشێوازە ئازاردەرەکەی گوتوویەتی ، نەزانی پێداویستی سەرەکی مێژوونووسە، نەزانییەک سادە بکات و شت و ڕوونبکاتەوە، نەزانییەک هەڵبژێرێ و ڕەتبکاتەوە[١٠].

کاتێک فیت دەدرێم، هەروەک هەندێک جار وام، ئێرەیی بە ئەوپەڕی لێهاتوویی هاوڕێکانم ببەم، ئەوانەی مێژوویی کۆن و ناوەڕاستیان دەنووسن، لە بیرکردن لەو ڕەنگدانەوەیەدا دەبینم، کە بە شێوەیەکی سەرەکی ئەوان زۆر لێهاتوون، چونکە ئەوان زۆر لە بابەتەکەیان بێ ئاگان.

مێژوونووسی هاوچەرخ هیچ تایبەتمەندییەکی ئەم بێ ئاگاییەی نییە.

مێژوونووسی هاوچەرخ پێویستە ئەم نەزانییە پێویست و سەرەکییە بە وشیارانە بۆ خۆی لە ئەستۆ بگرێت - هەر چەندە زیاتر بێ ئەوەندە لەسەردەمەکانی خۆی نزیک دەبێتەوە. ئەو مێژوونووسە ئەرکێکی دوولایەنەی هەیە لە دۆزینەوەی چەند راستییەکی گرنگداو ئینجا کردنیان بەراستی مێژوو، هەروەها فرێدانی زۆربەی راستییە کەم بایەخەکانی وەک چەند شتێکی نا مێژوویی.

وەلێ ئەم بۆچوونە زۆر دژی هەرتەکە (Heresy)- ی سەدەی نۆزدەهەمە، کە پێی وابوو مێژوو لە کۆمەلێک بەلگەنامەی ئەوپەڕی ژمارە زۆر و کۆمەلێک راستی بابەتی کلۆلی لێنەکراو پێک دێت.

هەر کەسێکیش ملکەچی ئەم هەرتەکەیە بێت، یا ئەوەتا دەبێ وەک کارێکی خراپ واز لە مێژوو بێنێ، یان پەنا بباتە بەر کۆکردنەوەی مۆر، یان هەندێ شێوەی دیکەی شوێنەوارناسی، یان لە شێتخانەدا کۆتایی پێ بێت.

ئەمەش بریتییە لەو هەر تەکەیەی لە ماوەی سەدەی رابردوودا کاریگەرییەکی رووخێنەری لەسەر مێژوونووسی هاوچەرخ و مێژوونووسانی بەرهەمدار لە ئەلمانیاو بەریتانیای گەورەدا هەبوو، کە کۆمەلێک مۆنۆگرافی دروست و تایبەتکراویان لە بارەی ئەوەی مێژوونووسان دەبێ زیاتر و زیاتر دەربارەی کەمتر و کەمتر بزانن، کۆمەلێکی زۆر و گەشەکەری چیرۆکە راستییەکانی چیرۆک نووسە درێژ دادرەکانیش (dry- as- dust)(**) بەبێ ئەوەی شوێنەوارێک لە دوای خۆیان بەجێبهێلن لە دەریای راستییەکاندا رۆچووبوون.

گوماندەبم ئەم هەرتەکەیەش - جگە لە کێشمەکێشمی چاوەڕاوکراوی نێوان لایەنگرانی ئازادی و کاتۆلیکی ئاکتنی -شی وەک مێژوونووسێک پووچەلکردەوە.

لە گوتارێکی زووینەیدا دەربارەی دوولینگەری مامۆستای دەلێت: با بەمەتریالی ناتەواو نەنووسێ، چونکە مەتریالەکان هەمیشە لای ئەو کەم و کورت و ناتەواون(١١).

بێگومان لێرەدا ئاکتن بۆچوونێکی پێشبینکراو لەسەر خۆی ئاشکرا دەکات، دەربارەی ئەو دیاردە نامۆیەی زۆربەی خەلکی بەبەرچاوترین مێژوونووسی کارکەر لە کورسی رێگیوسی مێژووی هاوچەرخ لەم زانکۆیەدا سەیری دەکەن، کە هەر هەیبوو - بەلام مێژووی نەنووسیووە.

هەروەها ئاکتن لە پێشەکی بەرگی یەکەمی، مێژووی کێمبرجی هاوچەرخ - دا، کە هەر یەکسەر دوای مردنی بلاوبوویەوە، نەخشی سەرکۆتەلی (epitaph) خۆی نووسیوو کاتێک شینی ئەوەی

دەکرد، کە پێداویستییەکان فشار دەخەنە سەر مێژوونووس، هەڕەشە دەکا لە نووسەرێکەوە بۆ دانەری ئینسایکلۆپیدیایەک بیگۆڕن[١٢].

هەندێک شت رابردوویەکی هەڵەی هەبوو. ئەوەی رابردوویەکی هەڵەی هەبوو باوەڕبوون بوو بە کەڵەکەبوونی ئەم ماندوو نەناسییە و بێ کۆتایی راستییە رەقەکانی وەک بناغەی مێژوو، ئەو باوەڕەی، کە راستییەکان لە بارەی خۆیانەوە قسە دەکەن، هەروەها ئەو باوەڕەیش، کە ناتوانین کۆمەڵێک راستی زۆرمان هەبێت، باوەڕێک لەو دەمدا زۆر ئاشکرابوو، کە چەند مێژوونووسێکی کەم پێیان وابوو پێویستە، هەندێکیشیان پێیان وایە هێشتا ئەمڕۆ پێویست نییە - پرسیار لە خۆیان بکەن، مێژوو چییە؟

بە بەپیرۆزراگرتنی کوێرانەی راستییەکانی سەدەی نۆزدەهەم لەلایەن بەپیرۆز راگرتنێکی بەڵگەنامەکانەوە تەواوکراو پاساوی بۆ هێنرایەوە.

بەڵگەنامەکان دارمووقی پەیمانبوون (Ark of the covenant) لە پەرەستگای راستییەکاندا. مێژوونووسی ماقوڵ بەسەری شۆڕەوە خۆی لەو راستیانە نزیک کردۆتەوەو لە ترسان بە شێوازێکی جوان و بەڕێز قسەی لە بارەیانەوە کردووە.

گەر راستیت لە بەڵگەنامەکاندا دۆزیەوە، ئەوە بریتییە لە راستی.

وەلێ کاتێک دێینە سەر ئەو بابەتە، ئایا بڕیارەکان، پەیماننامەکان، کرێ نامەکان (rent - rolls)، بڵاوکراوە دەوڵەتییەکان (blue books)، چەپەرکاری رەسمی، نامە تایبەتییەکان یادەوەرییەکان - چیمان پێدەڵێن؟ هیچ دۆکیومێنتێک ناتوانێ لەوەی نووسەری دۆکیومێنتەکە پێی وایە زیاترمان پێ بڵێ - یان ناتوانێ زیاتر لەوەمان پێ بڵێ کە ئەو پێی وایە روویداوە، یان تەنها ئەوەی ئەو پێی وابووەو ویستویەتی کەسانی دیکەش وا بیر بکەنەوە، یان تەنانەت تەنها ئەوەی خۆی پێی وابووە بیری لێکردۆتەوە.

هیچ یەکێک لە مانەش گرنگییەکی ئەوتۆی نییە تاوەکو مێژوونووسەکە کاریان لەسەر دەکاو شیان دەکاتەوە. راستییەکان لە دۆکیومێنتەکاندا بدۆزرێنەوە یان نا، پێویستە بەرلەوەی بتوانێ هەر بەکارهێنانێکیان دروستبکات هێشتا دەبێ لە لایەن مێژوونووسەوە بپرۆسێندرێن: ئەو بەکارهێنانەی لێیان دروستدەکات، گەر چەمکەم بەم شێوەیە راستبێ، بریتییە لە پرۆسێسی بەپرۆسێسکردن.

با ئەوەی هەوڵدەدەم بیلێم بەنموونەیەک روونبیکەمەوە، کەوارێک دەکەوێ بە باشی بیزانم.

کاتێک گوستاف ستریسمان وەزیری دەرەوەی کۆماری فایمەر لە ساڵی ١٩٢٩-دا مرد

ژمارەیەکی زۆر - سێ سەد سندوقی پڕ - رووپەڕی رەسمی و نیمچە رەسمی و تایبەتی لە دوای خۆی بەجێهێشت، نزیکەی هەموویان بەشەش سالّی دەستەلاّتییەوە بەندیواربوون لە نووسینگەی وەزیری دەرەوەدا.

بێگومان هاورێ و خزمەکانی بیریان لەوە کردەوە، کە پێویستە یادگارێک بۆ یادەوەری ئەو مرۆڤە هەرە گەورەیە دابنرێت. هاورێ دلّسۆزەکەی بێرنهارد دەستی بەکارکرد؛ و لە ماوەی سێ سالّدا سێ بەرگی ٦٠٠ لاپەڕەیی دەرکەوتن، کە هەریەکەیان لە دۆکیۆمێنتەکانی سێ سەد سندوقەکە هەلّبژێردرابوون و ناوی Stesmmans Verma chtnis -ی لێندرا. بە شێوەیەکی ئاسایی خودی دۆکیۆمێنتەکان لە قەبویەکدا یان لە دەلاقەیەکدا (attic) پەرتێن دەبوون و بۆ هەتا هەتایە وندەبوون؛ یان رەنگە دوای سەد سالّ یان زانایەکی حەز بەزانیاری بەرێکەوت بیدۆزینایەتەوەو لەگەلّ دەقەکەی بیرنهاردت - دا بەراوردی بکردنایە.

ئەوەی روویدا زۆر دراماتیک بوو.

لە سالّی ١٩٤٥-دا بەلّگەنامەکان کەوتنە بەردەستی حکومەتی بەریتانی و ئەمریکی، ئەوانیش بەفۆتۆگراف وێنەی ژمارەیەکی زۆریانگرت و فۆتۆستاتسەکانیان خستە بەردەستی زاناکان لە هەریەک لە نووسینگەی تۆماری گشتی لە لەندەن و ئەرشیفی نەتەوەیی لە واشنتن - دا، ئەگەر ئارامی تەواومان هەبێ و حەز بکەین زانیاریمان هەبێ، بۆ ئەوەی بتوانین ئەوە بدۆزینەوە، کە کتومت بێرنهارد کردوویەتی. ئەوەی بێرنهارد کردی نە ئەوەندە ناوازەبوو نە ئەوەندەش فریێنەر بوو جێگای بێزارکردن بێ.

کاتێک شترێسمان مرد سیاسەتی رۆژئاواکەی بەزنجیرەیەک سەرکەوتنی گەورە شەرەف و گەورەیی دەسکەوت - پەیمان لۆکارنۆ، قبولّکردنی ئەلّمانیا لە کۆمەلّەی گەلان، پلانەکانی داوزو بەنگ، قەرزەکانی ئەمریکا و کشانەوەی سوپای داگیرکەرە هاوپەیمانەکان لە راینلاند - دا.

ئەمەش گرنگی و بلیمەتی بەشێک لە سیاسەتی دەرەوەی شترێسمان دەرخست؛ هەروەها شتێکی نائاسایی نییە، کە ئەمەش بەشی هەر زۆر بێ لە هەلّبژاردنی دۆکیۆمێنتەکانی بێرنهارد - دا.

لەلایەکی دیکەشەوە، سیاسەتی رۆژهەلاّتی شترێسمان پەیوەندییەکانییەتی لەگەلّ یەکیەتی شورەویدا، وا دیارە بەتایبەتی بەرەو هیچ شوێنێک هەنگاوی نەنا؛ هەروەها چونکە بەشی زۆری بەلّگەنامەکان دەربارەی ئەو دانووستانەن، کە تەنها دەرئەنجامی بێ هودەیان لێکەوتۆتەوەو زۆریش سەرنج راکێش نەبوونە و هیچ شتێکیشیان نەخستۆتە سەر ناوبانگی شترێسمان، لەبەرئەوە

پرۆسێسی هەڵبژاردن دەبێ زۆر وردو دروست بێ.
لەراستیدا شترێسمان گرنگییەکی بەردەوام و جێگای گومانی بە پەیوەندییەکان دەدا. لەگەڵ یەکیەتی شورەویدا، ئەو پەیوەندیانەش بەگشتی رۆڵێکی گەورەتریان دەگێڕا لە سیاسەتی دەرەوەی شترێسماندا، زیاتر لەوەی خوێنەری هەڵبژاردنەکانی بێرنهارد گومانی بۆ دەبا.
وەلێ پێم وایە، کتێبەکانی بێرنهارد لەڕووی چاکییەوە لەگەڵ زۆربەی هەڵبژاردەی دۆکیومێنتە بڵاوکراوەکاندا بەراورد بکەین، کە بەگشتی مێژوونووسی سادە پشتیان پێ دەبەستێت، چاکترن.
ئەمەش کۆتایی چیرۆکەکەم نییە.
کەمێک دوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکانی بێرنهارد، هیتلەر هاتە سەرتەختی فەرمانڕەوایی.
ناوی شترێسمان لە ئەڵمانیادا لە بیرکراو کتێبەکان لە بازاڕ ونبوون و زۆربەی کوپییەکان بگرە زۆرترینیان لە دەست دران.
ئەمڕۆکە - Strescmanns Ver machtnis - یەکێکە لە پەرتووکە زۆر دەگمەنەکان.
بەڵام ناوبانگی شترێسمان لە رۆژئاوادا بەرز راگیرا. لە ساڵی ١٩٣٥-دا بڵاوکەرەوەی ئینگلیز وەرگێڕانێکی کورتی کارەکەی بێرنهارد بڵاوکردەوە -بەناوی هەڵبژاردەیەک لە هەڵبژاردەی بێرنهارد؛ لەوانەیە سێیەکی کارە ئەسڵییەکە پەڕێندرابێت.
سووتوون وەرگێڕێکی بەناوبانگە لە ئەڵمانییەوە کارەکەی بەبلیمەتی و چاکی ئەنجامدا.
سووتوون لە پێشەکی چاپە ئینگلیزییەکەدا روونی کردۆتەوە، کە کەمێک چڕوپڕبووە، بەڵام هەستی پێدەکرا بەفرێدانی بڕێکی دیاریکراوی ئەوەی زۆر بێ سوودە... ئەوەی کەم سەرنجی خوێنەر یان قوتابیانی ئینگلیز رادەکشێ، کورت دەبێتەوە[١٣].
ئەمەش دووبارە شتێکی زۆر ئاساییە.
بەڵام دەرئەنجامەکەی ئەوەیە، کە سیاسەتی شترێسمانی رۆژهەڵات پێشتر لە کتێبەکانی بێرنهاردا کەم و کورتی تێخرابوو، و هێشتاش زیاتر لە بەرچاو وندەکرێ، هەروەها لە کتێبەکانی سووتوونیشدا یەکیەتی شورەوی تەنها وەک خۆ تێهەڵقورتێنەرێکی قیزەون و کاتی لە سیاسەتی بەندو باوی دەرەوەی رۆژئاوای شترێسماندا دەردەکەویت.
هێژ راستە بگوترێت، کە هەموو پسپۆڕەکان جگە لە کەمێکیان نەبێت - هەروەها خودی دۆکیۆمێنتەکانیش بەڵام بەڕادەیەکی کەمتر - سووتوون نەک بێرنهارد دەنگی شترێسمان دەهەنبەر جیهانی رۆژئاوا بەدەنگێکی راستەقینە دادەنێت.
دۆکیۆمێنتەکان لە بۆمبابارانی ١٩٤٥-دا لەناوچوون و پاشماوەی کتێبەکانی بێرنهاردیش

ئەمان، بۆیە راستییەتی و متمانەی سووتوون هەرگیز نەکەوتە بەر پرسیارەوە.

زۆرینەی کۆکراوەی بەڵگەنامە چاپکراوەکان بەهۆی نەبوونی بەڵگەنامە ئەسڵییەکان بەسووپاسەوە لە لایەن مێژوونووسانەوە قبوولکران، چونکە پشت بەرێگەی لەمە باشتر نابەستن. وەلێ دەمەوێ چیرۆکەکە هەنگاوێک زیاتر بەرەو پێشەوە بەرم.

با بیرنهاردو سووتوون لەیاد بکەین و سووپاسگوزاری ئەوەبین، کە دەتوانین ئەگەر ئەوە هەڵبژێرین، بگەڕێینەوە سەر لاپەڕە رەسەنەکانی هاوبەشێکی شارەزا لە چەند بوویەرێکی گرنگی مێژوویی ئەوروپای نوێدا.

ئایا لاپەڕەکان چیمان پێدەڵێن؟ لە نێوان شتەکانی دیکەدا تۆمارگەلێکی چەند سەد گفتوگۆی شترێسمان هەیە لەگەڵ باڵوێزی سۆڤیەت لە بەرلین - دا و بیست گۆیەک یان دەوری ئەو ژمارەیە لەگەڵ چیچرین - دا هەن.

ئەم تۆمارانە بەگشتی یەک تایبەتمەندیان هەیە وا شترێسمان ناڤۆک دەکەن، کە لەگفتوگۆکان و دەرخستنی گفتوگۆکانیدا وەک شتێکی بەهێز و جێگری نەگۆڕاو پشکی شێری هەیە، لەکاتێکدا ئەوانەی هاوکارەکەی بەزۆری لاواز و شڵەژاو و ناقابلکەرن. ئەمەش تایبەتمەندییەکی ئاسایی هەموو گفتوگۆ دپلۆماتییەکان بەڵگەنامەکان پێمان ناڵێن چی روویداوە، بەڵکو تەنها ئەوەی شتێرسمان پێی وابووە روویداوە، یان ئەوەی ئەو ویستویەتی خەڵکانی دیکە وا بیربکەنەوە، کە روویداوە. نەسووتوون بوو نە بێرنهاردبوو دەستیان بە پرۆسێسی هەڵبژاردنەکە کرد، بەڵکو خودی شترێسمان بوو.

هەروەها «بۆ نموونە» گەر تۆمارەکانی چیچرین - مان لە بارەی هەمان ئەم گفتوگۆیانە هەبوایە، ئەوا هێشتا تەنها ئەوەیان لێ فێردەبووین، کە چیرچین پێی وابووە ئەوەی لەراستیشدا روویداوە هێژ دەبێ لە ئاوەزی مێژوونووسدا رۆبندرێتەوە. بێگومان راستی و بەڵگەنامەکان دەهەنبەر مێژوونووس شتێکی سەرەکین.

وەلێ نابێ بیانکاتە شتێکی پیرۆز.

ئەوان لە لایەن خودی خۆیانەوە مێژوو پێک ناهێنن؛ بەڵکو خۆی لە خۆیاندا وەڵامێکی سازی ئەم پرسیارە ماندووکەرەی، مێژوو چییە نادەنەوە.

لێرەدا دەمەوێ چەند وشەیەکی کەم دەربارەی ئەو پرسیارە بڵێم، بۆچی مێژوونووسانی سەدەی نۆزدەهەم بەگشتی حەزیان لە فەلسەفەی مێژوو نەبوو.

زاراوەکە ڤۆلتێر دایهێناو لەو ساتەوە بەماناگەلێکی جیاواز بەکارهێندرا، وەلێ گەر من بەهەر

شێوەیەک بەکاریبهێنم، ئەوا بۆ مانای وەڵامی پرسیارەکەمان، مێژوو چییە؟ بەکاریدەهێنم، سەدەی نۆزدەهەم دەهەنبەر رۆشنبیرانی ئەورووپای رۆژئاوا سەردەمی ئاسوودەیی بوو، کە متمانە و گەشبینی لێدەتکا.

بە شێوەیەکی گشتی راستییەکان قایلکەربوون؛ و حەزکردن بەپرسیار و وەڵامی نەشیاو و هەراسانکەر دەربارەی راستییەکان بە چەشنێکی هاوشێوە لاوازبوو.

رانکە بە شێوەیەکی لە خواترسانی باوەڕی وابوو، کە بایەخی خودایی (divine provi-dence) دەبێ بایەخ بەمانای مێژوو بدات ئەگەر مێژوو بایەخی بەراستییەکان دابێت؛ بەڵام بورکهارد بەدابێکی (touch) مۆدێرنتری گاڵتەجارییەوە تێبینی کردووە، کە زانیاری شاراوەی سەرەتاییمان لە مەبەستەکانی ژێری ئەزەلیدا نییە؛

پرۆفیسۆر بەتەرفیلد لە ئاخیر و ئۆخریساڵی ١٩٣١-دا بەقایلبوونێکی دیار و بەرچاو تێبینی ئەوەیکرد، کە، مێژوونووسەکان کەم رەنگیان لەسەر سروشتی شتەکان داوەتەوە، تەنانەت کەم رەنگیان لەسەر خودی بابەتەکەی خۆشیاندا داوەتەوە(١٤)؛ بەڵام پێشینەکەم لەم گەلالەنامانەدا، دکتۆر ئی. ئێڵ. راوز، کە بەتەواوی زیاتر رەخنەییە، لە بارەی قەیرانی جیهانی سێر وینستۆن چێرچل - کتێبەکەی دەربارەی جەنگی جیهانی یەکەم - نووسیویەتی، کە لەکاتێکدا ئەوەیان لەڕووی کەسایەتی و چاپووکی و زیندەگییەوە هاوشێوەی مێژووی شۆڕشی رووسیاسی ترۆتسکی - بووە وەلێ لە لایەنێکەوە کەموکورتی هەبوو: ئەویش ئەوەبوو، کە فەلسەفەی مێژووی لە پشت نەبوو(١٥).

مێژوونووسە بەریتانییەکان رەتیانکردەوە وا بکەن، نەک لەبەر ئەوەی پێیان وابووبێ، کە مێژوو مانای نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەی پێیان وابوو، کە ماناکەی مت لە خۆدا ئاشکرایە.

تێڕوانینی لیبراڵی سەدەی نۆزدەهەم دەربارەی مێژوو پێوەندییەکی نزیکی بەپێڕۆی ئابووری سەربەست - Laisse - faire -ەوە هەبوو هەروەها بەرهەمی تێڕوانینێکی پووخت و متمانە بەخۆکردوو بوو دەربارەی جیهان.

با هەر یەکێک کاری تایبەتی خۆی پەرەپێدات، و دەستی شاراوەش بایەخ بە هارمۆنیای جیهانی بدات.

راستییەکانی مێژوو خۆیان لە خۆیاندا بەڵگەی راستییەکی بەهێزی چاکە و پێشکەوتنێکی روون و ئاشکرای بێ کۆتاین بەرەو شتە بەرزەکان.

ئەمەش سەردەمی بێ تاوانی بوو، مێژوونووسان لە بەهەشتی عەدەندا بەڕووتی و بەبێ شەرمی

لەبەردەم خوداوەندی مێژوودا پیاسەیاندەکرد بەبێ تۆسقاڵێک فەلسەفە تا دایانپۆشێ.

لەوساتەوە تاوانمان زانی و کەوتنیشمان مومارەسە کرد؛ بەڵام ئەو مێژوونووسانەی، کە ئەمڕۆ بانگەشەی ئەوە دەکەن ناکرێ واز لە فەلسەفەی مێژوو بهێنن، تەنها ئەوەیە بە لە خۆڕازیبوون و هۆشیاری خودییەوە وەک ئەندامانی کۆلۆنیایەکی روونگەرایی هەوڵدەدەن بەهەشتی عەدەن لە باخەکانی دەوروبەریاندا دووبارە دوورستبکەنەوە.

ئەمڕۆکەش هیچیتر ناکرێ خۆمان لە پرسیارە هەراسانەکە بدزینەوە.

لە ماوەی پەنجا ساڵی رابردوودا بڕێکی باش کاری جدی دەربارەی پرسیاری، مێژوو چییە؟ ئەنجامدران، ئەم کارە جدیانەش لە ولاتی ئەڵمانبوون، ئەو ولاتەی هەوڵی زۆری دا بۆ هەڵگێڕانەوەو لە باریەکبردنی فەرمانڕەوایی ئاسوودەیی لیبرالیزم لە سەدەی نۆزدەهەمدا، بە شێوەیەک یەکەم مەیدانخوازی پیرۆزی سەردەستەیی و سەربەخۆیی راستییەکانی مێژوو لە ١٨٨٠-کان و ١٨٩٠-کاندا روویدا.

ئەو فەیلەسووفانەی، کە مەیدانخوازییەکەیان کرد ئەمڕۆکە کەمێک لەناو زیاترن: دیلتی تاکە کەس لە نێویاندا، کە بەم دوایانە دانپیادانانێکی درەنگ ساتی لە بەریتانیای گەورەدا بەدەستهێنا.

بەر لە وەرچەرخانی سەدەی (نۆزدەهەم) لەم ولاتەدا گەشەسەندن و متمانە دەهەنبەر هەر سەرنج و گرنگییەکی بەهەراتیکەکان بدرایە، کە هێرشیان دەکردە سەر پەرستشی راستییەکان، هێژ زۆر گەورەبوون.

وەلێ لە دەستپێکی سەدەی نوێدا بڵێسەکە گوێزرایەوە ئیتاڵیا، ئەو شوێنەی گرۆچە (Groce) تێیدا دەستی بە پێشنیاری پێشخستنی فەلسەفەی مێژووکرد، کە تاڕادەیەکی زۆر قەرزاری مامۆستاکانی ئەڵمانبوو.

گرۆچە رایگەیاند، کە تەواوی مێژوو بریتییە لە، مێژووی هاوچەرخ[١٦] مەبەستیشی ئەوەیە، کە مێژوو بە شێوەیەکی سەرەکی لە تێڕوانینی رابردوو لەم یانەی چاوەکانی ئێستا و تیشکی پرسەکانییەوە پێکدێت، بە شێوەیەک کاری سەرەکی مێژوونووس تۆمارکردن نییە، بەڵکو هەڵسەنگاندنە؛ بۆ نموونە، ئەگەر مێژوونووس راستییەکە هەڵنەسەنگێنێ، ئەوا چۆن دەزانێ چی شایانی تۆمارکردنە؟

لە ساڵی ١٩١٠ مێژوونووسی ئەمریکی کارل بێکەر بەئەنقەست بەزمانێکی وروژێنەر ئەوەی گفتوگۆ کرد، راستییەکانی مێژوو بۆ هیچ مێژوونووسێک بوونیان نییە تاوەکو مێژوونووس

دروستیاندەکات[١٧].
ئەم مەیدانخوازیانە تا ئەم ساتەش کەم تێبینی کراون.
تەنها دوای ساڵی ١٩٢٠ گرۆچە لە فەرەنسا و بەریتانیای گەورەدا وای لێهات رەواجێکی زۆری هەبێت.
ئەمەش رەنگە لەبەر ئەوە نەبووبێت، کە بیرمەندێکی لێهاتووتر یان شێواززانێکی باشتر بووبێت لە پێشینە ئەڵمانییەکانی، بەڵکو لەبەرئەوە بوو دوای جەنگی جیهانی یەکەم وادیاربوو راستییەکان بەشاگەشکەییێکی کەمتر لە ساڵانی پێش ١٩١٤ پێمان پێدەکەنین، و لەبەرئەوە زیاتر دەگەیشتینە ئەو فەلسەفەی مێژووەی، کە بەدوای ئەوەدا دەگەڕا راسەریان کەمبکاتەوە.
گرۆچە کاریگەرییەکی گرنگی لەسەر فەیلەسووف و مێژوونووسی ئۆکسفۆرد کۆڵینگ وود هەبوو، کە تاکە بیرمەندی بەریتانییە لەم سەدەیەدا هاوکارییەکی جدی لە فەلسەفەی مێژوودا کردووە.
ئەو بۆ ئەوە نەژیا ئەو بەیاننامە سیستماتیکیانە بنووسێتەوە، کە رەنگرێژیکردبوون؛ بەڵکو پەیپەرە بڵاوکراوە، بڵاوکراوەکانی لە بارەی بابەتەکە دوای مردنی لە بەرگێکدا کۆکرانەوە بەناوی، هزری مێژوو، کە لە ساڵی ١٩٤٥-دا دەرکەوت.
دەتوانرێ تێڕوانینەکانی کۆڵینگ وود بەم شێوەیە کورت بکرێنەوە: فەلسەفەی مێژوو نەگرنگی بەرابردوو دەدات لە خودی خۆیدا، و نەگرنگیش بەهزری مێژوونووس دەدات دەربارەی رابردوو خۆی لە خۆیدا، و بەڵکو گرنگی بەهەردوو شتەکە دەدات لە پەیوەندییە هاوشێوەکانیاندا، (ئەم گوتەیە دوو مانای بەندوباوی وشەی، مێژوو - رەنگدەداتەوە - لێکۆڵینەوەی ئەنجامدراو لە لایەن مێژوونووس و زنجیرە رووداوێکی رابردوو، کە مێژوونووس لێیان دەکۆڵێتەوە). ئەو رابردووەی مێژوونووسێک دەیتوێژێتەوە رابردوویەکی مردوو نییە، بەڵکو رابردوویەکە بەمانایەک هێژ ئێستا لە ژیاندایە.
وەلێ ئەو کردەیەی رابردوو مردووە، کە بۆ نموونە لای مێژوونووس بێ مانابێ، مەگەر نەتوانێ لەو هزرەی لە پشتییەوەیە تێبگات. لەبەرئەوە، تەواوی مێژوو بریتییە لەمێژووی هزر، و مێژووش بریتییە لە دووبارە دانانەوەی یاساکان لە بیری مێژوونووس دەربارەی ئەو هزرەی، کە مێژوونووس لە مێژووەکەی دەکۆڵێتەوە دووبارە رۆنانەوەی رابردوو لە ئاوەزی مێژوونووسدا وابەستەی بەڵگەی ئەزموونییە.
وەلێ ئەوە خۆی لە خۆیدا پرۆسێسێکی ئەزموونی نییە، و ناشکرێ لە خوێندنەوەیەکی رووتی

راستییەکان پێک بێت.

بەپێچەوانەوە، پرۆسێسی دووبارە ڕۆنانەوەکە کۆنترۆڵی هەڵبژاردن و شرۆڤەکردنی ڕاستییەکان دەکات: ئەمەش لە ڕاستیدا بریتییە لەوەی دەیانکاتە ڕاستییە مێژوویییەکان. پرۆفیسۆر ئۆکشۆت دەڵێ، مێژوو بریتییە لە ئەزموونی مێژوونووس، لەم خاڵەشدا لە کۆڵینگ وود نزیکە.

مێژوو جگە لە مێژوونووس لە لایەن هیچ کەسێکی دیکەوە دروست ناکرێت: نووسینی مێژووش بریتییە لە تاکە ڕێگەی دروستکردنی مێژوو(١٨).

ئەم ڕەخنە ورد و دروستە، هەر چەندە ڕەنگە چەند کۆت و پارێزکردنێکی پێویست بێ، بەڵام تیشک دەخاتە سەر چەند ڕاستییەکی دیاریکراوی لە یادکراو.

یەکەم، هەرگیز ڕاستییەکانی مێژوو بە، پووختی، بە ئێمە ناگەن، چونکە ئەو ڕاستیانە نەهەن و نەدەشکرێ بەشێوەیەکی پاک هەبن: بەڵکو هەمیشە لە میانەی ئاوەزی تۆمارکەرەوە ڕەنگدەدەنەوە.

ئینجا دوای ئەوە کاتێک کارێکی مێژوو جێبەجێ دەکەین، نابێ بایەخی سەرەکیمان بەو ڕاستیانە بێت، کە لەکارەکەدا هەن، بەڵکو دەبێ بەو ڕاستیانە بێت، کە مێژوونووس نووسیونەتییەوە.

با ئەو مێژوونووسە گەورەیە وەک نموونەیەک وەربگرم، کە ئەم گەلاڵەنامانە لەسەر شەرەف و ناوی ئەو نووسراون جێی. ئێم . تریڤیلیان، هەروەک لە ژیاننامەی خۆیدا پێماندەڵێت، لەسەر تەقلیدێکی تاڕادەیەک زیندەگی فراوانی حزبی چاکسازی بەریتانی (whig) لە ماڵەوەدا پەروەردەبووە(١٩).

هیوادارم لە ناوونیشانەکەی دانەماڵرێت، گەر وەک دوا مێژوونووس نەک کەمترین مێژوونووسی نێو مێژوونووسانی لیبراڵی گەورەی ئینگلیزی تەقلیدی پارتی چاکسازی، ناڤۆکی بکەم.

لەبەر هیچ هۆکارێک نییە، کە داری بنەچەکەی لە جۆرج ئۆتۆ تریڤیلیانی مێژوونووسی گەورەی پارتی چاکسازەوە بۆ ماکۆلی بگێڕێتەوە، کە هەردووکیان گەورەترین مێژوونووسی بێ وێنەی پارتی چاکسازبوون.

تەواوترین و پێگەیشتووترین کاری تریڤیلیان، بریتییە لە، بەریتانیا لەژێر دەستەلاتی شاژن ئانی - دا کە لە دژی ئەو باکگراوندە نووسراوەو تەنها کاتێکیش مانای گرنگ و تەواو دەداتە خوێنەر، کە لە دژی ئەو باکگراوندە بیخوێنێتەوە. لە ڕاستیدا نووسەر پاساوێک بۆ خوێنەر بەجێ ناهێڵێ تا نەتوانێ وا بکات.

گەر بەدوای هونەری پسپۆرانی چیرۆکە پۆلیسییەکان - دا بچین، ئەوا یەکەم جار کۆتاییەکەی

دەخوێنینەوەو لە چەند لاپەڕەیەکی بەشی سێیەمیشدا باشترین پوختەی زانیبێتم دەربارەی ئەوەیە، کە ئەمڕۆ پێی دەگوترێ شرۆڤەی ویگ لە بارەی مێژوو؛ هەروەها دەبینی ئەوەی تراڤیلیان هەوڵدەدات بیکات بریتییە لە لێکۆڵینەوەی بنەچەک و پەرەسەندنی تەقلیدی ویگ، و بەتەواوی و راستەوڕاست چەسپاندنیان لە سالانی داوی مردنی دامەزرێنەرەکەی ویلیەمی سێیەمدا.

هەرچەندە رەنگە ئەمە تاکە شرۆڤەی شیاو نەبێت دەربارەی فەرمانڕەوایی شاژن ئانی، وەلێ لەسەردەستی تریڤیلیان دەبێتە شرۆڤەیەکی شەرعی و بەرهەمدار.

وەلێ بۆ ئەوەی بەنرخی تەواوی خۆی بینرخێنێ، پێویستە لەوەی مێژوونووس دەیکات تێبگەی، چونکە هەروەک کۆلینگ وود دەڵێ، گەر پێویستبێ مێژوونووس ئەوەی بەسەر ئاوەزی کەسایەتییەکانی شانۆیدا تێپەڕیوە، دووبارە لە هزردا دایانبنێتەوە، ئەوا خوێنەریش یەک لە بارە خۆی دەبێ ئەوەی بەسەر مێژوونووسدا تێدەپەڕێ لە ئاوەزدا دووبارە دابنێتەوە.

مێژوونووس بتوێژەوە بەرلەوەی دەست بە توێژینەوەی راستییەکان بکەیت.

سەرەڕای ئەوەی ئەم کارە زۆر ناڕوون نییە، بەڵام ئەوەی پێشتر قوتابیەکی زانکۆ کردی، کاتێک ئامۆژگاریکرا کارێکی زانای گەورەی جۆنز سانت جودز بخوێنێتەوە دەچێتە لای هاوڕێیەکی لە سانت جۆدز بۆ ئەوەی لێی بپرسێ جۆنز چ جۆرە پیاوێکە (chap) و چ جۆرە وەهم و خەیاڵێکیشی لە هزردا هەیە (bees in his bonnet).

کاتێک کارێکی مێژوو دەخوێنیتەوە، هەمیشە گوێ بۆ گیزەگیزەکەش دەگری.

گەر توانیت هیچ نەبیستی، ئەوا یان کەڕی یان مێژوونووسەکەت سەگێکی دەبەنگە.

لەراستیدا بە هیچ شێوەیەک راستییەکان وەک ماسی سەر تەختەی ماسی فرۆش نین.

بەڵکو وەک ماسییەکن، کە لە زەریایەکی بێ سەرووبن و گەورەدا مەلە دەکات؛ هەروەها ئەوەی مێژوونووس بەدەستی دەهێنێت تا رادەیەک وابەستەی چەنسە، بەڵام ئەو بەشەی مێژوونووس لە دەریادا بۆ ماسی گرتن هەڵیدەبژێرێ و ئەو ئامێرانەش، کە بۆ بەکارهێنان هەڵیاندەبژێرێ، بێگومان دوو فاکتەرن، بەهۆی جۆری ئەو ماسیەی مێژوونووس دەیەوێ بیگرێت، دیاریدەکرێت. بەگشتی مێژوونووس ئەو جۆرە راستییەی دەیەوێ بەدەستی دەهێنێ.

مێژوو واتە شرۆڤەکردن.

گەر لەراستیدا سێر جۆرج کلارک لەسەر قسەی خۆی رشتبێ، مێژووم بە، کرۆکی رەقی شرۆڤەکردنی دەورەدراو بەکرۆکێکی جێگای گفتوگۆی راستییەکان «ناوبردبێ» بێگومان دەستەواژەکەم یەک لایەن و فریودەر دەبێ، بەڵام سەرکەشی دەکەم پێ وابێ، کە لە قسەی ئەسڵی

زیاتر نییە.

خاڵی دووەم خاڵێکی ئاسایترە دەربارەی پێداویستی مێژوونووس دەهەنبەر تێگەیشتنی خەیاڵی لە ئاوەزی ئەو خەڵکانەی لێیان دەکۆڵێتەوەو ئەو هزرەش، کە لە پشت ئاکارەکانیانەوەیە: من دەڵێم، تێگەیشتنی خەیاڵی «سۆزداری» نییە نەبادا سۆزداری وا گریمان بکرێت دیاردی بەرێکەوتن دەدات. سەدەی نۆزدەهەم لە ڕووی مێژووی ناوەڕاست لاوازبوو تاوەکو هەر جۆرە تێگەیشتنێکی خەیاڵی هەبێ دەربارەی خەڵکی چەرخی ناوەڕاست، چونکە بەشێوەیەکی لەرادەبەدەر بەهۆی بیروباوەڕی پڕوپوچی سەردەمەکانی ناوەڕاست سارد دەکرایەوەو کۆسپی دەخرایە بەردەم، هەروەها بەهۆی ئەو بەربەریانەشەوە، کە ئەم بیروباوەڕە پڕوپوچانەیان دەوروژاند.

یان تێبینیە رەخنەگرییە بەهێزەکەی بورکهارد لە بارەی جەنگی سی ساڵە وەربگرە: دەڵێ شوورەییە چ بۆ ئانیزای کاتۆلیکی بێت چ بۆ ئانیزای پرۆتستانت رزگاربوونی خۆی بخاتە سەروی مانەوەو ئاشتەوایی نەتەوە[٢٠].

شتێکی زۆر زەحمەت بوو مێژوونووسی لیبرالی سەدەی نۆزدەهەم وا پەروەردە ببوایە باوەڕ بەوە بهێنێ، کە کوشتن لە پێناو بەرگریکردن لە وڵاتی کەسێک شتێکی راست و شایانی پەسنکردنە، وەلێ کوشتن لە پێناو ئایینی کەسێک کارێکی نەگریس و چەمووسانەیە (Wrong headed)، گەلێک زەحمەتبوو بخرێتە ئاوەزی ئەوانەی جەنگی سی ساڵەیان ئەنجامدا. ئەم زەحمەتیەش بەتایبەتی لەو بوارەدا توندوتیژە، کەوا کاری تێدا دەکەم.

زۆرینەی ئەوەی لەم دە ساڵە دوایدا لە وڵاتە زمان ئینگلیزییەکان دەربارەی یەکیەتی شورەوی نووسراوەو ئەوەی لە یەکیەتی شورەویش دەربارەی وڵاتە زمان ئینگلیزییەکان نووسراوە، بەم نەتوانایە پووچەڵکراوەتەوە تەنانەت بۆ دەستهێنانی سەرەتاییترین پلەی تێگەیشتنی خەیاڵی ئەوەی لە ئاوەزی لاکەی تردا بەردەوام دەبێت، بۆیە وشە و ئاکاری ئەوانی تر هەمیشە ئازار دەرو بێ ماناو دووڕوون.

مەگەر مێژوونووس جۆرە پێوەندییەک لەگەڵ ئاوەزی ئەوانەی دەربارەیان دەنووسێت دروست نەکات، ئەوا ناتوانرێ مێژوو بنوسرێت.

خاڵی سێیەم ئەوەیە دەتوانین بڕوانینە رابردوو، تێگەیشتنیشمان لە رابردوو تەنها لە میانەی چاوەکانی ئێستاوە دەبێت.

مێژوونووس کوڕی سەردەمی خۆیەتی و بە هۆی هەلومەرجی بوونی مرۆڤیشەوە پێیەوە پەیوەستە.

زۆرینەی وشەکانی بەکاریان دەهێنێ - وەک وشەکانی دیموکراسی و ئیمپراتۆرییەت و جەنگ و شۆڕش - مانای زیادەیان هەیەو ناتوانێ لێیان جیابکاتەوە.
مێژوونووسە کۆنەکان وشەکانی وەک دەوڵەتی شار (polis) و خەڵکی گشتی (plebs) - یان بەکاردەهێنا، بۆ ئەوەی کت و مت پێشانی بدەن ئەوان نەکەوتوونەتە ئەم تەڵەیەوە.
ئەمەش یارمەتیان نادات.
هەروەها ئەوان لەم دەمەدا دەژیێن و ناتوانن بە بەکارهێنانی وشە نائاساییەکان یان وشە نادیارەکان خۆیان لە رابردوو بخەڵەتێنن، ئینجا گەر گەلاڵەنامەکانیان بە بەرامپیل (chiamys) و جلی پەڕپەڕ (Toga)- ی یۆنانیش پێشکەش بکەن، ئەوا نابنە مێژوونووسی یۆنانی یان رۆمانی چاکتر.
ئەو ناوانەی، کە مێژوونووسە یەک بەدوای یەکە فەرەنسییەکان خەڵکانی پاریسی پێ ناڤۆک دەکەن، کە رۆڵێکی گەلێک بەرچاویان لە شۆڕشی فەرەنسیدا گێڕاوە - وەک: Le peuple, les sans - culottes, les bras - nus, la canaille - هەموو ئەمانەش دەهەنبەر ئەوانەی یاساکانی گاڵتە دەزانن بریتین لە مانیفێستی ئینتیمای سیاسی و شرۆڤەکردنێکی تایبەتی.
لەگەڵ ئەوەشدا مێژوونووس ناچارە ئەو زمانە بەکاربهێنێ، کە لە بێ لایەنی یاساغی دەکات.
ئەمەش تەنها پرسی وشەکان نییە.
لە سەدساڵی رابردوودا تەرازووی بارگۆڕاوی دەستەڵات لە ئەوروپا هەڵوێستی مێژوونووسانی بەریتانی لە بەرامبەر فردریکی گەورە - دا پێچەوانە کردەوە.
هەروەها تەرازوی بارگۆڕاوی دەستەڵات لە کلێسە مەسیحییەکانیشدا بەقوڵی لە نێوان کاتۆلیک چییەتی و پرۆتستانت چییەتیدا هەڵوێستیان لە بەرامبەر کەسایەتییەکانی وەک لۆیۆلاو لوتەر و کرۆم وێڵ - دا گۆڕی.
لە پێناو زانینی کاری مێژوونووسە فەرەنسییەکان دەربارەی چل ساڵی دوایی شۆڕشی فەرەنسا و تا چەند بە شۆڕشی ١٩١٧-ی رووسی کاریتێکراوە، مەعریفەیەکی سەر زارەکی پێویستە.
مێژوونووس کوڕی رابردوو نییە، وەلێ کوڕی ئێستاکەیە.
پرۆفیسۆر ترێڤۆر - رۆیەر پێمان دەڵێ، مێژوونووس ناچارە رابردووی خۆش بوێت[٢١].
ئەمەش کارێکی گومانایە.
رەنگە خۆشویستنی رابردوو بەئاسانی گوزارشتێکی خۆشەویستی رۆمانسیزم و مرۆڤی کۆن و کۆمەڵگە کۆنەکان و هێمایەکی لە دەستدانی باوەڕو حەزکردن بێ بەئێستا یان داهاتوو[٢٢]. دەبێ

کلێشە بەکلێشەی ئەوەی یەکێک لە کاریگەری رابردوو لەسەر ئێستا (dead hand) رزگار دەکات بەباشتر بزانم.

ئەرکی مێژوونووس نە خۆشویستنی رابردووەو نە خۆ رزگارکردنیشییەتی لە رابردوو، بەڵکو دەستەمۆکردن و تێگەیشتنییەتی وەک کلیلێک بۆ تێگەیشتن لە ئێستا.

هەرچۆنێک بێت، گەر ئەمانە چەند تێروانینێکی ئەوانەبن، کە پێیان دەڵێم تێروانینەکانی کولینگ وود، ئەوا کاتی ئەوە هاتووە هەندێک مەترسی بەهەند وەربگرین.

جەختکردن لەسەر رۆڵی مێژوونووس لە دروستکردنی مێژوودا، گەر بەرەو دەرئەنجامی لۆجیکی ببات، بە شێوەیەکی رەها رێگە لە مێژووی بابەتی دەگرێت: مێژوو بریتییە لەوەی مێژوونووس دروستی دەکات.

لەراستیدا وا دیارە ساتێک لە ساتەکان کۆڵینگ وود گەیشتبایە.

ئەم دەرئەنجامە، کە لە تێبینییەکی بڵاونەکراوەدا نووسەرەکەی تۆماریکردووە، دەڵێت:

ئێس ئۆگستین لە روانگەی دەسپێکی مەسیحییەتەوە دەیڕوانیە مێژوو؛ تێلامۆنت لە روانگەی مرۆڤی فەرەنسییەکی سەدەی حەڤدەهەم دەیڕوانییە مێژوو، گیبۆن، لە روانگەی ئینگلیزێکی سەدەی هەژدەهەم دەیڕوانییە مێژوو، مومسن لە روانگەی ئەڵمانییەکی سەدەی نۆزدەهەم دەیڕوانیە مێژوو.

ئامانجێک نیە لە داواکردنی ئەوەی کامەیان تێروانینێکی راست بووە.

هەریەکێکیان تەنها ئەگەرێک بووە دەهەنبەر ئەو کەسەی هەڵیبژاردووە(٢٣).

ئەمەش دەگاتە رادەی گومانگەرایی گشتی، هەروەک فرِاود تێبینی ئەوەیکردووە، کە مێژوو لە سندوقێکی پیتی منداڵان، کە بەهۆی ئەم سندوقەوە چ وشەیەک حەزمان لێبێت دەتوانین حینجەی بکەین.

کولێنگ وود لە بەربەرچدانەوەی دژی، مێژووی برین و لکاندن، و دژی ئەو تێروانینەی مێژوو وەک کۆکردنەوەیەکی رووتی راستییەکان ناڤۆک دەکات، بەمەترسییەوە خەریکە مێژوو وەک شتێکی هەڵبەستراوی مێشک و ئاوەزی مرۆڤ لە قەڵەمبدات و، بیگێرێتەوە سەر ئەو دەرئەنجامەی سێر چۆرج کلارک لەو برگەیەی پێشتر ئاماژەم پێدا، کە دەڵێ: راستییەکی بابەتیانەی مێژوویی نییە.

لە جێگەی ئەو تیۆرەی دەڵێ مێژوو مانای نییە، لێرەدا تیۆرێکی بێ کۆتایی ماناکان پێشنیار دەکەین، کە هیچ یەکێکیان لەویتریان راستتر نییە - چونکە بەزۆری دەمان گەیێنە هەمان رەوش.

تیۆری دووەم بەدڵنیاییە وەک ئەوەی یەکەم بەرگری لێناکرێ ئەگەر شاخێک بەشێوەی جیاواز لە گۆشە تێڕوانینی جیاوازەوە دەربکەوێت، مانای ئەوە نییە شتێکی بابەتییەو بە شێوەیەکی رەها بێ شێوەیە - یان شێوەیەکی بێ سنووری شێوەکانە.

ئەگەر شرۆڤەکردن رۆڵێکی پێویست لە چەسپاندنی راستییەکانی مێژوو بگێڕێت، و ئەگەر شرۆڤەکردنێک بەتەواوی بابەتی نەبێت، مانای ئەوە نییە شرۆڤەکردنێک هاوشێوەی شرۆڤەکردنێکی دیکەیە، مانای ئەوەش نییە، کە راستییەکانی مێژوو لە بنچینەدا دووچاری شرۆڤەکردنێکی بابەتی دەبنەوە پێویستە لە قۆناغێکی دواتردا کتومت مەبەست لە بابەتییەت چییە بەهەند وەربگرم.

وەلێ مەترسییەکی گەورەتر لە گریمانەکەی کۆلینگ وودا خۆی مەڵاس دەدات.

گەر مێژوونووس وەک پێویست لە میانەی چاوەکانی سەردەمی خۆیەوە بڕوانێتە سەردەمی مێژووەکەی، و پرسەکانی رابردوو وەک کلیلێک بۆ پرسەکانی ئێستا بتوێژێتەوە، ئەوا ناکەوێتە تێڕوانینێکی پراگماتیکی رووتی راستییەکانەوەو هێشتنەوەو پاراستنی پێودانگی شرۆڤەیەکی راستیش ئایا گونجاوییەکەیەتی بۆ مەبەستێکی ئێستا؟ بەپێی ئەم گریمانە راستییەکانی مێژوو هیچ نین، بەڵکو شرۆڤەکردن هەموو شتێکە.

نیتچە پێشتر بنەماکەی ئاشکراکردبوو: هەڵەیی بۆچوونێک دەهەنبەر ئێمە هیچ گازەندەیەکی لێ ناگیرێ... پرسەکە ئەوەیە ئایا تا چەند بریتییە لە زێدەکردنی ژیان و، پاراستنی ژیان، و پاراستنی جۆرەکان، و رەنگە ئەفرێنەری جۆرەکانیش[٢٤].

پراگماتیستە ئەمریکییەکان بە شێوەیەکی تا رادەیەک شاراوەو تارادەیەک دڵسۆز و بەردەوام بەدرێژایی هەمان هێڵ دەجووڵان.

مەعریفە بۆ مەبەستێک مەعریفەیە و شەرعییەتی مەعریفەش وابەستەی شەرعییەتی مەبەستەکەیە.

وەلێ تەنانەت لە شوێنێکیشدا ئەم تیۆرە مومارەسە نەکرابێت، پراکتیزەکە بەزۆری هەراسانی کەمتر نەبووە. لەکایەی توێژینەوەیەکەی خۆمدا گەلێک نموونەی شرۆڤەکردنی زێدەڕۆی شێواز رەق (riding ronghshod over)- م دەربارەی راستییەکان بینی، کە بەڕاستییەتی ئەم مەترسییە کاریان تێنەکرابوو.

جێگای سەرسوڕمان نییە، توێژینەوەو سەرنج بدرێتە چەند بەرهەمێکی توندوتیژی یەکیەتی سۆڤیەت و دژە قوتابخانە رەسمییە مێژووییەکانی یەکیەتی سۆڤیەت، کە هەندێک گاف تاسە و

حەزێکی دیاریکراوی وڵات بۆ ئەو پەناگە وەهمیەی سەدەی نۆزدەهەم هەڵدەگرن، کە بریتییە لە مێژوویەکی راستەقینەی پووخت.

ئینجا ئایا چۆن ناچاربوونی مێژوونووس بۆ راستییەکانی لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا پێناس بکەین؟ هیوام وایە، کە ژمارەیەکی تەواو سەعاتم لەم ساڵانەی دوایدا لە بەدواداچوون و توێژینەوەی بەڵگەنامەکان و پڕکردنی گێڕانەوە مێژووییەکان بەپەراوێزی راستییە دروستەکان، بەسەر بردبێت، ئەمەش لە پێناو دوورکەوتنەوە لە شت دانە پاڵ راستی و بەڵگەنامەکان بەفیزێکی زۆرەوە.

ئەرکی مێژوونووس بۆ رێزکردن لەراستییەکانی بەهۆی ناچاربوونی لەوەی راستییەکانی بەڕاستی و دروستی ببینێ، بەهەدەر ناچێ. دەبێ مێژوونووس بەدوای تەواوی راستییە زاندراوەکان یان ئەوانەی دەشێ بزاندرێت بگەڕێت، کە بەمانایەک یان مانایەکی دیکە بەو بابەتەی کاریان لەسەر دەکات و بەشرۆڤەی پێشنیارکراویشەوە بەندیوارن.

گەر مێژوونووس بەدوای ناڤۆککردنی ئینگلیزێکی سەردەمی ڤیکتۆریدا وەک کەسێکی ئەخلاقی و نەتەوەیی بگەڕێت، دەبێ ئەوەی لە ١٨٥٠ لە ستالی بریج ویکسدا روویدا لەیاد نەکات، بەڵام ئەمە یەک لە بارە خۆی مانای ئەوە نییە، کە دەتوانێ خۆی لە شرۆڤەکرن لابدات، کە بریتییە لە راگری ژیانی مێژوو.

خەڵکانی ئاسایی - واتە برادەرە نا ئەکادیمییەکان یان ئەو برادەرانەی ئەلقە ئەکادیمیەکانی دیکەن - هەندێک تاو پرسیارم لێدەکەن چۆن مێژوونووس دەچێتە سەرکار کاتێک مێژوو دەنووسێ.

وادیارە باوترین گریمان ئەوەبێ، کە مێژوونووس کارەکەی بۆ دوو قۆناغی زۆر لێک جیاواز یان دوو سەردەم دابەش دەکات. یەکەم جار، ماوەیەکی زۆری سەرەتایی بە خوێندنەوەی سەرچاوەکانی و پڕکردنی دەفتەری تێبنییەکانی بەڕووداوەکان: ئینجا کاتێک ئەمە تەواو دەبێت، سەرچاوەکانی دەخاتە لاوەو دەفتەری تێبینییەکانی دەهێنی و کتێبەکەی لەسەرەتاوە هەتا کۆتایی دەنووسێ.

ئەمەش لای من شتێکی قایلکەر و جێگەی دڵخۆشی نییە. وەلێ دەهەنبەر خۆم، هەر کە ئەو سەرچاوانەی بەسەرەکییان دادەنێم بەدەستدەهێنم، تاسەو هەوەسم گەلێک بەهێزتر دەبێ و دەست بەنووسین دەکەم - نەک وەک پێویست لە سەرەتاوە، بەڵکو لە شوێنێکەوە، جا هەر شوێنێک بێت.

دوای ئەوە خوێندنەوەو نووسین بەیەکەوە ئەنجام دەدەم. کاتێک دەست بەخوێندنەوە دەکەم نووسینەکە شتی بۆ زیاد دەکرێ و لێی لادەبرێ و دووبارە دادەڕێژرێتەوەو هەندێکیش وندەبێ.

خوێندنەوە بە هۆی نووسینەوە ڕێنوێنی دەکرێ و ئاڕاستە دەکرێ و بەرهەمدار دەبێ چەند زیاتر بنووسم، چەند زیاتر ئەوەی بەدوایدا دەگەڕێم بزانم، ئەوەندە باشتر لە گرنگی و بەندیواری ئەوەی دەدۆزمەوە تێدەگەم.

لەوانەیە هەندێک مێژوونووس تەواوی ئەم نووسەرە سەرەتاییە لە هزریاندا بەبێ بەکارهێنانی قەڵەم و کاغەزو پیت نووس ئەنجامبدەن، کت و مت وەک ئەوەی هەندێک خەڵکی لە هزریاندا شەترەنج دەکەن بەبێ ئەوەی پەنا ببنە بەر بۆردی شەترەنج و یاریکەران: ئەمەش بەهرەیەکە، کە من ئێرەیی پێدەبەم، بەڵام ناتوانم ڕکەبەری بکەم.

وەلێ دڵنیام لەوەی، کە هەر مێژوونووسێک شایانی ناوەکە بێت دەبێ پێی وابێ دوو پرۆسێس لەوانەی ئابووریناس پێیان دەڵێ، بڕی وزەی تێچوو (input)و بەرهەم (Out put) بەیەکەوە بەڕێوە دەچن و لەڕووی پراکتیزیشەوە دوو بەشی تاکە پرۆسێسێکن.

گەر هەوڵبدەی لە یەکتریان دابڕی، یان یەکێکیان بەسەر ئەوی تردا بەرز بکەیتەوە، ئەوا دەکەویتە نێو دوو هەرتەکەوە (heresy) ئینجا یان ئەوەتا مێژووی بڕین و لکان (Scissor - and past -) بەبێ مانایی یان گرنگی دەنووسی، یان ئەوەتا چاوەڕوانێک یان چیرۆکێکی خەیاڵی مێژوویی دەنووسێت، هەروەها ڕاستییەکانی ڕابردوو تەنها بۆ ڕەوشاندنی جۆرێک لە نووسین بەکاردەهێنێ، کە هیچ پەیوەندییەکی بەمێژووەوە نییە.

لەبەر ئەوە، تاقیکردنەوەکەمان دەربارەی پێوەندی مێژوونووس بەڕاستییەکی مێژووەوە بەرەو ڕەوشێکی هەڵبەزیوومان دەبات، دەریاوانی لە نێوان مەترسی (Scylla) تیۆرێکی بەرگری لێنەکراوی مێژوو وەک کۆکردنەوەیەکی خودی ڕاستییەکان و سەردەستەییەکی تەواو ڕاستییەکان بەسەر شرۆڤەکردنەکەداو مەترسی (charybdis) تیۆرێکی دیکە بەرگری لێنەکراوی مێژوو، کە هەمان ئاستی تیۆری یەکەمی هەیە، دەڵێ بەرهەمی خودی (الذاتیە) ئاوەزی مێژوونووس ڕاستییەکانی مێژوو دادەمەزرێنێ و لە ڕێگەی پرۆسێسی شرۆڤەکردنیشەوە دەستەمۆیاندەکات، ڕەوشە هەڵبەزیوەکەش لە نێوان تێڕوانینێکی مێژوودایە، کە سەنتەری کێشکردنی لە ڕابردوودا هەیە و تێڕوانینێکیش، کە سەنتەری کێشکردنی لە ئێستادا هەیە.

بەڵام ڕەوشەکەمان لەوەی وادەردەکەوێ کەم هەڵبەزیووترە.

لەم گەلاڵەنامانەدا دووبارە ڕووبەڕووی هەمان ڕاستی و شرۆڤە کردنی دووسەرە دەبینەوە، وەلێ لەبەرگێکی دیکەدا، ئەم دووسەرییەش بریتییە لە - تایبەتی و گشتی، ئەزموونی و تیۆری و بابەتی و خودی.

تەنگژە (predic-tment)-ی مێژوونووس بریتییە لەرەنگدانەوەیەکی سروشتی مرۆڤ.

مرۆڤ جگە لە سەرەتای منداڵیەتی و ئەوپەڕی تەمەنی پیری بەتەواوی بەژینگەکەیەوە بەندیوار نابێت و بێ چەندوچوونی و مەرجیش ملکەچی نابێت. لەلایەکی ترەوە هەرگیز بەتەواوی ژینگەکەو سەردەستەیی تەواوی ژینگەش سەربەست نییە.

پەیوەندی مرۆڤ بەژینگەکەیەوە بریتییە لە پەیوەندی مێژوونووس بە بەباتەکەیەوە.

مێژوونووس نە کۆیلەیەکی داماوەو نە سەروەرێکی ستەمکاری راستیەکانیشیەتی پەیوەندی نێوان مێژوونووس راستییەکانی بریتییە لە پەیوەندییەکی یەکسانی بەخشین و وەرگرتن.

وەک هەر مێژوونووسێکی کارکەر دەیزانێ، گەر بێتوو مێژوونووس لەرەنگدانەوەی ئەوەی دەیکات بوەستێ کاتێک بیردەکاتەوەو دەنووسێ، ئەوا مێژوونووس دەگلێتە نێو پرۆسێسێکی بەردەوامی لە قالبدانی راستییەکانی بەشرۆڤەکردنەکەیەوەو لە قالبدانی شرۆڤەکەشی بەراستییەکانییەوە.

شتێکی موستەحیلە بڕیاری سەردەستەیی یەکێک بەسەر ئەوەی تریاندا بدات.

مێژوونووس بەهەڵبژاردنێکی کاتی راستییەکان و شرۆڤەکردنێکی کاتی، کە لەژێر تیشکیدا ئەو هەڵبژاردنە ئەنجامدراوە، دەست بەکاردەکات - ئینجا ئەمە لەلایەن خۆی و خەڵکانی دیکەشەوە دەبێت.

کاتێک کاردەکات هەریەک لە شرۆڤەکردن و هەڵبژاردن و رێکخستنی راستییەکان بەوردی و رەنگە تاڕادەیەک گۆڕانکارییە ناهۆشیارییەکانیش لە میانەی کردەیەکی ئاڵوگۆڕکاری یەکێک یان ئەویتردا تێپەڕێت.

ئەم ئاڵوگۆڕکارییەش ئاڵوگۆڕییەتی نێوان ئێستا و رابردوو دەگرێتەوە، چونکە مێژوونووس بەشێکە لە ئێستا و رووداوە راستییەکانیش دەگەڕێنەوە رابردوو.

مێژوونووس و راستییەکانی مێژوو هەریەک بۆ ئەوەی تریان پێویستە.

مێژوونووس بەبێ راستییەکانی بێ ریشە و بێ سوودە؛ راستییەکانیش بەبێ مێژوونووسیان بێ مانا و مردون.

لەبەرئەوە یەکەم وەڵامم بۆ پرسیاری، مێژوو چییە؟ ئەوەیە، کە مێژوو پرۆسێسێکی بەردەوامی نێوان مێژوونووس و راستیەکانی و دایەلۆکێکی بێ کۆتایی نێوان ئێستا و رابردووە.

## دووەم

# کۆمەڵگە و تاکەکەس

پرسیاری ئایا کۆمەڵگە یان تاک کامەیان پێش کامەیان دێت وەک پرسیاری مریشک و هێلکەکە وایە.

ئینجا چ وەک پرسیارێکی لۆژیکی یان مێژوویی شیبکەیتەوە، ئەوا ناتوانی روونکردنەوەیەک لەم بارەیەوە بکەی، بە شێوەیەک یان بە شێوەیەکی دیکە، ناکرێ بە روونکردنەوەیەکی پێچەوانە و یەک لایەنەی وەک یەک پشت راستبکرێتەوە کۆمەڵگە و تاکەکەش دوو شتن لە یەکتر جیانابنەوە و هەریەکەیان تەواوکەر و پێداویستی یەکترین، نەک پێچەوانەی یەکتری بن.

لە قسە بەناوبانگەکانی دۆن: هیچ مرۆڤێک دوورگە نییە، تا خۆی لە خۆدا شتێکی تەواوبێ، هەموو مرۆڤێک بەشێکە لە کیشوەرێک، و بەشێکە لە خاڵی سەرەکی[٢٥].

ئەوەش لایەنێکی راستییە.

لەلایەکی ترەوە گووتەی جێی - میلی تاکەکەس لە ئاستی کلاسیکی وەربگرە، کە دەڵێ: کاتێک مرۆڤەکان بەیەکەوە کۆدەبنەوە نابنە جۆرە کرۆکێکی دیکە[٢٦].

بێگومان نەخێر.

وەلێ هەڵەکە لە گریمانکردنی ئەوەدایە، کە ئەوان پێش ئەوەی بەیەکەوە کۆببنەوە هەبوونە، یان هەر جۆرە کرۆکێکی دیکەیان هەبووبێ.

هەر کە لە دایک دەبین جیهان کارمان لەسەر دەکات و لە یەکەیەکی بایۆلۆژی رووتەوە بۆ یەکەیەکی کۆمەڵایەتیمان دەگۆڕێت. هەموو مرۆڤێک لە هەر قۆناغێکی مێژوو یان پێش مێژوودا لە کۆمەڵگایەکدا لە دایک دەبێت و لەسەرەتاییترینساڵانی تەمەنییەوە بەهۆی ئەو کۆمەڵگەیەوە لە قاڵب دەدرێ. ئەو زمانەی قسەی پێدەکات میراتێکی تاکەکەسی نییە، بەڵکو دەستکەوتێکی کۆمەڵایەتی ئەو گروهەیە، کە لە ناویدا گەشە دەکات.

هەریەک لە زمان و ژینگە یارمەتی دیاریکردنی تایبەتمەندی بیرکردنەوەی دەدەن؛ فکرە

زووینەکانیشی لەخەڵکی ترەوە پێدەگات.

هەروەک گوتراوە، تاکەکەس بەبێ کۆمەڵگە ڕەنگە بێ زمان و بێ ئاوەز بێ.

جادوی هەمیشەیی ئەفسانەی روبنسن کروز بۆ هەوڵی خەیاڵاندنی کەسێکی سەربەخۆ (جیاواز) لە کۆمەڵگە دەگەڕێتەوە. هەوڵکەش شکست دێنێ.

ڕۆبنسن تاکەکەسێکی رووت (مجرد) نیە، بەڵکو ئینگلیزێکی یۆرکییە، تەوراتەکەی لەگەڵ خۆی دەبات و نوێژ بۆ خوداوەندە تیرەییەکەی دەکات.

ئەفسانەکە بەخێرایی Man Friday پێدەبەخشینی و دەست بە ڕۆنانی کۆمەڵگەیەکی نوێ دەکات.

ئەفسانەیەکی دیکەی پێوەند بەم بابەتە بریتییە لە کیریلۆڤ، کە لە پێناو دەرخستنی سەربەستی تەواوی خۆیدا لە (شەیتانەکانی دۆستۆیڤسکیدا) خۆی دەکوژێت.

خۆ کوشتن تاکە کاری سەد دەرسەدی سەربەستە، کە لەبەردەمی تاکەکەسدا کراوەیە؛ تەواوی کارەکانی دیکە بەهەر شێوەیەک بێت ئەندامییەتی تاکەکەس لە کۆمەڵگەدا دەگرێتەوە[٢٧].

مرۆڤناسەکان بەزۆری گوتوویانە، کە مرۆڤی سەرەتایی کەمتر تاکەکەسی بووەو زیاتر لە مرۆڤی شارستانی لە لایەن کۆمەڵگەکەیەوە لە قاڵبدراوە.

ئەمەش سروشتێکە راستی تێدایە.

کۆمەڵگە سادەترەکان یەکگرتووترن، بەو مانایەی داوای جۆراوجۆرییەکی کەمتری زەبەر بەدەستی و گلدی تاکەکەس دەکەن تا لە کۆمەڵگە ئاڵۆزتر و پێشکەوتووەکاندا، هەروەها هەلی ئەوەش دەرەخسێنن.

بەم مانایە زێدەبوونی بەتاکەکەسکردن بەرهەمێکی پێویستی کۆمەڵگەی پێشکەوتووی مۆدێرنە و لە لووتکەوە بۆ بنکە بەنێو تەواوی چالاکییەکانیدا تێدەپەڕێت.

بەڵام ڕەنگە ئەوە هەڵەیەکی جدی بێت، بە شێوەیەک کە دژ یەکییەک دەخاتە نێوان ئەم پرۆسێسەی بەکەسایەتیکردن و گەشەکردنی هێز و تۆکمەی کۆمەڵگە.

گەشەکردنی کۆمەڵگە و گەشەکردنی تاکەکەس بەیەکەوە بەرەو پێش دەچن و هەریەک ئەوەی تریان مەرجدار دەکات. لەراستیدا مەبەستمان لە کۆمەڵگەی ئاڵۆزیان پێشکەوتوو ئەو کۆمەڵگەیەیە، کە تێیدا ئاڵووگۆڕی وابەستەیی تاکەکان شێوە ئاڵۆز و پێشکەوتووەکان گریماندەکات.

جێگەی مەترسییە گریمانبکرێ، کە هێزی کۆمەڵگەیەکی مۆدێرنی نەتەوەیی بۆ لە قاڵبدانی

تایبەتمەندی و فکرەی ئەندامە تاکەکەسییەکانی و بەرهەمهێنانی پلەیەکی دیاریکراوی چونیەکی و یەکگرتوویی لە نێوانیاندا، بەهەر شێوەیەک لە هێزی کۆمەڵگەیەکی سەرەتایی تیرەیی کەمتر بێت.

کۆنە چەمکی تایبەتمەندی نەتەوەیی بنیادنراو لەسەر جیاوازیە بایۆلۆژییەکان دەمێکی زۆرە لەبەریەک هەڵوەشایەوە، وەلێ ئەستەمە تایبەتمەندی جیاوازییە نەتەوەییەکانی لە پاشخانە جیاوازە نەتەوەییەکانی کۆمەڵگەوە، پەروەردەوە سەرهەڵدەدەن رەتبکرێنەوە.

«سروشتی مرۆڤ» ئەو بوونگە سەر سوڕهێنەرەی لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی دیکەو لەسەدەیەکەوە بۆ سەدەیەکی دیکە زۆر گۆڕاوە، ئەستەمە بەدیاردەیەکی مێژوویەوە بەندیوار نەکرێت، کە بەهۆی هەڵومەرج و داهێنانە بەندوباوە کۆمەلایەتییەکانەوە دروستبووە.

بۆ نموونە جیاوازییەکی زۆر لە نێوان ئەمریکی و رووسی و هیندییەکاندا هەیە.

وەلێ هەندێک لەم جیاوازیانە، و لەوانەیە گرنگترینیان، شێوەی هەڵوێستە جیاوازەکان دەهەنبەر پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانی نێوان تاکەکەسەکان، یان، بەمانایەکی دیکە دەهەنبەر ئەو رێگایەی، کە دەبێ کۆمەڵگەی لێ دروست ببێت، وەربگرن، بۆ ئەوەی بەگشتی توێژینەوە جیاوازییەکانی نێوان کۆمەڵگەی ئەمریکی و رووسی و هیندی ببێتە باشترین رێگەی توێژینەوە جیاوازییەکانی نێوان تاکەکەسی ئەمریکی و رووسی و هیندی مرۆڤ شارستانی وەک مرۆڤی سەرەتایی بەهۆی کۆمەڵگەوە لە قالب دەدرێ، هەروەک کتومت کۆمەڵگەش بەهۆی مرۆڤەوە لە قالب دەدرێ.

کەوابوو هیچی تر ناتوانی بەبێ مریشک هێلکەت هەبێ و بەبێ هێلکەش مریشکت هەبێ.

پێویست ناکات سەرنج بدەمە ئەم راستییە روون و ئاشکرایانە، بەلام دەبێ، سەرنجی ئەو راستییە بدەم، کە ئەو راستیانە بە هۆی سەردەمێکی بەرچاو و هەلاوێرەی مێژوو لە ئێمەوە ناڕوونبوون، کە کتومت تەنها جیهانی رۆژئاوا لێیانەوە سەرهەڵدەدا.

پەرستشی تاکەکەس گەری یەکێکە لە بلاوترین بابەتەکانی نێو ئەفسانە مۆدێرنە مێژووییەکان.

بەگوێرەی ناڤۆکی رامی (المألوق) بورکهارد لە کتێبی - شارستانی رێنساس ئیتالیا- دا کە بەشی دووەم بە نێوی پەرەسەندنی تاکەکەس دەڵێ، پەرستشی تاکەکەس لەگەڵ رێنسانسدا دەستی پێکرد، کاتێک مرۆڤ هێشتا تەنها وەک ئەندامی رەگەزێک، خەڵکێک، حزبێک، خێزانێک، یان نەقابەیەک، هۆشیاری لە بارەی خۆیەوە هەبوو، لە کۆتاییدا بوو بە تاکەکەسێکی رۆحانی و بەم شێوەیە خۆی رێکخست؛ لەگەڵ دەستپێکردنی شۆڕشی پیشەسازیدا، پەرستشەکە بەندیواربوو بەسەرهەڵدانی سەرمایەداری و پرۆتستانت جێتی و پێڕۆی بازرگانی سەربەستەوە. مافەکانی مرۆڤ

و هاولاتیان، کە، لە لایەن شۆڕشی فەرەنسییەوە بانگەشەیان بۆ دەکرا بریتیبوون لە مافەکانی تاکەکەس.

تاکەکەس گەرایی بریتیبوو لە بنچینەی فەلسەفەی گەورەی سوودمەندگەرایی سەدەی نۆزدەهەم.

گووتارەکەی مۆڕلی دەربارەی، سازش، کە بریتییە لە دۆکیۆمێنتێکی گرنگی لیبرالیزمی سەردەمی ڤیکتۆری، تاکەکەس گەرایی و سوودمەندگەرایی بە، ئایینی مرۆڤ و ئاسوودەیی و خۆش گوزەرانی، نێو دەبات.

تاکەکەس گەرایی سەرسەخت، بریتی بوو لە بیرۆکەی بنچینەیی پێشکەوتنی مرۆڤ.

ڕەنگە ئەمەش سەد دەر سەد ڕاڤەکردنێکی ڕاستەقینە و شەرعی ئایدیۆلۆژیای سەردەمێکی تایبەتی مێژوویی بێت.

وەلێ ئەوەی دەمەوێ ڕوونیبکەمەوە ئەوەیە، کە ئەو بە کەسایەتیبوونە زێدەبووەی هاوشانی جیهانی مۆدێرنی دەکرد بریتی بوو لە پرۆسێسێکی ئاسایی شارستانییەکی پێشکەوتوو.

شۆڕشی کۆمەلایەتی گروهی نوێی گەیاندە دەستەلات. ئەو کارەش هەمیشە لە میانەی تاکەکەسەکان و ڕەخساندنی هەلی نوێ بۆ پەرەسەندنی تاکەکەس چۆتە باری پراکتیزەوە؛ هەروەها، چونکە لە دەستپێکی قۆناغی سەرمایەداریدا یەکەکانی بەرهەمهێنان و دابەشکردن بەزۆری لەبەردەستی تاکەکەسەکاندا بوون، ئەوا ئایدیۆلۆژیای پێڕۆی کۆمەلایەتی نوێ بەتوندی جەختی لەسەر ڕۆلی دەست پێشخەری تاکەکەس دەکرد لە پێڕۆی کۆمەلایەتیدا. وەلێ تەواوی ڕەوتەکە ڕەوتێکی کۆمەلایەتی بوو گوزارشتی لە قۆناغێکی تایبەتی دەکرد لە پەرەسەندنی مێژوویداو ناش توانرێ بەدەستەواژەی شۆڕشی تاکەکەسەکان ڕوونبکرێتەوە لە دژی کۆمەلگە یان ڕزگاربوونی تاکەکەسەکان لە کۆت و بەندە کۆمەلایەتییەکان.

زۆربەی نیشانەکان ئاماژە بەوە دەدەن، تەنانەت لە جیهانی ڕۆژئاواشدا، کە بنکەی ئەم پەرەسەندەن و ئایدیۆلۆژیایە بوو، سەردەمی مێژوو گەیشتبێتە کۆتایی خۆی: لێرەدا پێویستیم بەوە نییە لەسەر چەکەرەکردنی ئەوەی پێی دەگوترێ دیموکراسی جەماوەر ڕشتم، یان لەسەر بەرەبەرە جێگە گرتنەوەی تاکەکەسی سەردەستە لە لایەن کۆمەلە هەرەوەزییەکانی سەرکار لەبەرهەمهێنان و ڕێکخستنی ئابووری - دا، ڕشتبم.

وەلێ ئەو ئایدیۆلۆژییەی بە هۆی ئەم سەردەمە درێژخایەن و بەرهەمدارەوە دروستبوو هێژ هێزێکی سەرکارە لە ئەورووپای ڕۆژئاواو سەرلەبەری ولاتە زمان ئینگلیزییەکاندا. کاتێک بەزاراوەی پەتی لە بارەی بارگرژی نێوان ئازادی و یەکسانی، یان لە نێوان ئازادی تاکەکەس و

دادپەروەری کۆمەڵایەتی دەدوێین، ئەوا ئارەزوومەندین ئەو کێشمەکێشمە لەبیر بکەین، کە لە نێوان فکرە پەتیەکاندا روونایات.

ئەمانەش کێشمە کێشمی نێوان تاکەکەسەکان و کۆمەڵگە نین، بەڵکو بێنە و بەردەی نێوان گروهی تاکەکەسەکانە لە کۆمەڵگەدا، هەر گروهێک لە پێناو بەهێزکردنی سیاسەتە کۆمەڵایەتییەکانی پشتیوانییەتی و پووچەڵکردنەوەی سیاسەتە کۆمەڵایەتییەکانی کە دژی ئەو گروهەن تێدەکۆشێت.

تاکەکەس گەرایی، نەک بەمانای بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی گەورە، بەڵکو بەمانای بەرهەڵستکارێکی هەڵە لە نێوان تاکەکەس و کۆمەڵگە ئەمڕۆکە بۆتە دروشمی گروهێکی بایەخ پێدەرو بەهۆی تایبەتمەندی مشتومڕ کەرانەشی بۆتە کۆسپی تێگەیشتنمان لەوەی لە جیهاندا روودەدات:

هیچ شتێک دژی پەرستشی تاکەکەس وەک نەقایلبێک لە دژی ئەو لەرێگە لادانە ناڵێم، کە وەک هۆ و پێناو مامەڵە لەگەڵ تاکەکەس دەکات و وەک مەبەستێکیش مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵگە یان دەوڵەت - دا دەکات.

وەلێ گەر هەوڵبدەین لەگەڵ چەمکی تاکەکەسێکی تەنهای دەرەوەی کۆمەڵگە کاربکەین، ئەوا ناگەینە تێگەیشتنێکی راستەقینە دەربارەی هەریەک لە رابردوو و ئێستا.

ئەمەش لە کۆتاییدا دەمباتە سەر خاڵی لە بابەت لادانی دووروو درێژم.

تێڕوانینی بەندوباوی مێژوو وا لەو خاڵە دەڕوانێت، کە شتێکە تاکەکەسەکان دەربارەی تاکەکەسەکان نووسیوویانە. بێگومان ئەم تێڕوانینە لە لایەن مێژوونووسە لیبڕالییەکانی سەدەی نۆزدەهەمەوە بەهەند وەرگیراوە برەویشی پێدراوە، ئەمەش لەراستیدا هەڵە نییە.

وەلێ هەنووکە گەلێک سادەکراو و ناتەواو دەردەکەوێ و پێویستیمان بە لێکۆڵینەوەی ئەزموونی وردتر هەیە.

مەعریفەی مێژوونووس تەنها پاوانی خودی خۆی نییە؛ بەڵکو پێدەچێ مرۆڤی چەندین وەچەو وڵاتی جیاواز لە کەڵەکەکردنی ئەم مەعریفەیەدا بەشداریان کردبێت.

ئەو مرۆڤانەی مێژوونووس کردارەکانیان دەتوێژێتەوە تاکەکەسی دابڕاو نەبوونە لە بۆشاییەکدا کاریانکردبێت: بەڵکو بەگوێرەی پیشاژوو و پاڵەپەستۆی کۆمەڵگەیەکی رابردوو کاریانکردووە لە دوا گەلاڵەنامەمدا مێژووم وەک پرۆسەیەکی کارلێککردن و دایەلۆگێک لە نێوان مێژوونووس لە ئێستادا و راستییەکان لە رابردوودا وەسفکردووە.

ئێستا دەمەوێ لە کێشی رێژەیی سروشتەکانی تاکەکەس و کۆمەڵگە بکۆڵمەوە لە هەردوو

لاکەی هاوکێشەکەدا.

ئایا تا چ ئەندازەیەک مێژوونووسان تاکەکەسانێکی سەربەخۆن؟ و تا چەند بەرهەمی کۆمەڵگە و سەردەمەکەیانن؟ ئایا تا چ ئەندازەیەک راستییەکانی مێژوو دەربارەی تاکەکەسە سەربەخۆکانن و تا چەند راستی کۆمەڵایەتین؟ کەوابوو مێژوونووس تاکەکەسێکی مرۆڤایەتییە.

هەروەها وەک هەر تاکەکەسێکی دیکە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیە و بەرهەم و قسەکەرێکی هۆشیار یان ناهۆشیاری کۆمەڵگەکەیەتی؛ بەم شێوەیە، کار لەسەر راستییەکانی رابردوویەکی مێژوویی دەکات.

هەندێک جار وەک کۆمەڵە خەڵکێکی جولاوە قسە لە بارەی رێڕەوی مێژوو دەکەین. خوازەکە (metaphor) زۆر تەواوە، بەمەرجێک مێژوونووس فیت نەدات، کە خۆی وەک هەڵۆیەک دابنێت لە کەنداڵێکەوە بەتەنها رووخسارەکە روپێو دەکات یان خۆی وەک کەسێکی پایەبەرز (V.I.P) لەسەر تەختی سلاوکردن دابنێت.

مێژوونووس هیچ یەکێک لەمانە نییە، بەڵکو کەسێکی وابەستەیی ترە شەکەتانە لە بەشەکەی تری رێ و رەسمەکەدا دەڕوات کاتێک رێ و رەسمەکە جارێک بەلای راستداو جارێک بەلای چەپدا لاردەبێتەوەو پێچاوپێچ دەکات و هەندێک ساتیش بەسەرخۆیدا پێچ دەکاتەوە، شوێنی رێژەیی بەشە جیاوازەکانی رێ و رەسمەکەش بەبەردەوامی دەگۆڕێ، بۆ ئەوەی سەد دەرسەد مانایەکی باشی هەبێ، بۆ نموونە، بۆ ئەوەی بتوانن بڵێین ئەمرۆکە ئێمە لە چاخەکانی ناوەڕاست نزیکترین لە باب و باپیرانمان، کە سەدەیەک پێش ئێستا بوون، یان چەرخی قەیسەر لە ئێمە نزیکترە تا چەرخی دانتی. لەکاتی رۆیشتنی رێ و رەسمەکەدا، کە مێژوونووسیشی لەگەڵدایە وێنەی زهنی نوێ و تێڕوانینی نوێ دەردەکەون.

مێژوونووس بەشێکە لە مێژوو، ئەو شوێنەی لەرێ و رەسمەکەدا خۆی تێدا دەبینێتەوە گۆشە نیگاکەی دەربارەی رابردوو دیاریدەکات.

ئەم راست گەراییەش کەم راستتر نییە کاتێک مێژوونووس سەردەمێکی دوور لە سەردەمی خۆی دەتوێژێتەوە. کاتێک مێژووی کۆنم دەگوتەوە، پەرتووکە کلاسیکییەکان دەربارەی بابەتەکە –و رەنگە تا ئێستاش هەر ئەوانە بن – بریتیبوون لە مێژووی گریک دانراوی گرۆتە و مێژووی رۆم دانراوی مومسن گرۆتە بانگەرێکی توندڕەوی رۆشنگەربوو، لە ١٨٤٠-ەکاندا ئەم کتێبەی نوسی و ئارەزوو تەماحەکانی سەرهەڵدان و پەرەسەندنی سیاسیانەی چینی ناوەڕاستی بەریتانی لە وێنەیەکی ئایدیالیزکراوی دیموکراسی ئەتینیدا بەرجەستەکرد، کە تێیدا پێرکلیسی وەک چاکسازێکی بێنتامێتی داناوەو ئەتیناش لەبەر پیواری عەقڵ – دا ئیمپراتۆریەتێکی بەدەستهێنا.

ڕەنگە خەیاڵ پڵاوی نەبێت پێشنیـار بکەن، کە لە یادکردنی پرسی کۆیلایەتی لە ئەتینادا لە لایەن گـرۆتەوە شکسـتی ئەو گـروهەی ڕەنگداتەوە، کـە گـرۆتە ئینتـیـمـای بۆی هەبووە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پرسی چینی کارگەری، کارگەی ئینگلیزی نوێ.

مـومـسن لیبـرالیـیـەکی ئەڵمـانی بوو، کـە بە هۆی پەشۆکـان و لەڕولاوازی شۆڕشی ئەڵمـانی ١٨٤٨-١٨٤٩ لە وەهم ڕزگاری بووبوو.

مومسن لە ساڵی ١٨٥٠-دا پەرتووکەکەی دەنووسی، لەو دەیەیەی کە لە دایکبوونی چەمک و ناوی سیاسەتی ڕاستەقینەی بەخۆیەوە بینی - بە شێوەیەک مومسن بەهەستی پێویست بوون بە مرۆڤێکی بەهێز جۆشدرابوو بۆ لابردنی ئەو کەڵەکەیەی شکستی گەلی ئەڵمانی بەجێیهێشتبوو لە پێناو بەدەستهێنانی تەماحە سیاسییەکانیدا، هەروەها لەوانەیە هەرگیز مێژووە ڕاستەقینەکەمان بە بەها ڕاستەقینەکەی پێ هەڵنەسەنگێندرێ، مەگەر وا نەزانین بە ئایدیالیزمکردنە بە نێو بانگەکەی لە بارەی قـەیسـەرەوە بەرهەمی ئەم تاسـە و هەوەسـە بەهێـزەیە بۆ مـرۆڤـێکی بەهێـز لە پێناو ڕزگارکردنی ئەڵمانیا لەکاولکاری، هەروەها مەگەر وانەزانین شیشڕوی پارێزەری سیاسەتمەداری چەنەهەراشی بێسوود و زمـان لووسی خۆگلخێنەر، کـە لە گفـتوگۆکـانی پۆلکریش لە ١٨٤٨ لە فرانکفۆرت- دا پاشەکشێی کردووە.

لەڕاستیدا، پێویستە ئەمە بەدژیەکیەکی بێ شومار دانەنێم، گەر هەندێک کەس گوتبێتیان، کە (مـێـژووی گـریک) -ی گـرۆتە، ئەوەندەی لە بارەی هزری فـەلسـەفـەی ڕادیکاڵی ئینگلیـزیمان لە ١٨٤٠-ەکاندا بۆ دەگێڕێتەوە، ئەوەندەش دەربارەی دیموکراسی ئەتینامان بۆ دەگێڕێتەوە لە سەدەی پێنجـەمی بەر لەزانیـدا، یان هەر کـەسێک بیـەوێت لەوەی لە ١٨٤٨-دا بەسـەر لیـبـڕالەکـانی ئەڵمـانیـدا هات تێ بگات پێـویسـتـە پەرتووکـەکـەی مـومـسن (مـێـژووی ڕۆم) بکاتە یەکـێک لە کتێبەکانی قوتابخانە.

ئەمەش وەک دوو کاری مێژوویی گەورە لە پێگەیان کەم ناکاتەوە.

خۆم پێ لەبەر ئەو شـێـوازەی بێـری ڕاناگـیـرێت، کـە لە دەسـپـێـکی گـەلالـە نامـەکـانیـدا وای دەردەخات گەورەیی مومسن بەکـتێبەکەی (مێژووی ڕۆم)ەوە بەندیوار نییە، بەڵکو بەکۆمەڵێکی تەواو نووسینەکانی و کارەکەی دەربارەی قانوونی یاسادانانی ڕۆمانەوە بەندیوارە: ئەمەش مێژوو دێنێتە ئاستی کۆکردنەوەی زانیارییەکان.

ڕاست و دروست مێژووی مەزن کاتێک دەنووسرێ، کە تێڕوانینی مێژوونووس دەربارەی ڕابردوو لە تێڕوانینی کێشەکانی ئێستاوە سەرچاوە بگرێت.

گـەلێک چەلان سەرسوڕمـانی ئەوە وروژێندراوە، کـە مـومـسن دوای ڕووخـانی کـۆمـارەکـە لە

درێژەپێدانی مێژووکەیدا شکستی هێناوە.

مومسن نەکات و نەهەل و نەزانیاری هەبوو.

وەلێ کاتێک مومسن مێژووەکەی دەنووسی، هێشتا پیاوە بەهێزەکە لە ئەڵمانیادا سەری هەڵنەدابوو.

لە ماوەی ئەرکە چالاکەکەیدا، پرسی ئەوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان پیاوە بەهێزەکە هاتبێتە سەر دەستەڵات هێژ شتێکی ڕاستەقینە نەبوو.

مومسن هیچ نیگایەکی نەبوو تاوەکو ئەم پرسە بۆ دیمەنی ڕووداوەکانی ڕۆمان بگێڕێتەوە؛ بۆیە مێژووی ئیمپراتۆریەتی بەنەنووسراوی مایەوە.

شتێکی ئاسانە لە نێوان مێژوونووسە مۆدێرنەکاندا لە بارەی ئەم دیاردەیەوە نموونەکان زیادبکرێن.

لەدوا گەڵاڵەنامەمدا ستایشی کتێبەکەی جێی. ئیم. تریڤیلیانم کرد بەناوی (بەریتانیا لە سایەی دەستەڵاتی شاژن ئانی)-دا وەک یادگارێک بۆ تەقلیدی چاکسازی، کە لە نێو ئەم تەقلیدەدا پەروەردە بووە.

با ئێستا کە بیر لە دەستکەوتی گەورە و گرنگی یەکێک بکەینەوە، کە زۆربەی هەرە زۆرمان بەگەورەترین مێژوونووسی بەریتانی دادەنێین، دوای جەنگی جیهانی یەکەم لەسەر شانۆی ئەکادیمیدا دەرکەوت: ئەویش سێر لویس نامیەرە.

نامیەر پارێزگارێکی ڕاستەقینەبوو - نەک پارێزگارێکی نموونەیی ئینگلیزبوو کاتێک سکراچ بکرایە لە ٧٥٪ دەبێتە کەسێکی لیبڕالی، بەڵکو پارێزگارێک بوو بۆ ماوەی زیاتر لەسەدەیەک هاونموونەیان لە نێو مێژوونووسە ئینگلیزەکاندا نەبینی.

لە نێوان ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوو ساڵی ١٩١٤ دەهەمبەر مێژوونووسێکی بەریتانی ئەستەمبوو گۆڕانێکی مێژوویی وێنا بکات مەگەر گۆڕانەکەی بەرەو باشتر نەبوایە.

لە ١٩٢٠-ەکاندا چووینە نێو سەردەمێکەوە گۆڕانەکە لە هەمبەر داهاتوودا بەندیوار دەبوو بەمەترسییەوە، دەکرێ وەک گۆڕان بەرەو خراپتر لێی تێبگەین - کە بریتییە لە سەردەمی دووبارە لە دایکبوونەوەی هزری پارێزگاری (Conservative).

پارێزگاری گەرایی نامیەریش وەک لیبڕالیزمی ئاکتن هەریەک لە هێزو قووڵایی لە ڕەگێکی داکوتراوی پاشخانی ئەوروپی وەرگرتبوو[٢٨].

نامیەر بەپێچەوانەی فیشەر یان توینبی هیچ ڕەگێکی لە لیبڕالیزمی سەدەی نۆزدەهەمدا دانەکوتاوەو داخی پەشیمانی ئەوەشی نەخوارد.

دوای جەنگی جیهانی یەکەم و ئاشتییەکی کورت هێناو نابووتی لیبرالیزم دەرکەوت، دەشیا کارلێکەکەش تەنها بەشێوەیەک لە دوو شێوەکان دەربکەوێ - یان سۆشیالیزم یان پارێزگاری گەرایی.

نامیەر وەک مێژوونووسێکی پارێزگار دەرکەوت.

ئەو لەدوو بواری هەڵبژێردراودا کاری دەکرد و هەڵبژاردەی هەریەکەشیان گرنگبوو نامیەر لەمێژووی ئینگلیزدا گەڕایەوە دوا سەردەم، کە تێیدا چینی فەرمانڕەوا دەیتوانی لە هەوڵی عەقڵانی پێگەو دەستەڵات لە کۆمەڵگەیەکی ڕێکوپێک و بەزۆری هەدادارادا فەرمانڕەوایی بکات.

هەندێ کەس نامیەر - یان بەداماڵینی مێژوو لە ئاوەز تۆمەتبار کردووە[٢٩].

ڕەنگە ئەمە دەستەواژەیەکی زۆر بەختدار نەبێت، وەلێ کەسێک دەتوانێ ئەو خاڵە تێبگات، کە ڕەخنەگر دەیەوێ ئەنجامیبدا.

سیاسەت لەسەردەمی فەرمانڕەوایی جۆرجی سێهەمدا هێژ دژە بەرگری لە بەرامبەر هزرە خەیاڵیەکاندا هەبوو، بیروباوەڕی سۆزداریش لەپەرەسەندن دابوو، کە لەگەڵ شۆڕشی فەڕەنسی و مژدەی نزیکبوونەوەی سەدەی لیبراڵیزمی سەرکەوتوو، لە جیهاندا شکستی خوارد.

نەهزرەکان و نەشۆڕش و نە لیبراڵیزم: نامیەر وێنەیەکی جوانی دەربارەی سەردەمێک هەڵبژارد تا بماندات هێژ جێی متمانە بوو - لەگەڵ ئەوەشدا بەساغی لەم هەموو ئەو مەترسیانە ڕزگاری نەبوو.

وەلێ هەڵبژاردەی نامیەر دەربارەی بابەتی دووەم وەک بابەتی یەکەم گرنگ بوو.

نامیەر لە شۆڕشە مۆدێرنە گەورەکانی وەک شۆڕشی ئینگلیزی و فەڕەنسی و روسی بێ ئاگابووە و هیچ شتێکی دەربارەی جەوهەری هەریەکێکیان نەنووسیوە - بەڵکو توێژینەوەیەکی خۆ تێسمی دەربارەی شۆڕشی ١٩٤٨-ی ئەوروپا هەڵبژاردووە تا پێمانی بدات، ئەو شۆڕشەی شکستی هێناو لەسەرتاسەری ئەوروپاشدا هیواکانی سەرهەڵدانی لیبراڵیزمی بەرەو نسکۆ برد، هەروەها بەڵگەیەکە لەسەر شاشبوونی هزرەکان لەبەردەم هێزە چەکدارەکان و دیموکراتییەکاندا کاتێک ڕووبەڕووی سەربازەکان دەبنەوە.

خۆ تێ هەڵقورتاندنی هزرەکان لەکارە جدییەکانی سیاسەتدا شتێکی بێ سوودو مەترسیدارە: نامیەر بەنێوزەن دکردنی ئەم شکستە شەرمەزارییە بە، شۆڕشی ڕۆشنبیرەکان، بەرشتێکی ئەخلاقی کەوتووە.

هەرچەندە دەرئەنجامەکەمان پرسی دەرئەنجامێکی ڕووت نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نامیەر هیچ شتێکی سیستماتیکی دەربارەی فەلسەفەی مێژوو نەنووسیووە، و لەگوتارێکدا چەندساڵێکی کەم بەر لە ئێستا بلاویکردۆتەوە خۆی بەئاشکرایی و بێ شەرمییەکی ئاسایی دەربڕیوە.

لەبەرئەوەی نووسیویەتی، کە: هەرچەند مرۆڤ کۆسپ و تەگەرەی سەربەستی کارو جولەی عەقلی لەرووی پیرۆزی سیاسی و دۆگماییەوە کەمبکاتەوە ئەوەندە دەهەمبەر بیرکردنەوەی باشتر دەبێت.

هەروەها دوای باسکردنی ئەو تۆمەتەی بەهۆی دامالینی ئاوەز بەمێژوو نەک رەتکردنەوەی دەلێت: هەندێک لە فەیلەسووفە سیاسییەکان دەربارەی، ئۆقرەگرتنی شەکەت بووەو بەرپیواربوونی گفتوگۆ هەنوکە دەربارەی سیاسەتە گشتییەکان لەم ولاتەدا، سکالا دەکەن؛ چارەسەرە پراکتیکییەکان بەدوای پرسە کۆنکرێت کراوەکاندا دەگەرێن، لەکاتێکدا پرۆگرام و ئایدیالەکان لەلایەن هەریەک لە دوو پارتەکەوە لەیاد دەکرێن.

وەلێ ئەم هەلوێستە لای من دیاردەی بەپێگەیشتنێکی نەتەوەیی گەورەتر دەدات و ئەوەی بەهیوای دەخوازم ئەوەیە، کە بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام بێ بەبێ ئەوەی بەهۆی کارەکانی فەلسەفەی سیاسییەوە لێل و شلەژاوبێت(٣٠).

نامەوێ لەم دەمەدا بچمە نێو پرسی ئەم تێروانینەوە: ئەم پرسە بۆ گەلالەنامەیەکی دی دەهێلمەوە.

لێرەدا مەبەستم ئەوەیە تەنها دوو راستی گرنگ روونبکەمەوە. یەکەمیان ئەوەیە ناتوانی بەتەواوی کاری مێژوونووس تێبگەی یان هەلبسەنگێنی مادامێک لەو تێروانینە تێی نەگەیشتبیت، کە مێژوونووس خۆی لێتێدەگات؛ دووەمیان ئەوەیە کە ئەو تێروانینە خۆی رەگی لە پاشخانێکی کۆمەلایەتی و مێژووییدا داکوتاوە.

دەبێ ئەوە لە یاد نەکەین هەروەک مارکس گوتوویەتی، کە رۆشنبیر پێویستە خۆی رۆشنبیربکات، بەزمانی زاراوەیی هاوچەرخ، مێشکی مێشک شۆر پێویستە خۆی شۆرابێتەوە.

مێژوونووس پێش ئەوەی دەست بەنووسینی مێژوو بکات بریتییە لەبەرهەمی مێژوو.

ئەو مێژوونووسانەی کتومت لە بارەیانەوە قسە دەکەم - گرۆتەو مومس، تریڤلیان و نامیەر- گەر دەستەواژەیەکی رەوابێ، ئەوا هەریەکەیان لە تاکە قالبێکی سیاسی و کۆمەلایەتیدا لەقالب درابوون؛ گۆرانێک لە تێروانینی نێوان کاری پێشترو دواتریاندا بەدی ناکرێت.

هەندێک مێژوونووس لەسەردەمەکانی گۆرانی خێرادا لە نووسینەکانیاندا سیستەمێکی کۆمەلگە و کۆمەلایەتی رەنگی نەدەدایەوە، بەلکو بەدوای یەکتری داهاتنی کۆمەلێک سیستەمی جیاوازبوو. باشترین نمونەی دەربارەی ئەوە زانیبێتم مێژوونووسی گەورەی ئەلمانی ماینکە بوو، بەشێوەیەکی نائاسایی تەمەنی ژیان و کارەکەی درێژبوو، بەختی ولاتەکەی وابوو زنجیرەیەک گۆرانکاری شۆرشگێری و فەلاکەتباری رووبدەن.

لەراستـیـدا سێ مـاینکەی جیـاوازمـان هەیە، هەریەکـەیان قسـەکـەری سـەردەمێکی مێـژوویی جیاوازە و هەریەکەشیان لە میانەی یەکێک لە سێ کارە گەورەکەی قسە دەکات.

مـــاینەکـــەی، Weltbürgerthum و enationalstaqt لە ١٩٠٧-دا بڵاوکـــراونەتەوە، کـــە بەمتمانەوە وەک زۆربەی بیرمەندەکانی سەدەی نۆزدەهەم بەدەستهێنانی ئایدیالی نەتەوەیی ئەڵمان لە رایخی بسمارکیدا دەبینرێتەوە، لە مازینییەوە بەرەو سەر نەتەوەگەری لەگەڵ باڵاترین شێوەی جیـهانگەراییدا هاورێک دەکـات ئەمەش بەرهەمی قسـەی بریقەداری ئەنجامی ڤـیل هیلمـینە تا دەگاتە سەردەمی بسمارک.

ماینەکەی، Die Idee der Staatsträson، لە ١٩٢٥-دا بڵاوکراوەتەوە، کە بەعـەقڵی لێک ترازاو و دەبەنگی کۆماری ڤایمەر قسە دەکات: جیهانی سیاسەت بوو بە گۆڕەپانی کێبـەرکێی چارەسەر نەکراوی نێوان پاساوی دەوڵەت و ئەخلاق، کە لە دەرەوەی سیاسەت بوو، وەلێ لە دوا هەواردا ناتوانێ ژیان و ئاسایشی دەوڵەت ببڕێ.

لە کۆتاییدا ماینەکەی (Die Entstehung des Historismus) لە ١٩٣٦-دا بڵاوکرایەوە، کاتێک بەهۆی لێشاوی نازییەوە شەرەفە ئەکادیمیەکانی لێکرانەوە، هاواری بێ ئومێدی رادەگەیەنێ و جۆرێک لە مێـژووگـەرایی رەتدەکـاتەوە، وادیارە دان بە هەرچیـەک بێت، راسـتـە دادەنێت و بەناڕەحەتی لە نێوان راژەی مێژوویی و رەهای سەرووی عەقڵانییەتدا دێت و دەچێت.

دوای هەمـوو ئەمـانەش، کـاتێک مـاینەکـە لە تەمـەنی پیـریدا بینی وڵاتەکـەی ملکەچی شکستێکی سەربازییە، کە لە شکستی ساڵی ١٩١٨ تێک شکێنەرترە، بەبێ پشتیوانی لەکتێبی Die Deutsche Katastrophe -دا گەڕایەوە سەر ئەو باوەڕەی مێژوو لە ژێر بەزەیی چانسێکی چەمووس و کوێرانە دایە(٣١).

لەوانەیە لێرەدا دەروونناس یان ژیاننامەنووس وەک تاکەکەسێک بایەخ بەپەرەسەندنی ماینەکە بدات: وەلێ ئەوەی سەرنجی مێژوونووس رادەکێشێت ئەو شێوازەیە، کە ماینەکە سێ - تەنانەت چوار - سـەردەمی دوابەدواییـە و تـەواو دژیەکی ئەم سـەردەمـە بەرەو رابردوویەکی مـێـژوویی دەگێڕێتەوە.

یان با نمونەیەکی جیاوازی نزیکتر لە خۆمان وەربگرین. کاتێک لە ١٩٣٠-یەکاندا هێرش، کرایە سەر بیروباوەڕە پیرۆزەکان و پارتی ئازادیخوازیش وەک هێزێکی کارا لە سیاسەتی بەریتانی کتومت دامرکێندرایەوە، پرۆفیسۆر بەتەرفیلد کتێبێکی نووسی بەناوی راڤەکردنی وێگ لە بارەی مێژوو، کە سەرکەوتنێکی گەورەو شایان بەخۆی بەدەستهێنا. ئەم کتێبەش لە چەندین لایەنەوە کـتـێـبـێکی گـرنگە - نەک کـەمـتـر چونکە تاکـە ناوێکی ویگی نەهێناوە جگە لە فـۆکس، کـە

مێژوونووس نەبوو، یان ناوی تاکە مێژوونووسێکی نەهێناوە جگە لە ئاکتن، کە ویگی نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا راڤەکردنی ویگی بەزیاتر لە ١٣٠ لاپەڕە ئاشکرا دەکات (کە هێز دەتوانم بەبێ هاوکاری ئیندێکسێک بیدۆزمەوە)(٣٢)

وەلێ هەرشتێک، کە لە پەرتووکەکەدا لەڕووی درێژی و وردی و دروستییەوە کەموکورتی هەبووبێت بەجنێوێکی بریقەدار قەرەبووکراوەتەوە.

خوێنەری بێگومان کردووە، کە راڤەکردنی ویگ شتێکی خراپ بووە؛ یەکێکیش لەو تۆمەتانەی دراوەتە پاڵی ئەوەبوو، کە راڤەکردنی ویگ، رابردوو بەئاماژەدا بەئێستا دەتوێژێتەوە، لەم خاڵەدا پرۆفیسۆر بەتەرفیلد دڵ و رەق و کاتیگۆری بووە: گەر رەوا بێ بڵێین توێژینەوەی رابردوو بەیەک چاو لەم سەردەمەدا بریتییە لەسەرچاوەی تەواوی گوناح و هەڵەکان لە مێژوودا... ئەوەش بریتییە لە کرۆکی ئەوەی لە واژەی، نامێژوویدا مەبەستمانە(٣٣).

دوانزە ساڵ تێپەڕین و شێوازی هێرشکردنە سەر بیروباوەڕە پیرۆزەکان (iconoclasm) کۆتایی پێهات.

وڵاتی پرۆفیسۆر بەتەرفیلد کەوتە جەنگێکەوە بەزۆری بەجەنگێکیان دادەنا، کە لە پێناو سەربەستییە دەستووریەکانی بەرجەستەبوو لەناو تەقلیدی ویگدا دەجەنگێت لەژێر سایەی سەرکردەیەکی گەورەدا، کە هەمیشە، گەر دەستەواژەیەکی رەوابێ، لاڤەی بۆ رابردوو بەیەک چاو لەم سەردەمەدا دەکرد. پرۆفیسۆر بەتەرفیلد لە پەرتووکێکی بچووک بەناوی، مرۆڤی ئینگلیزو مێژووەکەی، کە لە ١٩٤٤-دا بڵاویکردۆتەوە تەنها بڕیاری ئەوەی نەداوە، کە راڤەکردنی ویگ دەربارەی مێژوو راڤەکرنێکی ئینگلیزی بووە، بەڵکو بەتاسەوە دەربارەی هاوپەیمانی مرۆڤی ئینگلیز لەگەڵ مێژووەکەیداو، لە پێوەندی نێوان ئێستاو رابردوو، دواوە(٣٤).

سەرنجدانی ئەم سەرو بنیانەی تێڕوانینەکە رەخنەگرییەکی نادۆستانە نییە.

مەبەستم ئەوە نییە بەتەرفیلدی یەکەم لەگەڵ بەتەرفیلدی دووەمدا بەسەلماندن رەتبکەمەوە، یان پرۆفیسۆر بەتەرفیلدی سەرخۆش لەگەڵ پرۆفیسۆر بەتەرفیلدی ناسەرخۆشدا رووبەڕوو بکەمەوە.

بەتەواوی ئەوە دەزانم، ئەگەر یەکێک بەخوێندنەوەی هەندێک لە شتەکانمەوە ماندوو بووبێت، کە پێش جەنگ و لە ماوەی جەنگ نووسیومن، ئەوا لەوانەیە بەهیچ شێوەیەک لە قایلکردنمدا لە بارەی شتە دژیەک و ناچونیەکەکانەوە: دووچاری ئاستەنگ نابێتەوە بەلایەنی کەمیشەوە وەک هەریەکێک ئەوەندە زەحمەت نابێت، کە لەوانەی تردا پشکنیومن.

لەراستیدا دڵنیانیم لەوەی پێویستە ئێرەیی بەهەر مێژوونووسێک ببەم، کە بەشەڕەفەوە دەتوانێ بانگەشەی ئەوە بکات، کە لە پەنجا ساڵی رابردوودا بەبێ گۆڕانە رادیکاڵییەکانی تێڕوانینەکە لە

میانەی بوویەرە بلەرزەکانی زەویدا ژیاوە.

مەبەستم تەنها ئەوەیە پێشانی بدەم چەند بەوردی کاری مێژوونووس لەو کۆمەڵگەیە ڕەنگ دەداتەوە، کە کاری تێدا دەکات.

ئەمە بەتەنها ئەو ڕووداوانە نییە، کە لە تەکانێکی بەردەوامدان، بەڵکو مێژوونووس خۆی لە تەکانێکی بەردەوامدایە.

کاتێک کارێکی مێژوویی بەدەستەوە دەگری، ئەوەندە بەس نییە سەیری ناوی نووسەرەکە بکەی لەسەر ڕووپەڕی ناو ونیشانەکەدا: هەروەها دەبێت سەیری کاتی بڵاوکردنەوە یانیش نووسینەکە بکەی - تەنانەت ئەوەش هەندێک سات ئاشکرا کەرترە.

گەر فەیلەسووف لەوەدا ڕاستبێ، کە پێمان دەڵێ ناتوانین دووجار خۆمان فڕێ بدەینە هەمان ڕووبارەوە، ڕەنگە بەهەمان ئەندازەو لەبەرهەمان هۆکار ئەوەشیان ڕاستبێ، کە ناکرێ دوو پەرتووک لەلایەن هەمان مێژوونووسەوە بنووسرێت.

هەروەها، گەر بۆ ساتێک واز لە مێژوونووسی تاکەکەس بهێنین و بچینە سەر ئەوانەی پێیان دەگوترێ ئاراستە فراوانەکان لە نووسینی مێژوودا، ئەوا تا ئەو ئەندازەیەی مێژوونووس بەرهەمی کۆمەڵگەیەتی تەواو ڕوونتر دەبێتەوە.

مێژوونووسە بەریتانییەکان جگە لە کەمێکیان نەبێت لە سەدەی نۆزدەهەمدا ڕێڕەوی مێژوویان بەهێمای بنەمای پێشکەوتن دادەنا: ئایدیۆلۆژیای کۆمەڵگەکیشیان لە هەلومەرجی پێشکەوتنێکی خێرای بەرچاودا گوزارشت دەکرد.

مێژوو دەهەنبەر مێژوونووسە بەریتانییەکان پڕ مانابوو، مادامێک لە بەرژەوەندی ڕێگەکەماندا بووبێت؛ وەلێ ئێستاکە وەرچەرخانێکی هەڵەی وەرگرتووە، باوەڕ بەمانای مێژوو بۆتە بیدعەیەک دوای جەنگی جیهانی یەکەم توینبی هەوڵێکی بێ هوودەی دا بۆ ئەوەی تیۆری خولاو لە جێگەی تێڕوانینی هێڵەکی مێژوو دابنێت - کە بەئایدیۆلۆژیای کۆمەڵگەیەک لە داڕووخاندا جیا دەکرێتەوە[٣٥].

مێژوونووسە بەریتانییەکان دوای ناکامییەکەی توینبی بەزۆری حەزیاندەکرد دەستیان بتەکێنن و ئەوەش ئاشکرا بکەن، کە بەهیچ شێوەیەک نموونەیەکی گشتی لە مێژوودا نییە. فیشەر تێبینییەکی بێ هوودەی ئەو ڕاستییەی کرد[٣٦] کە تاڕادەیەک بەقەدەر وتەکەی ڕانکە لەم سەدەی دواییدا جەماوەری هەبوو.

گەر کەسێک پێم بڵێ مێژوونووسە بەریتانییەکان سی ساڵی دوایی ئەم گۆڕانەیان لە دڵدا وەک دەرئەنجامی ڕەنگدانەوەیەکی قوڵی تاکەکەس و سوتانی چرایەکی نیوەشەو لە هەورە بانە

جیاوازەکانیاندا تاقیکردۆتەوە، ئەوا بەپێویستی نازانم راستییەکە گفتوگۆ بکەم و رەتی بکەمەوە.

وەلێ لەوەدا بەردەوام نەبم، کە تەواوی بیرکردنەوەی تاکەکەس و سووتانی چرا نەوتییەکە بەدیاردەیەکی کۆمەلاَیەتی و بەرهەم و دەربڕینی گۆڕانێکی ئەسلّی دابنێم لە تایبەتمەندی و تێڕوانینی کۆمەڵگەکەماندا دوای ساڵی ١٩١٤ .

ئاماژە پێدەرێکی گرنگتر بەتایبەتمەندی کۆمەڵگەیەک نییە لەو جۆری مێژووەی دەینوسێ یان شکست دەهێنێ بینووسێ.

مێژوونووسی هۆڵەندی گەیل لە گوتارە سەرنج راکێشەکەیدا، کە لەژێر ناوونیشانی، ناپلیۆن لایەنگری و دژایەتی، وەرگێڕدراوە، پێشانی دەدات چۆن بڕیارە دوابەدوای یەکەکانی مێژوونووسە فەرەنسییەکانی سەدەی نۆزدەهەم دەربارەی ناپلیۆن نموونەی گۆڕان و کێشمەکێشی هزرو ژیانی سیاسی فەرەنسی لەسەرتاسەری سەدەکەدا رەنگیان داوەتەوە.

هزری مێژوونووسان، وەک مرۆڤەکانی دیکە، بەهۆی ژینگەی کات و شوێنەوە لە قالب دەدرێ. ئاکتن بەتەواوی ئەم راستییەی زانیوە و بەدوای ئەوەشدا گەڕاوە لە خودی مێژوودا لە وەڕا بکات:

پێوستە (ئەو نووسیویەتی) مێژوو نەک هەر لە کاریگەری زێدەی سەردەمەکانی تردا رزگارکەرمان، بێت بەڵکو پێویستە لە کاریگەری زێدەی خۆمان و زۆرداریەتی ژینگەو فشاری ئەو هەوایەیش، کە هەناسەی پێ دەدەین، رزگارکەرمان بێت(٣٧).

رەنگە ئەمە هەڵسەنگاندنێکی گەشبیانەی رۆڵی مێژوو بێت. سەرکێشی دەکەم گەر باوەڕ بەوە بکەم کە ئەو مێژوونووسەی زۆر لە رەوشی خۆی ئاگادارە و زۆریش لە تێپەڕاندنی ئەوەدا بەتوانایە، هەروەها لە نرخاندنی سروشتی جەوهەری جیاوازییەکانی نێوان کۆمەڵگە و تێڕوانینەکانی خۆی و جیاوازییەکانی نێوان سەردەمەکانی ترو وڵاتەکانی دیکە، لەو مێژوونووسە بەتواناترە، کە بەدەنگێکی زل ناڕەزایی ئەوە دەردەبڕێت، کە تاکەکەسێکەو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی نییە.

وا دیارە توانای مرۆڤ بۆ بەرزبوونەوەی بەسەر رەوشی کۆمەڵایەتی و مێژوویی خۆیدا بەهۆی ئەو هەستیارییەتییەوە مەرجدار دەکرێت، کە بەهۆیەوە برێ تێوەگلانی لەو رەوشەدا دەزانێ.

لە گەڵاڵە نامەی یەکەمدا گوتم: پێش ئەوەی مێژوو بتوێژێتەوە (پێویستە) مێژوونووس بتوێژیتەوە.

هەنووکە ئەوەشی دەخەمە سەر کە: پێش ئەوەی مێژوونووس بتوێژێتەوە پێویستە ژینگە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکەشی بتوێژیتەوە.

مێژوونووس تاکەکەسێکە، هەروەها بەرهەمی مێژوو و کۆمەڵگەیە بۆیە دەبێ لەژێر ئەم تیشکە

دوو بەرامبەرەدا قوتابی مێژوو فێر ببێ بایەخی پێبدات.

بائێستا واز لە مێژوونووس بهێنین و لەژێر تیشکی هەمان پرسدا بیر لەلاکەی تر هاوکێشەکەم - راستیەکانی مێژوو - بکەینەوە.

ئایا مەبەستی لێکۆڵینەوەی مێژوونووس ئاکارو رەوشتی تاکەکەسەکانە یان کردەی هێزە کۆمەڵایەتییەکانە؟ لێرەدا بەسەر زەمینەیەکی پێ لەسەر داندراودا دەڕۆم. کاتێک سێر ئیسیاھ بێرلین چەند ساڵێکی کەم بەر لە ئێستا گوتارێکی جەماوەری و پرشنگداری لەژێر ناوونیشانی ، حەتمیەتی مێژوویدا، بڵاوکردەوە - کە دواتر لەم گەڵاڵەنامانەدا دەگەڕێمەوە سەر بابەتە سەرەکییەکانی - بیرلین دروشمێکی خستۆتە پێشەوەی گوتارەکەی، کە لە کارەکانی تی. ئێس. ئیلیۆت، هێزە گەورە ناکەسایەتییەکان -ەوە هەڵیبژاردووە، لەسەراپای گوتارەکەشدا گاڵتە بەو خەڵکانە دەکات، کە باوەڕیان بە، هێزە گەورە ناکەسایەتییەکان هەیە، جگە لەو تاکەکەسانەی وەک فاکتەرێکی یەک لایی کەرەوەن لە مێژوودا.

ئەو تیۆرەی پێی دەڵێم تیۆری بادکینگ جۆن دەربارەی مێژوو - ئەو تێڕوانینەی دەڵێ: کاری گرنگ لە مێژوودا بریتییە لە تایبەتمەندی و ئاکارو رەوشتی تاکەکەسەکان - بنچینەیەکی رەسەنی دوورودرێژی هەیە.

ئارەزووی گریمانکردنی کارامەیی تاکەکەس وەک هێزێکی دروستکەر لە مێژوودا بریتییە لە قۆناغە سەرەتاییەکانی هۆشداری مێژوویی.

گریکە کۆنەکان حەزیاندەکرد دەسکەوتەکانی رابردوو لە ناوی پاڵەوانە تیرەییەکانەوە (eponymous) ناوزەد بکەن، کە بەگریمان بەپرسی خۆیانیان دادەنان، هەروەها حەزیاندەکرد داستانەکانیان بۆ هۆمەر ناوێکی هۆزانڤان بگێڕنەوەو یاساو دەستوورەکانیشیان بۆ لیکۆرگۆس یان سۆلۆتێک بگێڕنەوە.

هەمان ئارەزوو لە رێنسانسدا دەردەکەوێ، کاتێک پلونارفی. ژیاننامەنووس و ئەخلاقناس، زیاتر لە مێژوونووسەکانی شوێنەواری کۆن، کەسایەتییەکی جەماوەریترو کاریگەرتربوو لە پاشماوەی کلاسیکیدا، گەر رەوابێ بڵێین، بەتایبەتی لەم وڵاتەدا، ئەوا هەمووومان هەر لە کۆشی دایکماندا ئەم تیۆرە فێربووینە، هەروەها رەنگە پێویستبێ ئەمڕۆکە ئەوە بزانین، کە دەربارەی ئەو هەندێک شتی منالانە هەیە، یان بەهەرحاڵ وەک کاری منالانە.

ئەو بیرۆکەیە کاتێک کۆمەڵگە سادەتربوو تاڕادەیەک مەعقولانەبوو، هەروەها وادیارە کاروبارە گشتییەکان لەلایەن دەستەیەکی زاندراوی تاکەکەسەکانەوە بەڕێوەبرابێ.

ئەمەشیان بەشێوەیەکی ئاشکرا لەگەڵ کۆمەڵگە ئاڵۆزترەکانی ئەم سەردەمەماندا ناگونجێت؛ لە

دایک بوون زانستی نوێی سۆسیۆلۆژیاش لە سەدەی نۆزدەهەمدا وەڵامێکی گەشەکردنی ئەم ئالۆزییە بوو.

لەگەڵ ئەوەشا تەقلیدی کۆن زەحمەت دەمرێ. لە دەسپێکی ئەم سەدەیەدا، مێژوو وەک ژیاننامەی مرۆڤە گەورە و دەستەڵاتدارەکان، هێژ گوتەیەکی بەنێوبانگ بوو.

تەنها دە ساڵێک بەر لە ئێستا، مێژوونووسێکی گەورەی ئەمریکی، نەک زۆر بەجدی، هاورێکانی بەکوشتنی بەرفرەی کەسایەتییە مێژووییەکان تۆمەتبارکرد و بەدەسکەلای دەستی هێزە سیاسی و ئابوورییەکانی دانان[٣٨].

سەرخۆشەکانی ئەم تیۆرە ئەمرۆکە شەرم لە بەرامبەر ئەمەدا دەکەن؛ وەلێ دوای گەڕان دەستەواژەیەکی هاوشێوەی باشی ئەو بارەم لە پێشەکی یەکێک لە کتێبەکانی خاتوو وێج وودا بینییەوە.

(ئەو نووسیوویەتی) ئاکاری مرۆڤ وەک تاکەکەس زیاتر سەرنجم رادەکێشێت نەک ئاکارەکانیان وەک گروه یان پۆل. دەتوانرێ مێژوو بەم نەزعەیە یانیش هەروەها بەنەزعەی دیکە بنووسرێ؛ ئەوەش فریودانەکە نەکەمدەکات و نەزیاد دەکات... ئەم پەرتووکە. هەوڵێکە بۆ تێگەیشتن لەوەی چۆن ئەم مرۆڤانە هەستیانکردووەو بۆچی بەگوێرەی هەڵسەنگاندنی خۆیان ئەوەی کردوویانە دەیکەن[٣٩]. ئەم دەستەواژەیە راست و دروستە؛ هەروەها لەبەرئەوەی خاتوو وێج وود نووسەرێکی جەماوەرییە، ئەوا دڵنیام لەوەی زۆربەی خەڵکیش وەک ئەو بیردەکەنەوە.

بۆ نموونە، دکتۆر راوز پێمان دەڵێ، کە پێڕۆی ئەلیزابێست بۆیە شکستی هێنا چونکە جێمسی یەکەم نەیدەتوانی لێی تێبگات و شۆڕشی ئینگلیزی سەدەی حەڤدەهەمیش بەهۆی دەبەنگی هەردوو پادشا ستیوارتی یەکەم[٤٠] رووداوێکی لەناکاوی بەرێکەوت بوو.

تەنانەت سێر جێیمس نیڵ، کە مێژوونووسێک بوو زۆر لە دکتۆر راوز دلڕەقتر بوو، وادیارە هەندێک جار زیاتر حەزیکردووە سەرسام بوونەکەی خۆی بەشاژن ئەلیزابیت دەربڕێ نەک ئەوە روونبکاتەوە، کە پادشایەتی تیۆدۆر نوێنەرایەتی کردووە هەروەها سێر ئیساه بیرلین لە گوتارێکدا، کە وەک خۆی وەرمگرتووە لەو بەڵگانە زۆر دڕدۆنگە، کە رەنگە مێژوونووسان لە پەنجە خستنە چاوی (denounce) جەنگیزخان و هیتلەر وەک دوو پیاو خراپ شکست بێنن[٤١].

تیۆری بادکینگ جۆن گوود کرێن بێس بەتایبەتی کاتێک بەندو باو دەبێت، کە دێینە سەر سەردەمە نوێترەکان. ئاسانترە پێی بگوترێ کۆمیونیزمی بەرهەمی داهێندراوی مارکس (- brain child) نەک شیکردنەوەی بنەچەک و تایبەتمەندییەکانی (کە ئەم گوڵەم لە بڵاوکراوەی دەستە بەرەکانی بازاڕی دراو گۆڕینەوە چنیوە) بۆ ئەوەی شۆڕشی بەلشەڤی بۆ دەبەنگی نیکۆلاسی دووەم

یان زێری ئەڵمانی بگێڕدرێتەوە نەک توێژینەوەی هۆکارە قووڵە کۆمەڵایەتییەکانی، هەروەها بۆ تێگەیشتن لەوە، کە هەردوو جەنگە جیهانییەکە بەهۆی ئەگریسی و ئارەزووی خراپەکاری تاکەکەسیانەی ڤیلهیلمی دووەم و هیتلەرەوە بوون نەک بەهۆی لەبەریەک هەڵوەشانی مەڵبەندێک لە پێڕۆی پەیوەندییە نێو دەوڵەتییەکاندا.

کەوابوو دەستەواژەکەی خاتوو وێچ وود دوو گرێمان بەیەکەوە کۆدەکاتەوە.

دەستەواژەی یەکەم بریتییە لە ئاکارو ڕەوشتی مرۆڤەکان وەک تاکەکەسانێکی جیاواز لە ئاکارو ڕەوشتیان وەک ئەندامانی گروهێک یان پۆلێک، هەروەها بریتیشە لەوەی ڕەنگە مێژوونووس بەشێوەیەکی لۆژیکی چاو ببڕێتە یەکێک نەک ئەویتر.

دەستەواژەی دووەم بریتییە لە توێژینەوەی ئاکارو ڕەوشتی مرۆڤەکان وەک تاکەکەسانێک، کە توێژینەوەی پاڵنەرە هۆشەکییەکەی کارەکانیشیان دەگرێتەوە.

دوای ئەوەی پێشتر گوتم پێویستیم بەکۆشش نابێ بۆ شیکردنەوەی خاڵی یەکەم.

تێڕوانین دەربارەی مرۆڤ وەک تاکەکەسێک زیاتر یان کەمتر لەو تێڕوانینە فریودەرتر نییە، کە مرۆڤ وەک ئەندامێکی گرووهەکە دادەنێت؛ ئەوەشیان هەوڵێکە بۆ جیاکردنەوەیەک لە نێوان هەردووکیاندا ئایا کامەیان فریودەرە.

تاکەکەس وەک پێناسە بریتییە لە ئەندامی گرووهێک، پۆلێک، تیرەیەک، نەتەوەیەک، یان ئەوەی دەتەوێ.

بایۆلۆژیستە کۆنەکان بەپۆلینکردنی جۆری باڵندەکان، دڕندەکان و ماسییەکان لە بێرکمەکان (cages) و حەوزی شووشە (aquatirum,s) و پێشەنگاکاندا قایل بوون، و بەدوای زیندەوەرە زیندووەکاندا نەدەگەڕان، کە بەژینگەکانیانەوە بەندیوار بوون.

پێدەچێ هێژ زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەتەواوی لەم قۆناغە سەرەتاییە ڕزگاریان نەبووبێت.

هەندێک کەس جیاوازی لە نێوان سایکۆلۆجی دەکەن وەک زانستی تاکەکەس و سۆسیۆلۆژی وەک زانستی کۆمەڵگە؛ ناوی سایکۆلۆجیزم لەو تێڕوانینە نراوە، کە تەواوی کێشە کۆمەڵایەتییەکان بەشێوەیەکی بنچینەیی ملکەچی شیکردنەوەی ئاکارو ڕەوشتی تاکەکەسی مرۆڤ دەبن.

وەلێ ئەو سایکۆلۆژیستەی کە لە توێژینەوەی ژینگەی کۆمەڵایەتی تاکەکەسدا شکستی هێناوە. ڕەنگە زۆر سەرکەوتوو نەبێت(٤٢).

ئەوەش فیتمان دەدات جیاوازی بکەین لە نێوان زانستی ژیاننامەنووسی، کە مرۆڤ وەک تاکەکەسی دادەنێت، و زانستی مێژوو، کە مرۆڤ وەک بەشێک لە هەموو دادەنێت، بەمەش

فیتمان دەدات ئەوە پێشنیار بکەین، کە زانستی باش ژیاننامەنووسی مێژوویەکی خراپ دروستدەکات.

ئاکتن رۆژێک لە رۆژان نووسیویەتی هیچ شتێک جگە لەو ئارەزووەی، کە لەلایەن تایبەتمەندییەکانی تاکەکەسەوە نیگا دەکرێ نابێتە هۆی هەڵەی زیاترو ناڕاستی لە تێڕوانینی مرۆڤ دەربارەی مێژوو.(٤٣)

بەڵام ئەم جیاکردنەوەیە زۆر ناڕاستە.

ناشمەوێ پەنا ببەمە بەر گوتەی فیکتۆری، کە لەلایەن جیێ. ئیم. یەنگ لەسەر رووپەری ناوونیشانی کتێبەکەیدا داناوە، بەناوی بەریتانیای سەردەمی ڤیکتۆری: خزمەتکارەکان لە بارەی خەڵکەوە دەدوێن، پیاوە ماقووڵەکانیش هەلومەرج و کارەکان تاووتوێدەکەن.(٤٤)

هەندێک ژیاننامەی کەسی هاوکاری جدی مێژوون: لە بواری خۆمدا، هەردوو بایۆگرافییەکەی ئیسیاک دۆیچەر دەربارەی ستالین و ترۆتسکی دوو نموونەی زەق و بەرچاون.

ژیاننامە کەسییەکانی دیکەش وەک رۆمانی مێژوویی دەچنەوە سەر ئەدەب.

پرۆفیسۆر تریڤۆر رۆ پەر بۆ لیتۆن ستراشی نووسیوە، کە پرسە مێژووییەکان هەمیشە و تەنها پرسی ئاکاری تاکەکەس و نامۆیی و سەمەرەیی تاکەکەس بوونە.. هەروەها هەرگیز بەدوای ئەوەدا نەگەڕاوە وەڵامی پرسە مێژووییەکان و پرسەکانی سیاسەت و کۆمەڵگە بداتەوە، یان تەنها پرسیاریش بکات(٤٥).

هیچ کەسێک ناچار نییە مێژوو بنووسێ یان بخوێنێتەوە هەروەها دەتوانرێ باشترین پەرتووک دەربارەی رابردوو بنووسرێ، کە مێژوو نییە.

وەلێ پێم وایە بەگوێرەی دابو نەریتی تەقلیدی راهاتووین - هەروەک گریمانەکەم لەم گەلاڵەنامانەدا بکرێ - بۆ هێشتنەوەی وشەی، مێژوو، لە پێناو پرۆسێسی لێکۆڵینەوەی رابردووی مرۆڤ لە کۆمەڵگەدا.

خاڵی دووەم ئەوەیە، مێژوو گرنگی بەو لێکۆڵینەوەیە دەدات، کە بۆچی تاکەکەسەکان، بەگوێرەی هەڵسەنگاندنی خۆیانی ئەوەی کردوویانە دەیکەن، هەر لە یەکەم تێڕوانیندا زۆر سەیر دەردەکەوێ، هەروەها گومانمدەبەم، کە خاتوو وێج وود وەک خەڵکە هەستیارەکانی دیکە ئەوە جێبەجێ ئەکات، کە پێیدا هەڵدەدات، ئینجا گەر ئەوە بکات، ئەوا مێژوویەکی زۆر سەیر دەنووسێ.

هەموو کەسێک ئەمڕۆ ئەوە دەزانێ، کە مرۆڤەکانی هەمیشە، یان تەنانەت لەوانەیە بەشێوەیەکی

ئاسایی لە سونگەی ئەو پاڵنەرانەوە کارناکەن، کە بەتەواوی لە بارەیانەوە هۆشیارن، یان ئەوانەی مرۆڤەکان حەز دەکەن ئاشکرایان بکەن؛ هەروەها هەڵاویرەکردنی تیروانین لە پاڵنەرە ناهۆشیارو شاراوەکان، بێگومان وەک چوونە سەر کاری یەکێکە بەچاوێکەوە، کە بەئەنقەست دادەخرێ.

هەرچۆنێک بێت، ئەمە بەگوێرەی قسەی هەندێک کەس ئەوەیە، کە مێژوونووسان ناچارن بیکەن.

ئەمەش خاڵەکەیە.

مادام بەوە قایلن و دڵنیایی بڵێی، کە خراپەی کینگ چۆن لە چاو برسییەتییەکەی یانیش لە دەبەنگییەکەی یان لە نەمانەکەیدا بووە بۆ ئەوەی ببێتە ستەمکار، ئەوا لە بارەی ئەو جۆرە تاکەکەسانەوە قسە دەکەی، کە تەنانەت لە ئاستی مێژووی سەرەتایشدا دەکرێ لێیان تێبگەین.

وەلێ کاتێک دەڵێی کینگ جۆن ئامرازێکی بەرژەوەندییە بەدەستهاتووەکان بووە، کە بوونەتە بەرگر بۆ گەیشتن بەدەستەڵاتی دەرەبەگە خاوەن زەوی و زارەکان، ئەوا نەک تەنها تێروانینێکی ئاڵۆزو تێکەڵ لە بارەی خراپی کینگ جۆنزەوە دروست دەکەی، بەڵکو وادیارە ئەوەش پێشنیار بکەی، کە ئاکاری هۆشداری تاکەکەسەکان و بوویەرە مێژووییەکان دیاری دەکرێن، کە ئارەزووە نا هۆشدارییەکانیان بەرێوە دەبەن.

بێگومان ئەمەش شتێکی بێ مانایە.

ئەوەی پەیوەندی بەمنەوە هەبێ ئەوەیە باوەڕم بەهەریەک لە مانەی خوارەوە نییە: بایەخ و چاودێری خوداوەندی و رۆمی جیهان و قەزاو قەدەر و مێژوو بە(H)-ی کاپیتەڵ، یان هەر کورتکراو داپڵۆسینێکی دیکە، کە هەندێک سات بۆ رێنماییکردنی رێڕەوی رووداوەکان گریمانکراون، هەروەها دەبێ بەبێ مەرج راڤەکردنەکەی مارکس پشت راست بکەمەوە، مێژوو هیچ ناکات، سامانێکی زۆری نییە، ناجەنگێت.

بەڵکو مرۆڤە؛ مرۆڤی راستەقینەی زیندوو ئەو کەسەیە، کە هەموو شتێک دەکات، سامانی هەیەو دەجەنگێت[٤٦].

ئەو دوو سەرنجەی دەمەوێ لە بارەی ئەم پرسیارەوە بیاندەم هیچ پەیوەندییەکیان بەتێڕوانینی پەتی مێژووەوە نییەو لەسەر بنەمای سەرنجدانێکی پوختی ئەزموونی دامەزراون.

سەرنجی یەکەم ئەوەیە مێژوو تارادەیەکی زۆر بریتییە لە پرسی ژمارەکان.

کارلیل لەو داکۆکیکردنە نەگونجاوە بەرپرسیاربوو، کە، مێژوو بریتییە لە ژیاننامەی پیاوە گەورەکان؛ وەلێ گوێ بۆ پاراوترین و گەورەترین کارە مێژووییەکەی بگرە:

فشاری برسیەتی و رووت و ڕەباتی و میردەزمە(***) قورسایی خستۆتە سەر دڵی بیست و پێنج ملیۆن کەس: ئەمەشی جوڵێنەری سەرەکی بوو لە شۆڕشی فەڕەنسادا، هەروەک دەکرێ جووڵەکە لە هەموو ئەم جۆرە شۆڕشانەدا و لە هەموو وڵاتەکاندا هەبێت، نەک فیزلێدەرە برینداركراوەكان یانیش فەلسەفە دژیەکەکانی لایەنگرانی فەلسەفە و خاوەن دوکانە دەوڵەمەندەکان و پیاو ماقووڵە لادێیەکان بووبن(٤٧).

یان، هەروەک لینین وتوویەتی: لەهەر کوێیەک پۆلەکانی جەماوەر هەبن سیاسەت دەست پێدەکات، بەڵام لەهەر کوێیەکدا ملیۆنان خەڵک هەبن نەک هەزاران، ئەوا سیاسەتی جدی لەوێدا دەستپێدەکات(٤٨). ملیۆنەکانی کارلیل و لینین بریتبوون. لە تاکەکەسەکان:

هیچ شتێک لە بارەیانەوە ناکەسایەتی نەبووە.

هەندێک جار گفتوگۆکردنی ئەم پرسیارە بێ ئاگایی لەگەڵ ناکەسایەتییەتیدا تێکەڵدەکات.

خەڵکی لەوە ناوەستن، کە خەڵک بن، یان تاکەکەسەکان لەوە ناوەستن تاکەکەس بن، چونکە ناوەکانیان نازانین.

ئەو، هێزە گەورە ناکەسایەتیانەی مستەر ئیلیۆت لە بارەیانەوە دەدوێت بریتبوون لەو تاکەکەسانەی، کە کلارندنی پارێزگاری سەرکەش و بێ پێچ و پەنا (Franker) پێیان دەڵێت، خەڵکی پیسی بێ ناو(٤٩). ئەم ملیۆنان خەڵکە بێ تاوانە تاکەکەس بوونەو زۆرتر یان کەمتر بەیەکەوە بەشێوەیەکی ناهۆشیارانە کاردەکەن و هێزێکی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنن.

مێژوونووس لە هەلومەرجە ئاساییەکاندا پێویستی بەوە نییە مەعریفە لە تاکە جووتیارێکی دوژمنکارانە یانیش لادێیەکی دوژمنکارانە وەربگرێ.

وەلێ ملیۆنان جووتیاری دووژمنکارانە لە هەزاران لادێدا فاکتەرێکن ناکرێ لە یاد بکرێن.

ئەو هۆکارانەی بوونە ڕێگر لەبەردەم مارەبڕینی جۆنزدا سەرنجی مێژوونووسان ڕاناکێشن مەگەر هەمان هۆکارەکان ڕێگە لە هەزاران تاکەکەسی دیکەی سەردەمی جۆنز نەگرن، هەروەها ببنە هۆی دابەزینێکی جەوهەری ڕێژەی مارەبڕین: ئەوسا ڕەنگە ئەو هۆکارانە لەڕووی مێژووییەوە زۆر گرنگبن.

پێویست ناکا بەو تێبینییە بێ هوودەیە دوودڵ بین، کە دەڵێ جووڵەکان لەلایەن کەمایەتییەکانەوە دەستپێدەکەن.

سەرلەبەری بزووتنەوە کاراکانیش ژمارەیەکی کەم سەرکردەو ژمارەیەکی زۆر هەواداریان هەیە؛ وەلێ ئەمە مانای ئەوە نییە، کە هەواداری زۆر شتێکی سەرەکی نییە بۆ سەرکەوتنیان. بەم شێوەیە ژمارە لە مێژوودا بەهەند وەردەگیرێ.

سەرنجی دووەم باشتر دەسەلمێندرێ.

نووسەرانی قوتابخانەی جیاوازەکانی هزر لەسەرنجدانی ئەوەدا کۆکن، کە ئاکارو چالاکی تاکەکانی مرۆڤایەتی بەزۆری ئەو دەرئەنجامانەیان هەیە، کە ئەنجامدەرەکان حەزو ئارەزوویان لێیان نەبوویێتن یانیش لەراستیدا هیچ تاکەکەسێکی دیکە حەزو ئارەزووی لێیان نەبووە.

مەسیحی باوەڕی وایە، کە تاکەکەس بەشێوەیەکی هۆشیارانە لە پێناو مەبەستە زۆرە خۆ پەرستییەکانی خۆیدا کاردەکات، هەروەها بریتییە لە هۆکارێکی ناهۆشیارانەی مەبەستی خوداوەند.

دەستەواژەی ماندیڤل، کە دەڵێ، سوودە تایبەتییەکان سوودە گشتییەکان وابەستە دەکەن، بریتیبوو لە دەستەواژەیەکی سەرەتایی و دژیەکی بەئەنقەستی ئەم دۆزینەوەیە.

دەستی شاراوەی ئادەم سمیت و عەقڵی کارامەی هیگڵ، کە تاکەس ئازاد دەکات لە پێناویدا کاربکات و خزمەتی مەبەستەکانی بکات، لەگەڵ ئەوەشدا، کە تاکەکەسەکان باوەڕیان بەخۆیان هەیە ئارەزووە کەسییەکانیان بەدەستبهێنن، ئەوا زۆر ئاساییە پێویستیان بە شایەتمانی دەقی وەرگیراو هەبێت. مارکس لە پێشەکی کتێبەکەیدا بەنێوی، رەخنەسازی ئابووری سیاسی، نووسیویەتی: مرۆڤەکان لەبەرهەمی کۆمەلایەتی هۆ و پێناوەکانی بەرهەمهێنانیاندا دەچنە نێو ئەو پەیوەندییە پێویست و بێ کۆتاییانەوە، کە نەویستیان جیاوازن.

تۆلستۆی لە کتێبی، جەنگ و ئاشتیدا نووسیویەتی: مرۆڤ بەشێوەیەکی هۆشیارانە لە پێناو خۆیدا دەژییێت، بەلام بریتییە لە ئامێرێکی ناهۆشیار لە بەدەستهێنانی ئامانجە گشتییە مێژووییەکانی مرۆڤایەتیدا، لە دەستدا لاسایی ئادەم سمیتی کردۆتەوە(٥٠).

بۆ ئەوەی ئەم دەقە هەڵبژێردراوە کۆتایی پێبێنین، کە پێشتر دەقێکی تەواو دوورو درێژبوو، ئەم وتەیەی پرۆفیسۆر بەتەرفیلد دەهێنینەوە: شتێک لە سروشتی رووداوە مێژووییەکاندا، کە رێڕەوی مێژوو لە ئاراستەیەکەوە دەگۆڕێ، بەشێوەیەک هیچ مرۆڤێک هەرگیز مەبەستی ئەوە نەبووە(٥١).

پاش سەد ساڵێک تەنها شەڕی بچووکی ناوچەیی، ئەوا دوای ساڵی ١٩١٤ دوو جەنگی مەزنی جیهانیمان هەن. راڤەکردنی ئەم دیاردەیە بەو شێوەیەی، کە بڵێین لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەو تاکەکەسانەی جەنگیان ویستووە زۆرتر بوویێتن، یان ئەوانەی ئاشتیان ویستبێ کەمتر بوویێتن لە سێ چارەکی کۆتایی سەدەی بیستەم، ئەوا راڤەکردنێکی ناماقووڵە.

ئەستەمە ئەوە باوەڕ بکەین، کە هیچ تاکێک حەزیکردبێت یانیش ئارەزووی لەوە بووبێت داکشانەوەی مەزنی ئابووری ١٩٣٠-یەکان رووبدات، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا گومانی تیا نییە بەهۆی کردەی ئەو تاکەکەسانەوە روویداوە، کە هەریەکەیان بەشێوەیەکی هۆشدارانە ئامانجێکی

جیاوازی ئاودامانی پێڕۆ دەکرد.

دیاریکردنی راجیایی نێوان ئارەزووەکانی تاکەکەس و دەرئەنجامی چالاکییەکانی هەمیشە پێویستی بەمێژوونووسێکی گێڕەڕەوەی رووداوەکان نییە.

لۆج لە مارتی ١٩١٧-دا لە بارەی وودرۆو ویلسنەوە نووسیوویەتی. ویلسن مەبەستی نییە بچێتە جەنگەوە، بەلام پێم وایە رووداوەکانی راکێشی جەنگی دەکەن[٥٢].

باوەڕکردن بەوەی دەتوانرێ مێژوو لەسەر بنەمای ئەو راڤەکردنانە بنووسرێ، کە بەگوێرەی ئارەزووەکانی مرۆڤن[٥٣]، یان لەسەر بنچینەی وەسفی ئەو پالنەرانەیاندا بنووسرێ، کە لەلایەن خودی ئەنجامدەرەوەکانەوە پێشکەشکراون، یان لەسەر بنچینەی بۆچی بەگوێرەی مەزەندەکردنی خۆیان ئەوەی کردوویانە دەیکەن، ئەوا دژی سەرلەبەری گەواهییەکانە.

لەراستیدا راستییەکانی مێژوو بریتین لەو راستییانەی دەربارەی تاکەکەسن، وەلێ دەربارەی ئەو کردارانەی تاکەکەس نین، کە بەتەنیا ئەنجامیداون، هەروەها دەربارەی پالنەرە راستی و خەیالییەکان نین، کە تاکەکەسەکان خۆیان پێیان وایە لە سوونگەیانەوە کاردەکەن.

ئەوانە بریتین لەو راستییانەی دەربارەی پەیوەندی هەر تاکێکن بەتاکێکی ترەوە لە کۆمەلگەداو دەربارەی ئەو هێزە کۆمەلایەتییانەشن، کە لەکردەوەی دەرئەنجامی تاکەکەسە کانەوە سەرچاوە دەگرن، ئەو دەرئەنجامانەی، کە پێچەوانەی ئەو دەرئەنجامانەن، کە خۆیان ویستوویانن و هەندێک جاریش دژی ئەو دەرئەنجامانەن.

یەکێک لە هەلە مەترسیدارەکانی تێروانینی کۆلینگ وود دەربارەی مێژوو، کە لە دوا گەلالەنامەکەمدا تاووتوێمکرد، بریتبوو لە گریمانکردنی ئەوەی، کە ئەو هزرەی لە دوای کردەکەوەیەو مێژوونووسیش پێویستە لێیبکۆلێتەوە بریتیبووە لە هزری بکەری تاکەکەس، ئەمەش گریمانێکی هەلەیە.

ئەوەی لەسەر مێژوونووس پێویستە لێیبکۆلێتەوە، ئەوەیە، کە دەکەوێتە دوای کردەکەوە؛ و هزری هۆشمەندانەیانیش پالنەری بکەری تاکەکەس لەوانەیە هیچ پەیوەندییەکی بەمەوە نەبێ.

لێرەدا پێویستە هەندێک شت دەربارەی رۆلی شۆڕشگێڕ یان تێکدەر لە مێژوودا باسبکەم.

دانانی وێنەیەکی جەماوەری تاکەکەس لە شۆڕشیدا دژی کۆمەلگە دووبارە درووستکردنەوەی دژیەکییەکی بریقەدار و هەلەیە لە نێوان کۆمەلگەو تاکەکەسدا.

هیچ کۆمەلگەیەک بەتەواوی چوونیەک نییە.

هەموو کۆمەلگەیەک گۆڕەپانی کێبەرکێ کۆمەلایەتییەکانە، و ئەو تاکەکەسانەیش، کە خۆیان لە دژی دەستەلاتدا رێک دەخەن رەنگدانەوەو بەرهەمیان لە پشتیوانانی دەستەلات کەمتر نییە.

ریچاردی دووەم و کاترینی گەورە نوێنەرایەتی هێزە کۆمەڵایەتییەکانیان دەکرد لە بەریتانیای سەدەی چواردەهەم و رووسیای سەدەی هەژدەهەمدا: هەروەها واتە تایلەرو بووگاشیف - ی سەرکردەی شۆڕشی گەورەی کۆیلەکانیش ئەمەیان کرد.

پادشاو شۆڕش گێڕەکان بەیەکەوە بەرهەمی هەلومەرجە تایبەتییەکانی سەردەم و وڵاتەکەیان بوون.

وەسفکردنی تایلەر و پوگاتشیف وەک تاکەکەسی شۆڕشگێڕ لە دژی کۆمەڵگەدا سادەکردنێکی فریودەرە.

ئەگەر ئەوانە تەنها ئەوە بووبن، ئەوا لەوانەیە مێژوونووسەکە هەرگیز لە بارەیانەوە نەیبیستبێت. ئەو دوو کەسانە یەک لە بارە خۆیان لە مێژوودا قەرزداری جەماوەری شوێنکەوتوویانن، و گرنگییەکەشیان لەوەدایە، کە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و هیچی تر.

یان با شۆڕشگێڕێکی بەرچاوترو تاکەکەس ناسێکی ئاست باڵاتر وەربگرین.

هەندێک کەس زیاتر لە نیتشە (Nietzsche) بە شێوەیەکی توندوتیژترو توندڕەوانەتر لە دژی کۆمەڵگەو وڵاتی رۆژگاریاندا کاردانەوەیان هەبووە...

لەگەڵ ئەوەشدا نیتشە بەرهەمێکی راستەوخۆی کۆمەڵگەی ئەوروپی و بەتایبەتیش بەرهەمێکی راستەوخۆی کۆمەڵگەی ئەڵمانی بوو- بریتبوو لەو دیاردەیەی، کە لەچین یان پێرۆدا روونەدەدا.

ئەمەشیان (پشتێک (Generation) دوای مردنی نیتشە، نەک بەو شێوەیەی جیلەکانی هاوردەکانی خۆی دەیانزانی، بەڵکو باشتر روونبوویەوە، کە هێزە کۆمەڵایەتییە ئەوروپییەکان و بەتایبەتیش هێزە کۆمەڵایەتییە ئەڵمانییەکان چەند بەهێزبوونە، کە ئەم تاکەکەسە لە بارەیانەوە گوزارشتی هەبووە؛ و نیتشەش دەهەنبەر وەچەی داهاتوو بۆتە کەسایەتییەکی گرنگتر تا وەچەی سەردەمی خۆی. رۆڵی شۆڕشگێڕ لە مێژوودا چەند وێک چوونێکی لەگەڵ رۆڵی پیاوی گەورەدا هەیە.

تیۆری پیاوی گەورە لە مێژوودا - کە نموونەیەکی قوتابخانەی گود کوین بێسە - لەم ساڵانەی دوایدا پووچەڵ بوویەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم تیۆرە هێژ جار بەجار سەری شپرزەی خۆی هەڵدەبرێت.

سەرنووسەری ئەو زنجیرە پەرتووکە مەنهەجیە جەماوەریانە دوای جەنگی جیهانی دووەم دەستیان پێکرد، بانگهێشتی نووسەرەکانی دەکات بۆ ئەوەی، لە رێگەی نووسینەوەی ژیاننامەی پیاوێکی گەورەوە گفتوگۆیەکی گرنگی مێژوویی بکەنەوە؛ هەروەها مستەر ئیی. جێی پی لە

یەکێک لە گوتارە بچووکەکانیدا گرتووە، کە: دەتوانرێ مێژووی ئەورووپای هاوچەرخ لەبارەی سێ ستەمکارەوە بنووسرێ: ناپلیۆن و بسمارک و لینین[٥٤]

هەرچەندە لە جدیترین نووسینەکانی خۆیدا نموونەی ئەم جۆرە کارە هەڵەشانەی ئەنجام نەداوە.

رۆڵی پیاوی گەورە لە مێژوودا چییە؟ پیاوی گەورە تاکەکەسێکە، هەروەها تاکەکەسێکی ناسراوەو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی گرنگی ناسراو و بەرچاوە.

گیبن سەرنجی داوە، کە ئەمە بریتییە لە راستییەکی روون و ئاشکرا، کە پێویستە سەردەمەکان لەگەڵ کەسایەتییە نائاساییەکاندا بگونجێندرێن، و لێهاتوویی کرۆموێل یانیش رێتز لە تارمایی رزگاربکرێن[٥٥].

مارکس لە پەرتووکی (eighteenth Brumair of Louis Bonaparte)دا دیاردەیەکی پێچەوانەی دیاریکردووە: شەڕی چینایەتی لە فەرەنسادا ئەو هەلومەرج و پەیوەندییانەی دروستکرد، کە لە میانەیەوە کۆمەڵێک کەسایەتی مامناوەندی توانییان لە جلوبەرگی پاڵەواناندا لارو لەنجە لێبدەن.

ئەو گریمانەی دەڵێ بسمارک لە سەدەی هەژدەهەمدا لە دایکبووە جێگەی پێکەنینە، چونکە هێشتا نەبووبوو بەبسمارک و بەهیچ شێوەیەک ئەڵمانیای یەک نەخستبووەو نەشیتوانیبوو ببێتە پیاوێکی گەورە.

پێم وایە هیچ کەسێک وەک تۆلستۆی دەیکا، پێویستی بەوە نییە بەتوندی رەخنە لە پیاوە گەورەکان بگرێت، کە دەڵێ: لەو نازناوە زیاتر نین، کە ناو لە رووداوەکان دەنێن.

بێگومان رەنگە هەندێک سات پەرستشی پیاوی گەورە کۆمەڵێک تیل نیشانی نەگریسی هەبێت.

پیاوی نموونەیی نیتشە کەسێکی چارە بەدە.

پێویستیم بەوە نییە باسی رەوشی هیتلەر، یان دەرئەنجامە مەترسیدارەکانی، پەرستشی کەسایەتی، لە یەکیەتی سۆڤیەتدا بکەم.

بەڵام ئامانجیشم ئەوە نییە شکۆمەندی پیاوە گەورەکان لە کەدار بکەم، نە دەشمەوێ دان بەوەدا بنێم، کە پیاوە گەورەکان هەمیشە تارادەیەک پیاو خراپن.

ئەو تێڕوانینەی هیوام پێیەتی رێگە لەم جۆرە بیرکردنەوەیە بگرێت بریتییە لەو تێڕوانینەی، کە پیاوە گەورەکان لە دەرەوەی مێژوودا دادەنێت و وەک خۆسەپێنەریش بەسەر مێژووەوە سەیریان دەکات بەهۆی گەورە پیاوانەوە وەک ئەو عێفریتانەی لە غەیبەوە موعجیزە ئاسا دەردەکەون بۆ برینی

بەردەوامیەتی راستەقینەی مێژوو[٥٦] تەنانەت ئەمڕۆکەش نازانم، کە دەتوانین وەسفێکی لەوەی هێگڵی کلاسیکی بکەین: پیاوی گەورەی سەردەمەکە ئەو کەسەیە، کە دەتوانێ ویستی سەردەمەکەی لە چەند وشەیەکدا دەربڕێ و ئەوە بگێڕێتەوە، کە ئارەزووی سەردەمەکەی چییەو ئەوەش تەواو بکات.

ئەوەی دەیکا دڵ و کرۆکی سەردەمەکەیەتی؛ سەردەمەکەشی پشت راستدەکاتەوە[٥٧].

دکتۆر لیڤس مەبەستی چەند شتێکی لەم بابەتەیە کاتێک دەڵێت نووسەرە گەورەکان لەڕووی بەرزکردنەوەیی وریایی مرۆڤایەتییەوە گرنگن[٥٨].

پیاوی گەورە هەمیشە یا ئەوەتا نوێنەری هێزە ئامادەکانە یانیش نوێنەری ئەو هێزانەیە، کە لە رێگەی بەرەنگاربوونەوەی دەسەڵاتدا یارمەتی دروستبوونیان دەدات.

وەلێ رەنگە پلەی باڵای دروستکاریەتی بۆ پیاوە گەورەکانی وەک کرۆموێل. یان لینین وازی لێبهێنرێت، کە یارمەتی لە قاڵبدانی ئەو هێزانەیان کرد، کە بەپایە بەرزی و دەستەڵاتیان گەیاندن، نەک ئەوانەی وەک ناپلیۆن یان بسمارک، کە لەسەر پشتی هێزە پێشتر هەبووەکاندا گەیشتنە دەستەڵات.

پێویستە ئەو پیاوە گەورانە لە یاد نەکەین، کە تارادەیەک پشتگیری پێخستنی سەردەمەکەیانکرد بەشێوەیەک مەزنایەتییان لە جیلەکانی دواتردا دەرکەوت.

ئەوەی لای من شتێکی سەرەکییە ئەوەیە تاکەکەسێکی دیارو بەرچاو لە پیاوی گەورەدا بەدی بکرێت، کە لەیەک کاتدا بەرهەم و هۆکارێکی پرۆسێسی مێژوویی بێت، هەروەها نوێنەرو دروستکەری ئەو هێزە کۆمەڵایەتییانەش بێت، کە شێوەی جیهان و هزری مرۆڤەکان دەگۆڕن.

کەوابوو مێژوو بەهەردوو مانای وشەکە - واتە هەم ئەو لێکۆڵینەوەیەی لەلایەن مێژوونووسەوە ئەنجامدراوەو هەم راستییەکانی رابردوویش، کە مێژوونووس لێیان دەکۆڵێتەوە - بریتییە لە پرۆسێسێکی کۆمەڵایەتی، کە تاکەکەسەکان وەک بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی تێیدا کاردەکەن؛ و خەیاڵی دژیەکی نێوان کۆمەڵگەو تاکەکەسیش لە سوورە ماسییەکی وێنەکراو بەولاوە زیاتر نییە، کە بۆ شلەژاندنی بیرکردنەوەمان لەسەر رێگاماندا دانراوە.

پرۆسێسی ئاڵوگۆڕی کارایکردنی نێوان مێژوونووس و راستییەکانی، ئەوەی پێی دەڵێم دایەلۆگی نێوان ئێستاو رابردوو، بریتی نییە لە دایەلۆگی نێوان تاکەکەسەپەتی و دابڕاوەکان، بەڵکو بریتییە لە دایەلۆگی نێوان کۆمەڵگەی ئەمڕۆ و کۆمەڵگەی دوێنێ.

بەگوێرەی وەسفی بورکهاردت مێژوو بریتییە لە، تۆماری ئەوەی سەردەمێک لەسەردەمێکی

دیکەدا بەشایانی تێبینی کردن دەزانێ[٥٩].

تەنها لە ژێر تیشکی ئێستادا دەشێ لە رابردوو تێبگەین؛ هەروەها تەنها لەژێر تیشکی رابردوودا دەتوانین بەتەواوی لە ئێستا تێبگەین.

تواناداركردنی مرۆڤ بۆ تێگەیشتنی لە كۆمەڵگەی رابردووەو زیادكردنی سەردەستەیی مرۆڤ بەسەر كۆمەڵگەی ئێستادا، بریتییە لە ئەركی دوانەیی مێژوو.

## سێیەم

# مێژوو، زانست و ڕەوشت

کاتێک لە هەڕەتی لاوێتی دابووم، زۆر حەزمدەکرد سەرەڕای هەموو دیاردەکان ئەوەش بزانم، کە نەهەنگ ماسی نییە. ئەم پرسانەی پۆلینکردن ئەمڕۆکە کەمتر دەمجوولێنن؛ هەروەها کاتێک دڵنیام لەوەی مێژوو زانستێک نییە زیاد لە پێویست دڵەڕاوکێم بۆ دروست ناکات.

پرسی زاراوەناسی (Terminolgy) ڕەوشێکی نامۆی زمانی ئینگلیزییە.

لە تەواوی زمانە ئەورووپییەکاندا بەبێ دوودڵی مێژوو هاوواتای وشەی، زانستە.

وەلێ ئەم پرسە لە جیهانی قسەکەر بەزمانی ئینگلیزیدا ڕابردوویەکی دووری هەیە، و ئەو پرسانەیش، کە بەهۆی ئەم پرسەوە سەریان هەڵداوە دەروازەیەکی گونجاون بۆ پرسەکانی میتۆد لە مێژوودا.

کاتێک زانست بەشێوەیەکی سەرکەوتوو بەشداری لە هەریەک لە مەعریفەی مرۆڤ دەربارەی جیهان و مەعریفەی مرۆڤ دەربارەی تایبەتمەندییە سروشتییەکانی - دا کرد، لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا پرسیاری ئەوە دەکرا ئایا ناکرێ زانست مەعریفەی زیاتری مرۆڤ بێت دەربارەی کۆمەڵگە.

چەمکی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و لە نێویشیاندا چەمکی مێژوو پەیتا پەیتا لەسەرتاسەری سەدەی نۆزدەهەمدا پەرەی سەند؛ و ئەو میتۆدەیەش، کە زانست جیهانی سروشتی پێ دەتوێژیەوە بەهەمان شێوە بۆ توێژینەوەی کاروبارەکانی مرۆڤیش پراکتیزە دەکرا.

لە دەیەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا تەقلیدی نیوتن بەندوباوبوو.

کۆمەڵگە وەک جیهانی سروشت وەک میکانیزمێک سەیریدەکرا.

ناوونیشانی کارێکی هەربەرت سپینسەر، ستاتیکی کۆمەڵایەتی، کە لە ساڵی ١٨١٥-دا بڵاوبووەوە هێژ لە یاد نەکراوە.

بێتڕاند ڕووسێڵ، کە خۆی لەم تەقلیدەدا پەروەردە بووە، دواتر سەردەمەکە خستەوە یاد کاتێک

هیوای دەخواست لەسەردەمێکدا ئەم چەمکە بێتە کایەوە: بیرکاری ئاکارو ڕەوشتی مرۆڤ بەقەد بیرکاری ئامێرەکان وردو دروستبێ[٦٠].

دواجار داروین شۆڕشێکی زانستی دیکەی هەڵگیرساند؛ و زانا کۆمەڵایەتییەکانیش قسەکانیان لە بایۆلۆجیاوە دەستپێدەکردو کۆمەڵگەشیان وەک شتێکی ئۆرگانی دادەنا وەلێ بایەخی شۆڕشی داروین لەوە دابووە کە ئەوەی پێشتر لایل لە جیۆلۆجیادا دەستی پێیکردبوو، داروین تەواوی کردوو مێژووشی کرد بە زانست.

زانست چیتر گرنگی بەهەنێک شتی ستاتیکی و بێ کات نادات[٦١]، وەلێ گرنگی بەپرۆسێسی گۆڕان و پەرەسەندن دەدات.

هەرچۆنێک بێت شتێکی وا ڕوونادات تێڕوانینی ئیستقرائی ئەو میتۆدە مێژووییە بگۆڕێ، کە لە گەلاڵەنامەی یەکەمدا باسم لێوەیکرد: یەکەم جار ڕاستییەکانت کۆبکەرەوە، دواجار شرۆڤەیان بکە.

ئەمەشیان بەبێ تاووتوێکردن بەمیتۆدی زانست داندراوە. ئەمەش بریتبوو لەو تێڕوانینەی، کە بێری (Bury) بێ پێچ و پەنا لە هزریدا هەبوو، کاتێک لە پاشەکی گەلاڵەنامە دەستپێکییەکەی کانوونی ١٩٠٣-دا مێژوو وەک، زانستێک، نە زیاتر و نەکەمتر وەسفدەکات. ساڵانی دوای گەلاڵەنامە دەسپێکییەکەی بێری دژکارێکی توندیان لە دژی ئەم تێڕوانینەی مێژوو بەخۆوە بینی. کۆڵینگ وود کاتێک لە ١٩٣٠- یەکاندا دەینووسی بەتایبەتی لەوەدا دووڵبوو، کە هێڵێکی تیژ لە نێوان جیهانی سروشت، کە ئامانجی لێکۆڵینەوەی زانستی بوو، هەروەها جیهانی مێژوودا بکێشێت؛ لە ماوەی ئەم سەردەمەشدا جگە لە گاڵتەپێکردن گوتەی بێری بەدەگمەنی وەردەگیرا.

وەلێ ئەوەی مێژوونووسان شکستیان تێیدا هێنا لەوکاتەدا تێبینی بکەن ئەوەبوو خودی مێژوو بەشۆڕشێکی سەختدا تێدەپەڕی، کە هەرچەندە لەبەر هۆکارێکی هەڵە، بەڵام ئەم کارە وای لە بێری کرد زیاتر لەوەی گریمانەکرد لە ڕاستییەوە نزیک بووبێت.

ئەوەی لایل لە پێناو جیۆلۆجی و داروین لە پێناو بایەلۆجی - دا کردیان هەنووکە دەربارەی ئەستێرەناسی-ش دەکرێ، کە بۆتە زانستێک لە بارەی ئەوەی چۆن گەردوون بۆتە ئەوەی ئێستا هەیە، هەروەها سروشتناسەکان بەبەردەوامی پێمان دەڵێن ئەوەی لێی دەکۆڵنەوە ڕاستی نییە، بەڵکو ڕوداوە.

مێژوونووس پاساوی ئەوەی هەیە، کە ئەمڕۆ زیاتر وا هەست بەخۆی دەکات لە جیهانی زانست نزیکتر بێت نەک ئەوەی سەد ساڵێک لەمەوبەر کردوویەتی.

با سەرەتا تیشک بخەینە سەر چەمکی یاساکان، زاناکان لەسەرتاسەری سەدەکانی هەژدەو نۆزدەدا گریمانی ئەوەیاندەکرد، کە یاساکانی سروشت - یاساکانی جوولەی نیوتن و یاساکانی کێشکردن و یاسای بەیل و یاسای پەرەسەندن و هتد - بەشێوەیەکی چەسپاو و ئاشکرا دۆزراونەتەوە، هەروەها گریمانی ئەوەیاندەکرد، کە ئەرکی زانا بەشێوەیەکی سەرەکی دۆزینەوەو چەسپاندنی زیاتری ئەم جۆرە یاسایانە بووە بەهۆی پرۆسێسی ئیستقرائی لە سوونگەی راستییە تێبینیکراوەکانەوە.

واژەی، Law، بەشێوەیەکی بەرفرەو مەزن لە گالیلۆ و نیوتنەوە بەئێمە گەیشتووە.

قوتابیانی کۆمەڵگە بەهۆشەکی بێ یانیش ناهۆشەکی ئارەزوویان لەوەیە پێگەی زانستی توێژینەوەکانیان جەختبکەنەوە ئینجا هەمان زمان هەڵدەبژێرن و خۆشیان باوەڕیان وایە پێویستە هەمان پرۆسیجەر پێڕۆ بکەن.

وا دیارە زانا سیاسییەکان بۆ یەکەم جار بەهۆی یاسای گریشمان و یاسای بازاڕی ئادەم سمیت -ەوە لە بوارەکەدا هەبووبن.

بێرکە پەنای بردە بەر، یاساکانی بازرگانی، کە بریتین لە یاساکانی سروشت و لە دەرئەنجامیدا بریتین لە یاساکانی خودا[٦٢]

مالتووس یاسای دانیشتوانی پێشکەشکرد؛ لاسال- یش یاسای کرێی ئاسنی پێشکەشکرد، هەروەها مارکس لە پێشەکی کتێبی سەرمایەداری - دا بانگەشەی ئەوە دەکات، کە یاسای ئابووری جوولەی کۆمەڵگەی مۆدێرنی، دۆزیوەتەوە.

بەکڵ لە پاشەکی کتێبەکەی، مێژووی شارستانیەت، -دا بەدڵنیاییەوە گوزارشت لەوە دەکات، کە ڕێڕەوی کاروبارەکانی مرۆڤ، بنەمایەکی مەزنی ئاودامانی و نەگۆڕی ڕێکوپێکی پەڕیوەتە سەر.

ئەمڕۆکە ئەم زاراوە ناسییە بەقەد پێشینە گریمانکردنەکە کۆن دەردەکەوێ؛ بەڵام تاڕادەیەک دەهەمبەر زانا سروشتییەکان هەروەک دەهەمبەر زانا کۆمەڵایەتییەکان شێواز کۆن دەردەکەوێ.

ساڵێک بەرلەوەی بێری گەلاڵەنامە دەسپێکیەکەی پێشکەش بکات، بیرکاری ناسی فەرەنسی هنری بوانکارێ کتێبێکی بچووکی بەناوی «زانست و گریمانی La science et hypothese» بلاوکردەوە، کە شۆڕشێکی لە هزری زانستیدا دروستکرد.

تێزی سەرەکی پوانکارێ ئەوەبوو، کە ئەو پێشینیارە گشتییانەی زاناکان رایانگەیاندوون لەهەر کوێیەک بووبن تەنها پێناسەو پەیماننامەی فێلاوی نەبوونە دەربارەی بەکارهێنانی زمان، بەڵکو بریتیبوون لەو گریمانانەی بۆ بلاوکردنەوەو ڕێکخستنی بیرکردنەوەی زیاتر دانراون، هەروەها دەشیا

دووچاری لێکۆڵینەوەو هەموارکردن، یان رەتکردنەوە ببوونایە. هەموو ئەمانەش هەنووکە بوونەتە شتێکی ئاسایی.

گریمانە فیزاوییەکەی نیوتن ئەمڕۆکە قامکە، ئەمووستیلەی پەنجەش نییە؛ هەروەها لەگەڵ ئەوەشدا زاناکان و تەنانەت زانا کۆمەڵایەتییەکان هێژ هەندێک جار، گەر دەستەواژەیەکی راست بێ، لەبەر خاتری سەردەمە کۆنەکان قسە لە بارەی یاساکانەوە دەکەن، کە چیتر باوەڕ بەبوونیان ناکەن بەو مانایەی، کە زاناکانی سەدەی هەژدەو نۆزدە بەگشتی باوەڕیان پێیان هەبوو.

شتێکی زاندراوە زاناکان دۆزینکاری دەکەن و زانیاری نوێ بەدەستدەهێنن، ئەمەش نەک بەهۆی دامەزراندنی یاسا دروست و ئاودامانەکانەوە، بەڵکو بەهۆی ئاشکراکردنی ئەو گریمانانەوەیە، کە رێگەی لێکۆڵینەوەی نوێ دەکەنەوە پەرتووکێکی ستانداردی مەنهەجی دەربارەی میتۆدی زانستی، کە لەلایەن دوو فەیلەسووفی ئەمریکییەوە دانراوە میتۆدی زانست وەک، بازنەیەک لەڕووی جەوهەرەوە، وەسف دەکات: لە پێناو بنەماکاندا بەڵگەکان بەدەستدەهێنن بەپەنا بردنە بەر مەتریاڵە مادییەکان، واتە بەپەنا بردنە بەر راستییەکان ئینجا لەسەر بنچینەی بنەماکان مەتریاڵە ئەزموونییەکان هەڵدەبژێرین و راڤەیاندەکەین و شرۆڤەیاندەکەین[٦٣].

لەوانەیە وشەی، ئاڵوگۆڕ بۆ وشەی، بازنە باش گونجاو بێت، لەبەرئەوەی دەرئەنجامەکە ئەوەیە ناگەڕێتەوە هەمان شوێن، بەڵکو لەمیانەی ئەم پرۆسێسی کارلێک کردنەی نێوان بنەماو راستییەکان و نێوان تیۆرو پراکتیزەوە بەرەو دۆزینەوە نوێکان دەجووڵێت.

هەموو بیرکردنەوەیەک پێویستی بەقبووڵکردنی ئەو پێشینە گریمانکردنە دیاریکراوانەوە هەیە، کە لەسەر بنچینەی تێبینیکردن بنیادنراون، بەشێوەیەک بیرکردنەوەی زانستی دەگونجێن، وەلێ لەژێر تیشکی ئەو بیرکردنەوەیەدا دووچاری پێداچوونەوە دەبن.

لەوانەیە ئەم گریمانانە لە هەندێک پیڤاژووداو لەبەر چەند مەبەستێک زۆر شەرعی بن، هەرچەندە لە پیڤاژووکانی دیکەدا دەبنە شتی ناشەرعی.

تاقیکردنەوەکە لە هەموو حاڵەتەکاندا بریتییە لە تاقیکردنەوەیەکی ئەزموونی، ئینجا ئایا لەراستیدا ئەم گریمانانە لە بەهێزکردنی تێڕوانینە نوێکان و زیادکردنی زانیارییەکانماندا چالاکن یان نا.

بەم دواییانە میتۆدەکانی رووتەر فۆرد لەلایەن یەکێک لە ناسراوترین قوتابییەکانی خۆی و هاوڕێکانییەوە بەم شێوەیە وەسفکراون:

زۆر حەزیدەکرد بزانێ چۆن دیاردە ناوەکییەکان کاردەکەن، بەو مانایەی، کە یەکێک بتوانی قسە

بکات لە بارەی ئەوەی لە چێشتخانەدا روودەدات.

باوەڕ ناکەم ئەو بەدوای روونکردنەوەیەکدا گەڕا بێت، کە لە شێوەی تیۆرێکی کلاسیکیدا بێت و یاسا بنچینەییە دیاریکراوەکان بەکاربهێنێت؛ مادام زانیبێتی ئەوەی روویداوە بەدڵی ئەو بووە[٦٤]

ئەم وەسفە بەهەمان شێوە پڕ بەپێستی ئەو مێژوونووسەیشە، کە لەبەرخاتری یاسا بنچینەییەکان وازی لە توێژینەوە هێناوە، و ئەوەندەی بەسە لە چۆنیەتی کارکردنی شتەکان بکۆڵێتەوە.

پێگەی ئەو گریمانانەی مێژوونووس لە پرۆسێسی لێکۆڵینەوەکەیدا بەکاریهێناون بەشێوەیەکی سەرنج راکێش لە پێگەی ئەو گریمانانە دەچن، کە زانایەک بەکاریاندەهێنێ.

بۆ نموونە تایبەتکردنە نێودارەکەی مارکس ڤێبەر لە بارەی پێوەندییەکی نێوان پرۆتستانتییەتی و سەرمایەداری بەنموونە وەربگرە.

هەنووکە هیچ کەسێک ناتوانێ بەمە بڵێ یاسا، هەرچەندە لەسەردەمێکی زووتردا پێی دەوترا یاسا.

هەرچەندە ئەم جۆرە گریمانانە تاڕادەیەک ڕێڕەوی ئەو لێکۆڵینەوانە دەگۆڕن، کە نیگای دەکا، وەلێ بێگوومان تێگەیشتنمان لە بارەی هەریەک لە دوو جووڵەکەوە فراواندەکەن.

یانیش دەستەواژەیەکی وەک دەستەواژەیەکی مارکس بە نموونە وەربگرە، کە دەڵێ: کارگەی (ئاشی) دەستی کۆمەڵگەیەکی خودان دەربەگمان پێشکەشدەکات؛ کارگەی هەڵمی کۆمەڵگەیەکی خودان سەرمایەیەکی پیشەسازیمان دەداتێ[٦٥].

هەرچەندە لەوانەیە مارکس وەک یاسا چاوەڕاوی بۆ بکات، وەلێ لە زاراوەناسی مۆدێرندا ئەمە بە یاسا دانانرێت، بەڵکو گریمانێکی بەرهمدارە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی زیاترو تێگەیشتنی نوێ دەکاتەوە.

ئەم جۆرە گریمانانە ئامێری سەر بیرکردنەوەن. ئابووریناسی بەنێوبانگی ئەڵمانی ڤێرنەر سومبارت لە دەسپێکی ١٩٠٠-ەکاندا دانی بەوە داناوە، کە ئەوانەی وازیان لە مارکسیزم هێناوە، هەستکردنێکی دڕدۆنگیان هەیە.

(ئەو نووسیویەتی) کاتێک ئەو شێوە دڵنەواکەرانە لە دەستدەدەین، کە تائێستا لە نێوەندی ئاڵۆزییەکانی بوونگەدا ڕێنماییکەرمانبوونە... هەست بەوە دەکەین هەروەک بڵێی لە دەریایی ڕاستییەکاندا نقوومدەبین تاوەکو پێگرێک دەدۆزینەوە یانیش فێرە مەلەکردن دەبین[٦٦].

مشت و مڕ دەربارەی سەردەم دابەشکردن لە مێژوودا دەکەوێتە ڕیزی ئەم کاتیگۆریەوە.

دابەشکردنی مێژوو بۆ چەند سەردەمێک راستییەک نییە، بەڵکو گریمانێکی پێداویستە یانیش ئامرازێکی بیرکردنەوەیە، ئەم دابەشکردنە بەقەد روونکردنەوەی شتەکان کارایەو سەبارەت بەکاراییەکەشی وابەستەی راڤەکردن دەبێت.

ئەو مێژوونووسانەی دەربارەی ئەو پرسە کۆک نین، کە چ کاتێک سەردەمەکانی ناوەڕاست بەکۆتا هاتوون ئەوا لە راڤەکردنی رووداوە دیاریکراوەکانیشیاندا کۆک نین.

پرسەکە بریتی نییە لە پرسی راستییەک؛ بەڵکو پرسەکە هەروەها بێ مانا نییە.

بەهەمان شێوە دابەشکردنی مێژوو بۆ یەکەی جوگرافیایی راستییەک نییە، بەڵکو بریتییە لە گریمانێک: لەوانەیە قسەکردن لە بارەی مێژووی ئەوروپا لە هەندێک پەیڤاژوو گریمانێکی بەرهەمدارو راستەقینە بێت و لە هەندێکی تریاندا فریودەروو زیان بەخش بێت.

زۆربەی مێژوونووسەکان ئەوە گریماندەکەن، کە رووسیا بەشێکە لە ئەوروپا، هەندێکیشیان بەتوندی نەرێی ئەوە دەکەن.

دەتوانرێ ئەو گریمانانەی مێژوونووس هەڵیاندەبژێرێ بڕیار لەسەر نەزعەکانی بدەن.

پێویستە راگەیاندنێکی گشتی دەربارەی میتۆدی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەنموونە وەربگرم، چونکە لە قسەی ئەو زانا گەورە کۆمەڵایەتیەوە سەرچاوە دەگرێ، کە وەک زانایەکی فیزیکی پەروەردەبووبوو.

جۆرج سۆرڵ بەرلەوەی لە چلەکانی تەمەنیدا دەربارەی پرسە کۆمەڵایەتییەکان بنووسێ وەک ئەندازیارێک کاریدەکرد و داکۆکی لەسەر پێداویستی دابڕینی سروشتە تایبەتییەکان لە رەوشتێکدا دەکرد تەنانەت لە حاڵەتی مەترسی ئاسانکردنی زۆریشدا:

(ئەو نووسیویەتی) پێویستە مرۆڤ لە میانەی هەستکردن بەرێگەی کەسێکی ترەوە بڕوا؛ پێویستە مرۆڤ گریمانە ئەگەر و کەرتەکییەکان تاقیبکاتەوە و هەمیشە بە نزیک کردنەوە کاتیەکان قایل بێت تاوەکو دەرگا لەسەر پشت بەجێ بهێڵێ بۆ راستکردنەوەکانی دواتر(٦٧).

ئەمەش زۆر لەسەدەی نۆزدەوە دوورە کاتێک مێژوونووس و زانایانی وەک ئاکتن بۆ رۆژێکیش بووایە لە میانەی کەڵەکەبوونی راستییە بەبەڵگە سەلمێندراوەکانەوە بەپیر دامەزراندنی جەستەیەکی ئاودامانی ئەو زانیاریانەوە دەچوون، کە تەواوی پرسە کێشمەکێشم لە سەرەکانی بۆ هەمیشە دادەمرکاند.

ئەمەش زۆر لە سەدەی نۆزدەهەمەوە دوورە، کاتێک زاناو مێژوونووسانی چەشنی ئاکتن تەنانەت بۆ رۆژێکیش بوایە لە میانەی کەڵەکەبوونی راستییە بەڵگەدارەکانەوە بەدوای ئەوەدا دەگەڕان

جەستەیەکی ئاودامانی مەعریفە دامەزرێنن، کە تەواوی دۆزە کێشمە لە سەرەکان ساتێک بۆ هەمیشە چارەسەر بکات.

ئەمڕۆکە هەریەک لە مێژوونووسان و زانایان هیوای مام ناوەندیتری پەرەسەندنی پەیتا پەیتا لە گریمانێکی پارچەپارچەوە بۆ گریمانێکی دیکە بەهیواوە شرۆڤە دەکەن، راستییەکانیان لە میانەی نێوەندی شرۆڤەکانیانەوە دادەبڕن، هەروەها شرۆڤەکانیشیان بەهۆی راستییەکانەوە تاقیدەکەنەوە؛ ئەو ڕێگایانەیش، کە ئەوان هاتووچۆیان پێدا دەکەن لای من جیاوازییەکی جەوهەرییان نییە.

لە گەلاڵەنامەی یەکەمدا ئەو سەرنجەی پرۆفیسۆر باراکلۆ-م وەرگرت، کە مێژو و بەهیچ شێوەیەک راستی نەبووە، بەڵکو زنجیرەیەک راستی قبوولکراوە.

لە کاتێکدا ئەم گەلاڵەنامانەم ئامادە دەکرد زانایەکی فیزیکی لەم زانکۆیە، لە پەخشێکی کەناڵی BBC-دا راستی زانستی وەک، بەیانێک وەسفکرد، کە بەئاشکرایی لەلایەن پسپۆڕەکانەوە قبوولکراوە،(٦٨)

هیچ یەکێک لەم شێوازانە بەتەواوی قایلکەر نییە- بە هۆی ئەو هۆکارانەوە، کە رەنگە کاتێک دێمە سەر پرسی بابەتگەراییەوە دەربکەون.

وەلێ جێگای سەرنجە، کە مێژوونووسێک و زانایەکی فیزیکی بەشێوەیەکی سەربەخۆ هەمان پرس تاڕادەیەک بەکتومتی بەهەمان وشە ڕێک بخەن.

هەرچۆنێک بێت لەیەک چوونەکان تەڵەیەکی بەدناون بۆ کەسێکی بێ ئاگا: لەبەر ئەوە دەمەوێ بەڕێزەوە گفتوگۆکان دەهەنبەر باوەڕکردن بەوە بتوێژمەوە، کە سەرەڕای جیاوازی زۆری نێوان زانستی بیرکاری و سروشتی، یان لە نێوان زانستە جیاوازەکانی نێو ئەم پۆلانەدا، دەتوانرێ جیاکردنەوەیەکی سەرەکی لە نێوان ئەم زانستانەو مێژوودا بکرێ، ئەم جیاکردنەوەیەش نێوبردنی مێژوو - لەوانەیە زانستە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەش بەزانست بکاتە شتێکی تەفرەدەر.

ئەم گازەندانەش - کە هەندێکیان لە هەندێکی تر قایلکەرترن - بەکورتی بریتین لە:(١) مێژوو بەشێوەیەکی پاوانکراو لە شتی ناوازە دەکۆڵێتەوە، زانست لە شتی گشتی دەکۆڵێتەوە؛(٢) مێژوو هیچ وانەیەک فێرنکات؛(٣) مێژوو توانای نییە بەربینی بکات؛(٤) مێژوو وەک پێویست خودیە، چونکە مرۆڤ خۆی سەرنج لە خۆی دەدات؛ هەروەها(٥) مێژوو بەپێچەوانەی زانست دەگلێتە نێو پرسەکانی ئاین و ئەخلاقەوە. هەوڵدەدەم هەریەک لەم خاڵانە یەک بەیەک تاقیبکەمەوە.

یەکەم، ئەوەی دەڵێ مێژوو لە شتی ناوازە و تایبەتی دەکۆڵێتەوە و زانست لە شتی گشتی و

ئاودامانی دەکۆڵێتەوە.

لەوانەیە بگوترێ ئەم تێڕوانینە لەگەڵ ئەرستۆدا دەستپێدەکات، کاتێک ئاشکرایکرد، کە هەڵبەست لە مێژوو فەلسەفی ترو جدیترە، چونکە هەڵبەست بایەخ بەراستییەکی گشتی داهات و مێژووش بایەخ بەراستییەکی تایبەتی دەدات[٦٩].

کۆمەڵێک نووسەری دواتر تا دەگاتە کۆڵینگ وود[٧٠] هەمان جیاکردنەوەیان لە نێوان زانست و مێژوودا ئەنجامدا.

وادیارە ئەمەش وابەستەی خراپ لە یەکتر گەیشتنە. وتە بەناوبانگەکەی هۆبز هێژ ماوە، کە دەڵێ: جگە لە ناوەکان هیچ شتێک لە جیهاندا ئاودامانی نییە، چونکە شتە نێونراوەکان هەریەکێکیان تاک و تەنهایە[٧١].

بێگومان ئەمەش راستی زانستە فیزیکییەکانە کە نەدوو پێکهاتەی جیۆلۆجی و، نە دوو ئاژەڵی هەمان جۆر، دوو گەردیلە هاوڕێکدەبن.

بە هەمان شێوە دوو رووداوی مێژوویش هاوڕێک نابن. وەلێ رشتبوون لەسەر ئاوازەیی رووداوە مێژووییەکان هەمان کاریگەری ئیفلیج بوونی هەیە، کە ئەو وتە بێ هودەیە هەیەتی کەمۆر لە قەشە بەتلەر وەربگرێ و بەتایبەتیش سەردەمێک لەلای فەیلەسوفە زمانەوانییەکان بایەخێکی زۆری هەبوو: هەموو شتێک بریتییە لەوەی ئەوەیە و شتێکی تر نییە.

گەر لەسەر ئەم رێگایە رۆیشتی، ئەوا بەخێرایی دەگەیتە جۆرێک نێرڤانای فەلسەفی، کە ناتوانی هیچ شتێکی گرنگ لە بارەی هەرشتێکەوە بڵێی.

بەکارهێنانی زمان بەچەشنی زانا مێژوونووسیش وابەستەی گشتاندن دەکات.

جەنگی پیلۆپۆنیز و جەنگی جیهانی دووەم زۆر لە یەکتری جیاوازبوون، و هەردووکیشیان ناوازەبوون.

وەلێ مێژوونووس هەردووکیان بەجەنگ نێو دەبات، و تەنها خوێنەری بەئاگاش دەتوانێ نارەزایی لەسەر ئەوە دەربڕێ. کاتێک گیبن لە بارەی دامەزراندنی مەسیحیەت لەلایەن کۆنستەنتین و سەرهەڵدانی ئیسلام وەک شۆڕش - ی نووسی[٧٢]. هەردووکیانی وەک دوو رووداوی ناوازە گشتاند مێژوونووسی هاوچەرخ هەمان شت دەکات کاتێک لە بارەی شۆڕشەکانی ئینگلیزی و فەرەنسی و رووسی و چینی دەنووسن. لە راستیا مێژوونووس ئارەزووی لە ناوازەیی نییە، وەلێ ئارەزووی لەوەیە، کە بریتییە لە شتی گشتی نێو ناوازەیی. ئەو گفتوگۆیانەی مێژوونووسان لە بارەی هۆکارەکانی جەنگی ١٩١٤-ەوە ئەنجامیاندەدان هەمیشە لەو گریمانەوە

سەریان هەڵدەدا، کە ئەم جەنگە یا ئەوەتا بەهۆی خراپ بەڕێوەبردنی دیبلۆماتەکانەوە بووە کە نهێنی و دوور لە چاودێری رای گشتی کاریاندەکرد، یان بەهۆی بەدبەختی دابەشکردنی جیهان بوو بۆ دەوڵەتانی سەربەخۆیی ناوچەیی.

لە ١٩٣٠-یەکانیشدا گفتووگۆکان لەو گریمانەوە سەرچاوەیان گرتبوو، کە جەنگەکە بەهۆی رکەبەری نێوان هێزە ئیمپریالییەکانەوە بووبەهۆی فشارەکانی سەرمایەدارییەوە تاوەکو جیهان لە نێوان خۆیاندا دابەش بکەن.

هەموو ئەم گفتوگۆیانەش گشتاندنیان لە بارەی هۆکارەکانی جەنگەوە لە خۆ دەگرت، یان بەهەرحاڵ لە بارەی جەنگەوە بوون لە هەلومەرجییەکانی سەدەی بیستەمدا مێژوونووس هەمیشە گشتاندن بۆ تافیکردنەوەی بەڵگەکانی بەکاردەهێنێ.

گەر بەڵگەکە روون نەبێ ئاخۆ ریچارد شازادەکانی لە کەلوەکەدا کوشتووە، مێژوونووس لە خۆی دەپرسێت - رەنگە زیاتر ناهۆشەکی بێت نەک هۆشەکی - ئایا ئەم کوشتنە نەریتی فەرمانڕەوایانی سەردەمەکە بووە بۆ نەهێشتنی رکەبەرە شاراوەکانی عەرشی خۆیان یان نا؛ بڕیارەکەشی بەڕاستی بەهۆی ئەم گشتاندنەوە کاریگەر دەبێ.

خوێنەرو نووسەری مێژوو گشتێنەرێکی درێژخایەنەو تێبینی مێژوونووس بەسەر ئەو پەیڤاژوو مێژووییانەی دیکەدا جێی بەجێ دەکات، لەگەڵیان راهاتووە - یان لەوانەیە بەسەر سەردەمەکەی خۆیدا جێ بەجێ بکات.

کاتێک کتێبەکەی کارلیلم دەخوێندەوە بەناوی، شۆڕشی فەرەنسا، چەندین جار پێم وابوو گشتاندنی شرۆڤەکانی بەهۆی جێبەجێکردنیان لەسەر سەرنجی تایبەتی خۆم لە کتێبی شۆڕشی رووسیادا ئەنجامبدەم.

بۆ نموونە ئەم وتەیە لەسەر تیرۆر وەربگرە:

مەترسی لەو ولاتانەدا، کە دادپەروەری یەکسانییان تێدا ناسراوە - زۆر نائاسایی نییە لەو ولاتانەدا هەرگیز ئەوە نەناسرابێت.

یان گرنگتر ئەمەی لای خوارەوەیە:

هەرچەندە شتێکی ئاساییە، بەڵام لە بەدبەختییە، کە مێژووی ئەم سەردەمە بەگشتی هیستریا نووسراوە.

زێدەڕۆیی و نەفرەت و سکاڵا باوە؛ هەروەها تاریک گەرایی بەگشتی باوە[٧٣].

یان ئەم جارە بڕگەیەکی دیکە لە بورکهاردت وەردەگرین دەربارەی گەشەکردنی دەوڵەتی مۆدێرن

له سەدەی شانزدەهەمدا: زۆر بەم دواییانە دەسەلات دروستبووە، کەمتر دەتوانی بەئۆقرە گرتوویی بمێنیتەوە- یەکەم لەبەرئەوەی ئەوانەی دەستەلاتیان دروستکردووە لەگەڵ بزووتنەوەی خێرادا راهاتوون هەروەها لەبەرئەوەی داهێنەرن بەداهێنەریش دەمێننەوە، دووەم لەبەرئەوە، ئەو هێزانەی لەلایەن ئەوانەوە سەرهەڵدەدەن و ملکەچ دەکرێن دەتوانرێ تەنها لەمیانەی کردە توندوتیژەکانەوە بخرێنەگەڕ(٧٤).

شتێکی بێ مانایە بوترێ گشتاندن بەمێژوو نامۆیە؛ مێژوو بەهۆی گشتاندنەکانەوە گەشە دەکات.

هەروەک مستەر ئیلتۆن بەشێوەیەکی پەتی لەبەرگێکی مێژووی مۆدێرنی کێمبرجدا نووسیویەتی کە: ئەوەی مێژوونووس لە کۆکەرەوەی راستییە مێژووییەکان جیادەکاتەوە بریتییە لە گشتاندن(٧٥).

هەروەها ئەوەشی وتووە کە هەمان شت زانای سروشتی لە سروشتناسی یان کۆکەرەوەی جۆرەکان جیادەکاتەوە. وەلێ گریمانی ئەوە ناکات، کە گشتاندن بوارماندەدات وێنەیەکی روونکاری لە بارەی مێژووەوە دروستبکەین، کە پێویستە رووداوە تایبەتییەکانی تێدا بگونجێندرێن.

لەبەرئەوەی مارکس یەکێکە لەوانەی بەزۆری دروستکردن، یان بەم جۆرە وێنە روونکاریانە تۆمەتبار دەکات، من بڕگەیەک لە یەکێک لە نامەکانی وەردەگرم، کە پرسەکە بە تێڕوانینێکی راستەقینەدا دادەنێ:

رووداوەکان بەشێوەیەکی سەرنج راکێش وەک یەکن، وەلێ لە دەوروبەرێکی مێژوویی جیاوازدا روودەدەن، کە دەبێتە هۆی ئەوەی بەتەواوی دەرئەنجامی جیاوازیان هەبێت.

لەمیانەی توێژینەوەی هەریەک لەم پەرەسەندنانە بەجیاو دواجار بەراوردکردنیان، دۆزینەوەی کلیلی تێگەیشتنی ئەم دیاردەیە ئاسان دەبێ، بەڵام هەرگیز گونجاو نییە بەهۆی بەکارهێنانی کلیلی گشتی تیۆرێکی فەلسەفی- مێژووییەوە بگەینە ئەم تێگەیشتنە، کە کاریگەری گەورەیان لەسەر مێژوو دەمێنێتەوە(٧٦).

مێژوو بایەخ دەدات بەپەیوەندی نێوان ئاوازەیی و گشتی، تۆش وەک مێژوونووسێک ناتوانی زیاتر لە یەکتریان جیا بکەیتەوە، یان یەکێکیان پێش ئەوەی تریان بخەیت، بەڵکو زیاتر دەتوانی راستی و شرۆڤەکان لە یەکتری جیا بکەیتەوە.

لەوانەیە جێگای خۆی بێت تێبینییەکی کورت لە بارەی پەیوەندییەکانی نێوان مێژوو - و کۆمەڵناسی بخەینەڕوو. کۆمەڵناسی لەم ساتەدا رووبەڕووی دوو مەترسی دژیەک دەبێتەوە -

مەترسی بوون بەئەوپەڕی تیۆری و مەترسی بوون بە ئەوپەڕی ئەزموونی.

مەترسی یەکەمیان خۆ لە دەستدانە لە گشتاندنێکی رووت و بێماناد ا بەشێوەیەکی گشتی دەربارەی کۆمەڵگە.

کۆمەڵگە (Society) بە (S) گەورە بەقەد مێژوو بە (H) گەورە هەڵەیەکی فریودەرە.

ئەم مەترسییە لەلایەن ئەوانەوە نزیکتر دەخرێتەوە، کە ئەرکێکی تایبەتی گشتاندن بۆ کۆمەڵناسی دیاریدەکەن لە سوونگەی ئەو رووداوە ناوازانەوە، کە مێژوو تۆماریکردوون: تەنانەت پێشنیاری ئەوەش دەکرێ، کۆمەڵناسی بەوە لە مێژوو جیادەکرێتەوە، کە خودان یاسایە[٧٧].

مەترسییەکەی تریان بریتییە لەوەی کارل مانهایم نزیکەی سەدەیەک بەر لە ئێستا لە بارەی کۆمەڵناسییەوە بەربینی کرد و ئێستاش زۆر بەند و باوە، کە بریتییە لە بەش بەشیکردنی کۆمەڵناسی بۆ زنجیرەیەک دۆزی تەکنیکی بەیەکەوە نەبەستراوی دووبارە سازکردنەوەی کۆمەڵگە.[٧٨]

کۆمەڵناسی بایەخ دەدات بەکۆمەڵگە مێژووییەکان، کە هەر یەکەیان تەنهایە و لە میانەی پێشینە و هەلومەرجە تایبەتییە مێژووییەکانەوە لە قاڵبدراوە.

وەلێ هەوڵدان بۆ یاساغکردنی گشتاندن و شرۆڤەکردن بەهۆی پەیوەستکردنی یەکێکەوە بەوەی پێی دەگوترێ دۆزە تەکنیکییەکانی ژماردن و راڤەکردن، تەنها بۆ ئەوەیە ببێتە پارێزگارێکی ناهۆشیاری کۆمەڵگەیەکی ستاتیک. کۆمەڵناسی، گەر بۆ ئەوەبێ ببێتە کایەیەکی بەرهەمداری توێژینەوە، پێویستە وەک مێژوو بایەخی خۆی بدات بە پەیوەندی نێوان تاک و گشتی.

وەلێ هەروەها پێویستە ببێتە داینامیکێک نەک توێژینەوەی کۆمەڵگەیەکی خەوتوو (کە ئەم چەشنە کۆمەڵگایانە بوونیان نییە) بەڵکو توێژینەوەی گۆڕان و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی پێویستە.

ئەوەی پەیوەندبێت بەشتەکانی دیکەوە تەنها ئەوە دەڵێم، کە هەرچەند مێژوو کۆمەڵناسی تر بێت، و کۆمەڵناسی مێژوویتر بێت، ئەوا بۆ هەردووکیان باشترە.

با سنوری نێوانیان بەکراوەیی بمێنێتەوە لە پێناو هاتوچۆی رێگای هەردووکیاندا.

پرسی گشتاندن پەیوەندییەکی زۆر نزیکی بەپرسی دووهەمەوە هەیە: کە بریتییە لە وانەکانی مێژوو.

خاڵی راستەقینە دەربارەی گشتاندن بریتییە لەو خاڵەی، کە لە میانەیەوە هەوڵدەدەین لە مێژوو فێربین، تاوەکو وانەی وەرگیراو لە کۆمەڵێک رووداو بۆ کۆمەڵێکی دیکەی رووداوەکان بەکردار ئەنجامبدەین: کاتێک گشتاندن ئەنجامدەدەین بەشێوەیەکی هۆشەکی بێت یانیش ناهۆشەکی

هەوڵدەدەین ئەمە بکەین.

ئەوانەی گشتاندن ڕەتدەکەنەوەو ڕشتدەبن، کە مێژوو بەشێوەیەکی پاوەنکراو بەتاکەوە پەیوەندە، بەشێوەیەکی تەواو لۆژیکی، ئەوانە ئەو کەسانەی ئەوە ڕەتدەکەنەوە، کە ناتوانرێ هیچ شتێک لە مێژوو فێر ببین.

وەلێ جەختکردن لەسەر ئەوەی، کە مرۆڤ هیچ لە مێژوو فێرنابێ بەهۆی ژمارەیەکی زۆر ڕاستی تێبینیکراوەوە ئەم گوتەیە پێچەوانە دەبێتەوە.

هیچ ئەزموونێک لەوە بەندوباوتر نییە.

لە ساڵی ١٩١٩ وەک ئەندامێکی پایە نزمی شاندی بەریتانی لە کۆنفرانسی ئاشتی لە پارس ئامادەبووم.

هەموو ئەندامانی شاندەکە باوەڕیان وابوو، کە توانیوومانە کۆمەڵێک وانە لە کۆنگرەی ڤییەنا فێربین ئەو کۆنگرەیە دوا کۆنگرەی گەورەی ئاشتی ئەورووپی بوو سەد ساڵێک پێشتر.

کاپتن ویبستەر، دواجار لە وەزارەتی جەنگدا کاریکرد، ئێستا ناوی کارلس ویبستەرەو مێژوونووسێکی بەرچاوە، وتارێکی نووسیوە و پێمان دەڵێ ئەو وانانە چی بوونە. دوانیانم لە بیرماوە.

لە یەکێکیان مەترسیداربوو کاتێ دووبارە نەخشەکێشانەوەی ئەورووپا بۆ لەیادکردنی پرەنسیپی خۆ بەڕێوەبردن.

وانەی دووەمیشیان هەر مەترسیداربوو، کە بەڵگەنامە شاراوەکان خرانە نێو سەبەتەی پەڕە کاغەزی فڕێدراوەوە نێوەڕۆکەکەشی بەدڵنیاییەوە لەلایەن سیخوڕەکانی هەندێک شاندی دیکەوە دەکڕدرا.

ئەم وانانەی مێژوو لە ئاستی ئینجیل دان و کاریشیان لە هەڵسوکەوتمان کردووە.

ئەم نموونەیە تازە و بێ هوودەیە.

وەلێ ئاسانە لە مێژووییەکی لەچاو کۆندا کاریگەری وانەکانی ڕابردوویەکی هێژ دوورتر بەرهەستبکەین.. هەموو کەسێک دەربارەی کاریگەری یۆنانی کۆن لەسەر ڕۆمان دەزانێ. بەڵام دڵنیانیم ئایا هیچ مێژوونووسێک هەوڵی داوە شیکردنەوەیەکی دروست دەربارەی ئەو وانانە بکات، کە ڕۆمانییەکان لە مێژووی هیلینستەکانەوە فێری بوونە، یان خۆیان باوەڕیان وابوو فێری بوونە.

تاقیکردنەوەی ئەم وانانە لە ئەورووپای ڕۆژئاوا لە سەدەکانی حەڤدە و هەژدە و نۆزدەدا لە

مێژووی تەورات وەرگیراوە و لەوانەیە پاداشتی دەرئەنجامەکان ببەخشێ.

ناتوانین بەبێ ئەم تاقیکردنەوەیە بەتەواوی لە شۆڕشی پیوریتانی ئینگلیزی تێبگەین، هەروەها چەمکی گەلی هەڵبژاردە (شعب المختار) هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ سەرهەڵدانی ناسۆنالیزمی هاوچەرخ.

لایەنی پەروەردەی کلاسیکی لەسەدەی نۆزدەهەمدا زۆر بە توندی کاریگەری خۆی لەسەر چینی فەرمانڕەوا لە بەریتانیای گەورەدا بەجێهێشت.

هەروەک پێشتر باسمکرد، گرۆتە وەک نموونەیەکی دیموکراتی نوێ ئاماژەی بەئەتینا داوە؛ هەروەها پێویستە توێژینەوەیەکی فراوان و وانە گرنگەکان بەشێوەیەکی هۆشیارانە یانیش ناهۆشیارانە بێت بهێنمە بەرچاو، کە لە مێژوو ئیمپراتۆریەتی رۆمانەوە بۆ بنیادنەرانی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی گوێزرانەوە.

لە بواری تایبەتی خۆمدا، بەرپاکەرانی شۆڕشی رووسی بەشێوەیەکی قووڵ - تەنانەت دەتوانرا تارادەیەک بگوترێ، دڕدۆنگ بووبوون - بەهۆی وانەکانی شۆڕشی فەڕەنساوە کاریان تێکرابوو، لە نموونەی شۆڕشەکانی ١٨٤٨، و شۆڕشی کۆمیونی پاریس لە ١٨٧١-دا

وەلێ لێرەدا دووبارە ئەو توانستەکییە دەهێنمەوەیاد کە تایبەتمەندی دوولایەنەی مێژوو سەپاندوویەتی.

فێربوون لە مێژوو هەرگیز کردەیەی تاک رێگەی ئاسان نییە.

فێربوون دەربارەی هەنووکە لەژێر تیشکی رابردوودا مانای فێربوونە دەربارەی رابردوو لە ژێر تیشکی هەنووکەدا.

ئەرکی مێژوو بۆ تێگەیشتنێکی قووڵترە لە بارەی هەریەک لە رابردوو- و ئێستا لەمیانەی پەیوەندی ئاڵوگۆڕی نێوانیان. خاڵی سێیەمم بریتییە لە رۆڵی بەربینکردن لە مێژوودا:

هەندێک کەس دەڵێن ناتوانرێ هیچ دەرسێک لە مێژوو فێربین، چونکە مێژوو بەپێچەوانەی زانست ناتوانێ بەربینی داهاتوو بکات.

ئەم پرسە بەتیشووی خراپ لە یەکتر گەیشتن دەوردراوە. هەروەک بینیمان زاناکان هیچیتر ئەوەندە بەپەرۆشەوە نابن لەبارەی یاساکانی سروشتەوە بدوێن. ئەوەی پێی دەوترێ یاسای زانستەکان کاردەکاتە سەر ژیانی ئاساییمان و لە راستیدا بریتییە لە روونکاری ئامانجەکان و، روونکاری لە بارەی شتە یەکسانەکانی دیکەی روودەدەن یانیش لە هەلومەرجەکانی تاقیگەدا روودەدەن.

ئەوانە بانگەشەی بەربینی کردنی پێشوەخت ناکەن لە رەوشە کۆنکرێتەکاندا چی روودەدات.

یاسای کێشکردن ئەوە ناسەلمێنێ، کە ئەو سێوە تایبەتییە دەکەوێتە سەر زەوی: هەندێک کەس لەوانەیە ئەو سێوە لە سەبەتەیەکدا بگرنەوە.

یاسای بینایی، کە دەڵێ رووناکی بەهێڵێکی راستدا دەڕوات ئەوە ناسەلمێنێ تیشکێکی تایبەتی بەهۆی ئەو بارستەیەی دەکەوێتە بەردەمییەوە تووشی شکانەوە یانیش پەرتبوون نابێت.

وەلێ ئەمە مانای ئەوە نییە، کە ئەم یاسایانە بێ سوودن، یان بنەمایەکی شەرعیان نییە.

دەڵێین تیۆرە فیزیکییە هاوچەرخەکان تەنها لە ئەگەری ئەو رووداوانەوە دەکۆڵنەوە، کە روودەدەن.

لەم سەردەمەدا زانست زیاتر ئارەزووی لەوەیە ئەوە بێنێتەوە یاد، کە ئیستیقرا بەشێوەیەکی لۆژیکی تەنها دەبێتە هۆی ئەگەرەکان، یان باوەڕێکی ئاوەزگەرایی، و ئەمەشیان گوماناویترە روونکارییەکانی وەک یاساگەلێکی گشتی یانیش وەک رێنماییەک سەودا بکات، شەرعییەتەکەشی تەنها لە کردەیەکی تایبەتیدا دەتوانرێ تاقیبکرێتەوە. بەگوێرەی وتەی کۆمتە، زانست دەرئەنجامی بەربینییەو بەربینیش دەرئەنجامی کردارە(٧٩).

کلیلی پرسی بەربینیکردن لە مێژوودا لەم جیاکردنەوەی نێوان گشتی و تایبەتی، و سەرلەبەری و ناوازەدا خۆی دەنوێنێت.

هەروەها بینیمان مێژوونووس ناچارە کاری گشتاندن ئەنجامبدات؛ بەم کارەشی ئەو رێنماییانە بەکردەی داهاتوو دەبەخشێت، کە سەرەڕای ئەوەی بەربینی کردنی تایبەت نین، شەرعی و سوودمەندیشن.

وەلێ ناتوانێ بەربینی رووداوە تایبەتییەکان بکات، چونکە شتی تایبەتی ناوازەیەو لەبەرئەوەیش سروشتی رێکەوت دەچێتە نێویەوە.

ئەم جیاکردنەوەیە، کە فەیلەسووفەکان، دەخاتە گومانەوە، سەد دەرسەد دەهەنبەر خەڵکی رەشۆکی روون و ئاشکرایە.

گەر بێتو دوو تا سێ منداڵ لە قوتابخانەیەکدا تووشی سوورێژە بن، ئەوا دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی، کە بەتاک بڵاودەبێتەوە؛ ئەم بەربینی کردنەش، گەر بتەوێ بەم شێوەیە ناوزەدی بکەیت، ئەوا لەسەر بنەمای گشتاندنێک بنیادنراوە، کە لە ئەزموونی رابردووەوە سەرچاوە دەگرێت و دەهەنبەر کردەکەش رێنماییەکی شەرعی و بەسوودە.

وەلێ ناتوانی بەربینی کردنێکی تایبەتی ئەنجامبدەی، بەشێوەیەکی بڵێی کارلس یان ماری

تووشی سورێژە دەبن.

مێژوونووسیش بەهەمان شێوە کاردەکات. خەڵکی چاوەڕوانی ئەوە لە مێژوونووس ناکەن تا بەرینی بکات کە مانگی داهاتوو لە روریتانیادا جەنگ روودەدات. ئەو جۆرە دەرئەنجامەی ئەوان بەدوایدا دەگەڕێن تاڕادەیەک لە مەعریفەی تایبەت بەکاروباری روریتانیاو تاڕادەیەک لە توێژینەوەیەکی مێژووەوە هەڵی بهێنجن، بریتیە لەو جۆرەی: هەلومەرجەکان لە روریتانیادا بەو شێوەیە، کە لەوانەیە شۆڕشێک لە داهاتوویەکی نزیکدا روو بدات، گەر کەسێک هاڵیبگیرسێنێت، یان مەگەر کەسێک لەلایەن دەوڵەتەوە هەوڵێک بدات شۆڕشەکە بوەستێنێ، ئەم دەرئەنجامەش دەکرێ مەزەندەکردنی ئەو هەڵوێستەی لەگەڵدابێ، کە رێکەوتە جیاوازەکانی میللەت چاوەڕوانی ئەوەی لێدەکەن بیگرنە بەر، ئەو هەڵسەنگاندنانەش تاڕادەیەک لەسەر بنەمای لەیەکچوونی شۆڕشەکانی تر دامەزراون.

بەربینی کردنەکە، گەر بتوانرێ ئا بەم شێوەیە نێوبنرێ، تەنها دەتوانی لەمیانەی رووداني ئەو بوویەرە ناوازانەوە لێکۆڵینەوە بکات، کە خۆیان ناتوانرێ بەربینبکرێن.

وەلێ ئەمە مانای ئەوە نییە، ئەو دەرئەنجامانەی دەربارەی داهاتوو لە مێژووەوە وەرگیراون بێ سوودن، یانیش مانای ئەوەبێ، کە شەرعییەتێکی مەرجداریان نییە، کەچ وەک رێنماییەکی کردەکەو چ وەک کلیلێک بۆ تێگەیشتنمان لەوەی چۆن شتەکان روودەدەن، بەکاردەهێنرێت.

نامەوێ ئەوە پێنشیار کەم، کە دەرئەنجامەکانی زانای کۆمەڵایەتی یانیش مێژوونووس دەتوانن لەڕووی دروستییەوە پێشبرکێی دەرئەنجامەکانی زانای فیزیکی بکەن، یان ئاست نزمیان لەم رووەوە تەنها بەهۆی دواکەوتوویەکی گەورەتری زانستە کۆمەڵایەتییەکانەوە بێت.

لەهەر روانگەیەکەوە بێت مرۆڤ ئاڵۆزترین بوونەوەری سروشتییە، رەنگە توێژینەوەی ئاکارەکانیشی کۆمەڵێک ئاستەنگ بگرێتەوە، کە لەڕووی چەشنەوە لەو ئاستەنگانە جیاوازن، کە رووبەڕووی زانای فیزیکی دەبنەوە.

ئەوەی دەمەوێ بیسەلمێنم ئەوەیە، کە بەشێوەیەکی سەرەکی ئامانج و میتۆدەکانیان لە یەکتری جیاواز نین خاڵی چوارەمم گفتوگۆیەکی قایلکەرتر دەهەنبەر کێشانی هێڵێکی جیاکردنەوە لە نێوان زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە نێویشیاندا مێژوو، زانستە فیزیکییەکان فەراهەمدەکات ئەمەش بریتییە لەو گفتوگۆیەی، کە خود و بابەت لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا دەچنە ریزی هەمان پۆل بەشێوەیەکی ئاڵوگۆڕ هەریەکێکیان کار لەوەی تریان دەکات.

مرۆڤەکان نەک تەنها ئاڵۆزتر و گۆڕاوترین بوونەوەری سروشتین، بەڵکو پێویستە لەلایەن

مرۆڤەکانی دیکەوە بتوێژرێنەوە، نەک لەلایەن چاودێرە سەربەخۆکانی جۆری دیکەوە.

لێرەدا مرۆڤ چیتر ئەوەندەی بەس نییە، کە پێکهاتەی جەستەیی و کاردانەوە فیزیکییەکانی خۆی بتوێژێتەوە، هەروەک لە زانستە بایۆلۆژیەکاندا بەم شێوەیەیە.

کۆمەڵناس، ئابووریناس، یان مێژوونووس پێویستیان بەوە هەیە خۆیان بخزێننە نێو شێوەکانی ئاکارو رەوشتی مرۆڤەوە، کە تیایاندا ویست و خواست چالاکە، ئەمەش لە پێناو دڵنیابوون لەوەی بۆچی مرۆڤەکانی، کە دەبنە ئامانجی لێکۆڵینەوەکەی ئەوەی حەزیان کردبێ کردوویانە.

ئەمەش پەیوەندییەک لە نێوان چاودێر و چاودێرکراودا دروستدەکات، کە تایبەتە بەمێژوو - و زانستە کۆمەڵایەتییەکان خاڵی تێڕوانینی مێژوونووس بەشێوەیەکی کۆتایی دەچێتە نێو هەموو ئەو سەرنج دانانەوە، کە مێژوونووس دەیانکات؛ مێژوو بەمانای وشە پڕە لە رێژەیی.

بەگوێرەی وتەکانی کارل منهایم، تەنانەت ئەو پۆلانەی ئەزموونەکانیشیان تێدا رێک دەخرێن، کۆدەکرێنەوە و پۆل پۆل دەکرێن بەگوێرەی پایەی کۆمەڵایەتی چاودێرەکەوە دەگۆڕێت،(٨٠).

وەلێ بەتەنها هەر ئەوە راست نییە، کە لایەنگری زانای کۆمەڵایەتی وەک پێویست دەچێتە نێو تەواوی سەرنجەکانییەوە، بەڵکو تەنانەت ئەوەش راستە، کە پرۆسێسی سەرنجدانەکە ئەوەیش سەرنج لێدەدرێ کاری تێدەکات و هەمواری دەکات.

دەشێ ئەمەش بەدوو رێگەی بەرەنگاری یەکتر رووبدات. ئەو مرۆڤانەی ئاکارەکەیان ئامانجی شیکردنەوە و بەربینی کردنە لەوانەیە لە میانەی بەربینی کردنی ئەو دەرئەنجامانەی حەزی لێ ناکەن پێش وەخت وشیارببنەوە، و دەبێتە هۆی هەموارکردنی کردەکەیان، گەر بەشێوەیەکیُ راست لەسەر شیکردنەوە بنیاد نرابێت، بۆ ئەوەی بەربینی کردنەکە خۆ پووچەڵکردنەوە بسەلمێنێ.

یەکێک لەو هۆکارانەی بۆچی مێژوو لە نێو ئەو گەلانەی هۆشیاری مێژووییان هەیە بەدەگمەن خۆی دووبارە دەکاتەوە ئەوەیە، کە کەسایەتییەکانی شانۆ لەکاری دووەمی دوا قۆناغی کاری یەکەم سڵ دەکەنەوە و، هەڵسوکەوتیشیان بەم مەعریفەیە کاری تێدەکرێت(٨١).

بەلشەفییەکان دەیانزانی شۆڕشی فەرەنسا ناپلیۆن کۆتایی پێهێناوە و ترسی ئەوەشیان هەبووە کە رەنگە شۆڕشەکەیان بەهەمان شێوە کۆتایی پێبێت.

لە بەرئەوە متمانەیان بەترۆتسکی نەدەکرد، کە لە نێوان سەرکردەکانیاندا زۆر لە ناپلیۆنی دەکرد، وەلێ متمانەیان بەستالین دەکرد، چونکە کەمتر لە ناپلیۆن دەچوو.

وەلێ لەوانەیە ئەم پرۆسێسە بەئاراستەیەکی پێچەوانە ئەو ئابووریناسەی لە رێگەی راڤەکردنێکی زانستی هەلومەرجە ئابوورییەکانەوە بەربینی نزیک بوونەوەی بووژانەوەیەکی ئابووری

یانیش قەیرانێک دەکات، ئەگەر دەستەڵاتەکەی فراوان بێ و گفتووگۆکانیشی قایلکەرین، لەوانەیە لە میانەی راستییەکی راستەقینەی بەربینی کردنەوەکەیەوە دەهەنبەر رووداني دیاردە بەربینی کراوەکەوە بەشداریبکات. ئەو سیاسەت مەدارەی لەسەر بنەمای تێبنییە مێژووییەکانی باوەڕبوون بەوە بەهێز دەکات، کە ستەمکاری تەمەن کورتە، لەوانەیە لە شکستهێنانی ستەمکاردا بەشداریبکات. هەرکەسێک لە هەڵبژاردنەکاندا لەگەڵ ئاکار و رەوشتی کاندیدەکاندا راهاتبێت، دەبینێ ئەوانە سەرکەوتن بۆ خۆیان لە پێناو مەبەستی هۆشیاریدا بەربین دەکەن تاوەکو بەدەستهێنانی بەربینی زیاتر چاوەڕوانی سەرکەوتنی لێ بکرێ هەروەها یەکێک گومانی ئەوە دەکا، کاتێک ئابووریناس و سیاسەت مەداران و مێژوونووسەکان دووچاری بەربینی کردن دەبنەوە هەندێک جار لە میانەی هیوایەکی ناهۆشیارانەی خێراکردنی تێگەیشتن لە بەربینییەکەوە سروشتدەکەن. لەوانەیە ئەوەی یەکێک بتوانێ دەربارەی ئەم پەیوەندییە ئاڵۆزانە بیڵێت، بریتیبێت لەوەی کە کارلێکی نێوان چاودێرو ئەوەی چاودێری دەکرێ، و کارلێکی نێوان کۆمەڵناسی و زانیارییەکانی، و کارلێکی نێوان مێژوونووس و راستییەکانی، شتێکی بەردەوامە و بەبەردەوامیش دەگۆڕێ، هەروەها ئەم کارلێکە وادیارە ببێتە شەقڵێکی جیاکەرەوەی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و مێژوو.

رەنگە پێویست بێ لێرەدا تێبینی ئەوە بکەم، کە لەم ساڵانەی دواییدا هەندێک فیزیست بەدەستەواژە گەلێک لە بارەی زانستەکەیانەوە دەدوان، کە لە یەکچوونی سەرنجراکێشتر لە نێوان جیهانی فیزیکی و جیهانی مێژوونووسان پێشنیار دەکەن.

لەلایەکەوە دەڵێن دەرئەنجامەکانیان بنەمایەکی بێ متمانەییانیش باوەڕبوون بەقەزاوقەدەر لەخۆ دەگرن.

لەگەڵاڵەنامەی داهاتوومدا لە بارەی سروشت و سنوورە. دیاریکراوەکانی قەزاوقەدەر لە مێژوودا قسە دەکەم.

وەلێ ئایا قەزاو قەدەری فیزیکی هاوچەرخ لە سروشتی گەردووندا ئۆقرە دەگرێ، یان تەنها هەر پاشکۆیەکی هێژ ناتەواوی تێگەیشتنمانە لە بارەیەوە (ئەم خاڵە هێژ جێگای مشتومڕە)، دەبێ هەمان گومانم لەوەدا هەبێ، کە لەمیانەی توانامانەوە وێکچوونی گرنگی تێدا بدۆزینەوە تاوەکو بەربینی کردنە مێژووییە ئەنجامبدەین، هەروەک چەند ساڵێکی کەم بەر لە ئێستا دەربارەی هەوڵەکانی ژمارەیەک کەسی گەرموگوڕ ئەنجامدرا بۆ ئەوەی ئەوانە بەڵگەیەکی تێدا بدۆزنەوە لە بارەی کرداری ویستی سەربەخۆ لەگەردووندا.

دووەم، دەڵێین لە فیزیکی هاوچەرخدا ماوە (المسافة) لە بۆشایی ئاسمان و کاتەکانی سەردەمیشدا پێوانەی هەیەو وابەستە پێشنیاری «چاودێریش» دەبێت.

لە فیزیکی هاوچەرخدا تەواوی پێوانەکان بەهۆی حەتمیەتی دامەزراندنی پەیوەندییەکی تۆکمە لە نێوان چاودێر و ئەو بابەتەی لەژێر چاودێری دایە دووچاری گۆڕانە زگماکییەکان دەبنەوە؛ هەریەک لە چاودێر و چاودێری کراو - هەریەک لە خود و بابەت - دەچنە نێو دەرئەنجامی کۆتایی سەرنجدانەکەوە.

وەلێ لەکاتێکدا ئەم ناڤۆکانە گۆڕانکارییەکی کەم بەسەر پەیوەندییەکانی نێوان مێژوونووس و بابەتەکانی سەرنجدانیدا دەهێنن، بەوە قایل نابم، کە جەوهەری ئەم پەیوەندییانە بەهیچ مانایەک لە مانا راستەقینەکانی شایانی بەراوردکردن بێت لەگەڵ سروشتی پەیوەندییەکانی نێوان فیزیک ناس و گەردوونەکەی؛ هەروەها هەرچەندە لەڕووی بیروباوەڕەوە زیاتر بایەخ بەکەمکردنەوەی ئەو جیاوازیانە دەدەم نەک گەورە کردنیان، کە ڕێبازی مێژوونووس لە ڕێبازی زاناکانی دیکە جیادەکەنەوە، ئەوەش یارمەتیمان نادات تاوەکو هەوڵبدەین لە میانەی پشت بەستن بەوێکچوونە ناتەواوەکان ئەم جیاوازیانە لابیەین.

وەلێ پێم وایە لەکاتێکدا تەواو جێی خۆیەتی بڵێم، کە تیۆەگلانی زانای کۆمەڵایەتی یانیش مێژوونووس لە بابەتی توێژینەوەکەیدا بریتییە لە جۆرێکی جیاواز لە جۆری توێژینەوەی زانای فیزیکی، ئەو پرسانەی بەهۆی پەیوەندی نێوان خودو بابەتیشەوە دروستدەبن بەشێوەیەکی بێ کۆتا ئاڵۆزترن، کەوابوو ئەمە کۆتایی پرسەکە نییە.

ئەو تیۆرە کلاسیکییانەی مەعریفە، کە لەسەدەکانی حەڤدە و هەژدە و نۆزدەدا باوبوون بۆ دوولق دابەشبوونێکی بەهێزیان لە نێوان زانینی بابەت و خودی زاندراودا گریماندەکرد.

هەرچۆنێک وێنایانکردبێت، ئەو نموونەیەی فەیلەسووفەکان دروستیانکردبوو خودو بابەت، مرۆڤ و جیهانی دەرەوەی مرۆڤی بەدابەشکراو و جیاواز لە یەکتری دادەنا.

ئەمەش سەردەمی گەورەی لە دایکبوون و پەرەسەندنی زانست بوو؛ هەروەها تیۆرەکانی مەعریفە بەتوندی بەهۆی تێڕوانینی پسپۆڕانی زانستەوە کاریان تێکرا.

هەروەها مرۆڤیان بەتوندی لە دژی جیهانی دەرەوەدا دادەنا مرۆڤ بەشێوەیەک کێبەرکێ لەگەڵ جیهانی دەرەوە دەکرد.

هەروەک بڵێی لەگەڵ شتێکی چەمووس و دوژمنێکی شاراوەدا دەیکات - بۆیە چەمووس بوو چونکە تێنەدەگەیشت بۆیەش دوژمنێکی شاراوەبوو چونکە ئەستەمبوو بەسەریدا زاڵببێ.

هەر لەگەڵ سەرکەوتنی زانستی هاوچەرخدا ئەم تێڕوانینە بەشێوەیەکی ریشەیی هەموارکرا.

ئەمڕۆکە زانا کەمتر وەک شتێک بیر لە هێزەکانی سروشت دەکاتەوە، کە دژی بجەنگن، بەڵکو زیاتر وەک شتێک بیریان لێدەکاتەوە، کە هاوکاری لەگەڵدا بکەن و بۆ مەبەستەکانی خۆی ژێرباریانبخات.

لەمەولا چیتر تیۆرە کلاسیکییەکانی مەعریفە لەگەڵ زانستی نوێتردا پڕاوپڕ نایەنەوە، بەتایبەتیش لەگەڵ زانستی فیزیکدا.

جێگای سەرسوڕمان نییە، کە فەیلەسووفەکان لە ماوەی پەنجا ساڵی رابردوودا گومانیان لە بارەیانەوە پەیداکرد، هەروەها دوور لە دانانی خودو بابەت وەک دووشتی جیا، دەستیان بەناسینەوەی ئەوەکرد، کە پرۆسێسی مەعریفە پێوانەیەکی پەیوەندییەکی ئاڵوگۆڕو پەیوەندییەکی پشت یەکتری بەستنی نێوان خود و بابەت دەگرێتەوە. هەرچۆنێک بێت، ئەمە دەهەنبەر زانستە کۆمەڵایەتییەکان بێ رادە گرنگە.

لەگەڵاڵەنامەی یەکەمدا پێشنیاری ئەوەمکرد، کە توێژینەوەی مێژوو ئەستەمە لەگەڵ تیۆری ئەزموونی تەقلیدی مەعریفەدا بسازێ.

هەنووکە پێویستە گفتوگۆی ئەوە بکەم، کە زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەشێوەیەکی گشتی لەبەرئەوەی مرۆڤ وەک هەریەک لە خودو بابەت، و هەریەک لە لێکۆڵەرەوەو لێکۆڵدراوە دەگرێتەوە، ئەوا لەگەڵ هیچ یەکێک لەو تیۆرانەی دیکەی مەعریفەدا ناگونجێن، کە جیابوونەوەیەکی توند لە نێوان خودو بابەتدا رادەیەگەنن.

کۆمەڵناسی لە هەوڵەکانیدا بۆ ئەوەی خۆی بکاتە جەستەیەکی تۆکمەی پیرۆکە زۆر بەتەواوی لقێکی دامەزراندووە پێی دەوترێ کۆمەڵناسی مەعریفە.

وەلێ هەرچۆنێک بێت ئەم لقە هێز - بەشێوەیەکی سەرەکی زۆر بەرەو پێش نەچووە، ئەمەش بەگومانی من لەبەرئەوەیە، کە بەوە قایل بووە لەناو بێرکمی تیۆری تەقلیدی مەعریفەدا بخولێتەوە.

گەر فەیلەسووفەکان یەکەم جار لەژێر کاریگەری زانستی فیزیکی هاوچەرخدا و دواجار و ئێستا لەژێر کاریگەری زانستی کۆمەڵایەتیدا دەست بەوە بکەن لەم بێرکمە رزگاریان ببێت، و بۆ پرۆسێسی مەعریفە نموونەیەکی هاوچەرختر لە تۆپی بلیاردی کۆن لە بارەی کاریگەری زانیارییەکان لەسەر هۆشیاری کارلێکراو دروستبکەن، ئەوا ئەم کردەوەیە بۆ زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەتایبەتیش بۆ مێژوو ئاگادار کەرەوەیەکی باشە.

ئەم خاڵە تاڕادەیەک گرنگە، و دواتر دەگەڕێمەوە سەری کاتێک قسە لەسەر ئەوە دەکەم لە

مێژوودا مەبەستمان لە بابەتگەرایی چییە.
پێویستە ئەو تێڕوانینە گفتوگۆ بکەم، کە دواترینیانە وەلێ گرنگی کەمتر نییە، ئەویش ئەوەیە مێژوو بەشێوەیەکی جەوهەری دەگلێتە نێو پرسەکانی ئاین و ئاکارو رەوشتەوە، بەم پێودانگە بەگشتی لە زانستەکان و رەنگە تەنانەت لە زانستە کۆمەڵایەتییەکانی تریش جیا ببێتەوە.
لە بارەی پەیوەندی مێژوو بەئاینەوە تەنها بەکورتی ئەوە باس دەکەم، کە بۆ روونکردنەوەی پێگەی خۆم پێویستە. گەردوونناسی جدی لەگەڵ باوەڕبوون بەخودایەک، چوونیە کە، کە گەردوونی باوەڕبوون بەخودایەک چوونیەک نییە، کە هەرکاتێک بیەوێ دەست لە گۆڕینی ڕێڕەوی هەسارەیەک وەربدات، یان خۆرگیران و مانگ گیرانێک دوابخات، یان ڕێساکانی میتۆدی گەردوونی دروست کردووە ڕێکی خستووە وەلێ بگۆڕێ.
بە هەمان شێوە هەندێک جار پێشنیار دەکرێ، دەشێ مێژوونووسێکی جدیش باوەڕی بەخودایەک هەبێ، کە بەشێوەیەکی گشتی ڕێڕەوی مێژووی ڕێکخستووەو مانای پێ بەخشیوە، وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانێ باوەڕ بەو جۆرە خوایەی تەورات بکات، کە خۆی لە کوشتنی زەبەلاحەکان (amalekits) هەڵبقورتێنێ، یان لە پێناو بەرژەوەندی سوپاسی یۆشە دەست لە رۆژمێر وەربدات و ساتەکانی رۆژی رووناک درێژ بکاتەوە.
هەروەها مێژوونووس ناتوانێ لەڕووی روونکردنەوەی رووداوە تایبەتییە مێژوویيەکانەوە پشت بەخوداوەند ببەستێ.
باوکی رۆمانی دارسی لە کتێبێکی نوێدا هەوڵی داوە ئەم جیاکردنەوەیە ئەنجامبدات.
بۆ قوتابی باش نییە وەڵامی هەر پرسیارێک لە مێژوودا بەوە بداتەوە، کە کاری خودا بووبێت.
تاوەکو بەگوێرەی توانا لە ڕێکوپێککردنی رووداوە دنیاییەکان و دراماى مرۆڤدا رۆبچین، ئەوا بوارمان نادرێ گوزارشتی فراوانتر بەدەست بهێنین[٨٢].
گێرەشێوێنی ئەم تێڕوانینە لەوەدایە، کەوا دەردەکەوێ وەک جۆکەرێک لەناو کۆمەڵە کارتێکی یاریکردندا مامەڵە لەگەڵ ئاییندا بکات، بۆ ئەوەی بۆ ئەو فێڵە گرنگانە هەڵیبگرێت، کە ناتوانرێ بەهیچ ڕێگایەکی تر چارەسەر بکرێن.
کارل بات، کە یەکێک بوو لە تیۆلۆژەکانی ڕێبازی لوتەری، کارێکی زۆرباشی ئەنجامدا کاتێک جیاوازییەکی تەواوی لە نێوان مێژووی یەزدانی و مێژووی عەلمانیدا راگەیاند، و مێژووی عەلمانی رادەستی لایەنی سکیۆلاریزم کرد.
پرۆفیسۆر بەتەرفیلد، گەر لێی تێبگەم، مەبەستی هەمان شتە کاتێک قسە لە بارەی مێژووی،

تەکنیکی، دەکات.

مێژووی تەکنیکی تاکە جۆری مێژووە کە تۆ یانیش من هەمیشە لەوانەیە بینووسین، یان خۆی ساتێک لە ساتەکان نووسیوویەتی وەلێ بەتەرفیلد لەمیانەی بەکارهێنانی ئەم نازناوە سەیرو سەمەرەوە بەڕاستی وایکردووە باوەڕ بەبوونی مێژوویەکی، شاراوە یانیش یەزدانی بکەین، کە تەواوی ئێمەمان پێویستیمان بەوە نییە خۆمانی پێوە خەریکبکەین.

نووسەرانی وەک بێردیاف و نیبوورو ماریتا چاوەڕاوی هێشتنەوەی پێگەیەکی سەربەخۆی مێژوو دەکەن، وەلێ لەسەر ئەوە رشتن، کە کۆتایی یانیش ئامانجی مێژوو لە دەرەوەی مێژوودایە.

من وەک خۆم بەئەستەمی دەزانم یەک پارچەیی مێژوو بەباوەڕبوون بەهێزێکی سەرووی چارەسەر بکەم، کە ماناو گرنگی مێژووی لەسەر دەوەستێ، ئینجا ئەو هێزە چ خوداوەندی گەلی هەڵبژێراو بێت، چ خوداوەندی مەسیحی بێت، چ دەستی پەنهانی رەبانیەت بێت، یانیش جیهانی رۆحی هیگڵ بێت.

لە پێناو مەبەستی گەلاڵەنامەکانمدا، ئەوە گریمان دەکەم، کە پێویستە مێژوونووس بەبێ پەنا بردنە بەر هیچ جۆرە میانجەگەراییەکی ئاسمانی (deus ex machina) کێشەکانی خۆی چارەسەر بکات، بەشێوەیەک گەر دەستەواژەیەی رەوابێ مێژوویارییەکە بەبێ جۆکەر لەناو کۆمەڵە کارتەکەدا یاریدەکات.

پەیوەندی مێژوو بەئاکارو رەوشتەوە پەیوەندییەکی ئاڵۆزترە، هەروەها لەسەردەمەکانی رابردوودا گفتوگۆکان دەربارەی ئەم پەیوەندییە چەندین جار دووجاری گۆنگ گەرایی بوونەتەوە.

لەم رۆژگارەدا بەدەگمەن پێویست بەگفتوگۆکردنی ئەوە دەکا، کە بڵێین مێژوونووس پێویستی بەوە نییە بڕیارە ئەخلاقییەکان لە بارەی ژیانی تایبەتی کەسایەتییەکانی ناو چیرۆکەکەی بەدەستەوە بدات.

تێڕوانینەکانی مێژوونووس و ئەخلاقناس هاوڕێک نابن. لەوانەیە هنری هەشتەم مێردێکی خراپ و پاشایەکی باش بووبێ.

وەلێ لە حاڵەتی پێشوودا مێژوونووس تەنها بەو ئەندازەیە نمازمەندی هنری دەبێت، کە کاریکردۆتە سەر رووداوە مێژووییەکان.

ئەگەر شورەییە ئەخلاقییەکانی هنری هەشتەم ئەوەندە بەئاشکرا بەقەد شوورەییە ئەخلاقییەکانی هنری دووەم کاریان نەکردبایە سەر کاروباری گشتی، ئەوا پێویستی بەوە نەدەکرد مێژوونووس ئەوەندە پێیان هەراسان ببێت.

ئەمەش بەسەر هەریەک لە چاکەکان و شورەییەکاندا پراکتیزە دەبێت.

دەڵێن پاستۆغ و ئاینشتاین لە ژیانی تایبەتیاندا دووکەسی نموونەیی تەنانەت فریشتە ئاسابوونە، ئینجا با وادابنێین ئەوان دوو مێردی بێ وەفاو، و دوو باوکی دڵ ڕەق، و دوو هاوڕێی بێ ویژدان بوونە، وەلێ ئایا ئەمانە هیچ لە دەسکەوتە مێژوویەکانیان کەمدەکەنەوە؟ هەروەها ئەمەش بریتییە لەو کارانەی پێشوەخت مێژوونووس خەریکدەکات دەڵێن ستالین بەشێوەیەکی هەڤۆکانە و دڵ ڕەقانە لەگەڵ ژنی دووەمیدا ڕەفتاریدەکرد؛ وەلێ خۆم وەک مێژوونووسێکی کاروباری سۆفیەت هەست بەوە ناکەم زۆر خۆم بەم پرسەوە خەریک کردبێت.

ئەمەش مانای ئەوە نییە، کە ئەخلاقییەتی تایبەتی گرنگ نییە، یان مانای ئەوەبێ، کە مێژووی ئەخلاق بەشێکی شەرعی مێژوو نییە. وەلێ مانای ئەوەیە مێژوونووس لە پێناو ڕاگەیاندنی بڕیارە ئەخلاقییەکان دەربارەی ژیانی تایبەتی ئەو تاکەکەسانە ڕێڕەوی خۆی ناگۆڕێت، کە لە ڕووپەڕی کارەکانیدا دەردەکەون. چونکە شتی دیکە هەیە پێویست بیکات.

گۆنگ گەرایی جدیتر لە بابەت پرسی بڕیارە ئەخلاقییەکان لەسەرکردە گشتییەکان سەرهەڵدەدات.

باوەڕبوون بەئەرکی مێژوونووس بۆ ئاشکراکردنی بڕیارە ئەخلاقییەکان دەربارەی کەسایەتییەکانی ناو شانۆکەی بنەچەکێکی دووررودرێژی هەیە.

وەلێ هەرگیز لە بەریتانیای سەدەی نۆزدەهەم بەهێزتر نەبووە کاتێک لە میانەی هەریەک لە بەئەخلاقکردنی ئامانجەکانی سەردەمەکەو پەرستشی ئازادکراوی تاکەکەسی گەراییەوە بەهێزبووبوو.

ڕۆزبێری تێبنی ئەوەیکرد، کە ئەوەی خەڵکی ئینگلیز دەیانەوێ دەربارەی ناپلیۆن بیزانن ئەوەبوو ئاخۆ، پیاوێکی باش بووە،(٨٣) ئاکتن لە نامە گۆڕینەوەکەیدا لەگەڵ کرایتۆن ئەوەی ئاشکراکرد، کە نەرم و نیانی دەستووری ئەخلاقی شتێکی شاراوەی دەستەڵات و شکۆو سوودمەندی مێژووە، هەروەها چاوەڕاوی ئەوەیدەکرد مێژوو بکاتە بڕیاردەرێک لە مشت و مڕەکان و ڕێبەری گەریدەیەک و هەڵگری ئەو پەرچەمە ئەخلاقییەی کە هێزەکانی زەوی و خودی ئایینیش بەبەردەوامی لە هەوڵی کپکردنی(٨٤) تێڕوانینێک دان، کە تارادەیەک لەسەر بیروباوەڕە سۆفیگەری ئاکتن لەمەڕ بابەتگەرایی و دەسەڵاتی ڕاستییە مێژووییەکان دامەزراوە، بەشێوەیەکی بێ پێچ و پەناش لەسەر مێژوونووسی دەسەپێنێ و بواری پێدەدات وەک جۆرە هێزێکی سەرووی مێژوو بەناوی مێژووەوە بڕیارە ئەخلاقییەکان لەسەر ئەو تاکەکەسانە بدات، کە لە ڕووداوە

مێژووییەکاندا بەشداری دەکەن.

ئەم هەڵوێستە هێژ هەندێک جار لە شێوەگەلێکی چاوەڕوان نەکراودا دووبارە دەردەکەوێتەوە. پرۆفیسۆر توینبی داگیرکردنی حەبەشە لەلایەن مووسۆلینی لە ساڵی ١٩٣٥-دا وەک، تاوانێکی کەسی بەئەنقەست، وەسفدەکات[٨٥] هەروەها ئیساه بەرلین لەگوتارێکیدا، کە پێشتر چەند بڕگەیەکی لێ چنرا بەتوندی لەسەر پشنە کەر ئەرکی مێژوو نووسەر بڕیار بدات لەسەر قەسابخانەکانی شارلەمان یانیش ناپلیۆن یانیش جەنگیزخان یانیش هیتلەر، یان ستالین[٨٦]

پرۆفیسۆر نۆوڵز بەتوندی رەخنەی لەم تێڕوانینە گرتووە، کە لە دەسپێکی گەلاڵە نامەکەیدا تۆمەتبارکردنی فلیپی دووەم لەلایەن مۆتلی - یەوە بەنموونە وەردەگرێ (گەر شوورەیی هەبێت.. ئەوا ئەو لەمانە بووردراوە، چونکە رێگە بەسروشتی نەدراوە لە خراپەشدا پلەی سەد دەرسەد بەدەست بهێنێ) هەروەها وەسفی ستەب لە بارەی کینگ جۆن بەم شێوەیەی (بەهەرتاوانێک پیس دەبێت، کە مرۆڤێک شەرمەزار بکات) وەک نموونەگەلێکی بڕیارە ئەخلاقییەکان لەسەر تاکەکەسەکان، بەشێوەیەک لە توانای مێژوونووسدا نییە رایان بگەیەنێت: مێژوونووس دادوەرێک نییە، بەڵکو بەدڵنیاییەوە دادوەرێکی خەڵک هەڵواسینیش نییە[٨٧].

وەلێ هەروەها گرۆچە بڕگەیەکی جوانی دەربارەی ئەم خاڵە هەیە، کە زۆر حەز دەکەم وەک دەقێک وەریبگرم:

تۆمەتبارکردن ئەو جیاوازییە گەورانە لە یاد دەبەنەوە، کە دادگاکانمان (چ قەزائی بن یان ئەخلاقی) بریتین لەو دادگایانەی ئەمرۆکە بۆ مرۆڤ زیندو، و چالاک و مەترسیدارەکان دروستبوونە، لەکاتێکدا ئەو مرۆڤانەی پێشتر لەبەردەم دادگاکانی رۆژگاری خۆیاندا دەرکەوتن، ناتوانرێ دووجار تۆمەت بار بکرێت و ببووردرێن.

هەرچۆنێک بێت ناتوانرێ لەبەردەم هیچ دادگایەکدا بەرپرسیار بکرێن، کت و مت لە بەرئەوەی ئەو مرۆڤانەی رابردوو دەگەڕێنەوە بۆ ئاشتی رابردوو، هەروەها بەم شێوەیە تەنها دەکرێ ببنە مرۆڤی مێژوو، هەروەها جگە لەوەی، کە رۆحی کارەکەیان دەبڕن و تێدەگەن ناتوانن دووچاری هیچ بڕیارێکی دیکە ببنەوە... ئەوانەی داوای گێڕانەوەی مێژوو دەکەن، وەک دادوەران پەلە دەکەن، لێرە خەڵکی تاوانبار دەکەن و لەوێش بێ تاوانی دەکەن، چونکە وا دەزانن ئەمەیە ئەرکی مێژوو... ئەمانەش بەگشتی هەستی مێژووییان نییە[٨٨].

ئینجا گەر یەکێک گازندەی بێ هوودە لە بارەی ئەو گوتە بورووژێنێ، کە ئەوە کاری ئێمە نییە بڕیاری ئەخلاقی لەسەر هیتلەر یانیش ستالین بدەین - یان گەر حەز بکەی بڕیاری ئەخلاقی لەسەر

سیناتۆر ماک کارتی بدەی، ئەمەش لەبەرئەوە بێ، کە ئەوانە هاوچەرخی زۆرینەیەکی ئێمە مانان بوونە، لەبەرئەوەی بەسەدان و هەزارانی ئەوانەی ئازارچێژی دەستی ئاکارەکانیان بوونەتەوە چ بەراستەوخۆی چ بەناراستەوخۆی هێژ لە ژیاندا ماون، بەشێوەیەکی ورد و دروست لەبەر ئەم هۆکارانە، هەروەها لەبەرئەوەی بۆ ئێمە ئەستەمە وەک مێژوونووس لێیان نزیک بکەوینەوە و لە ئەرکەکانی دیکە خۆمان دابماڵین، کە لەوانەیە لە بڕیاردان لەسەر کردەوەکانیان پاساومان بۆ بهێننەوە: ئەمەش یەکێکە لە گرفتەکان، تەنانەت پێویستە بڵێم گرفتێکی سەرەکی مێژوونووسی هاوچەرخە.

وەلێ ئایا ئەمڕۆکە هەریەکێک چ سوودێکی پێ دەگات لە پەنجە خستنە چاوی تاوانەکانی شارلمان یانیش ناپلیۆن؟ لەبەرئەوە با تیۆری مێژوونووس وەک دادوەرێکی هەڵواسەر رەتبکەینەوەو بگەڕێینەوە سەر پرسێکی زەحمەتتر وەلێ بەسوودتر لە بارەی بڕیاردانی ئەخلاقی نەک لەسەر تاکەکەسەکان، بەڵکو لەسەر رووداوەکان و دەزگاکان، یان سیاسەتی رابردوو.

ئەمانەش بڕیارە گرنگەکانی مێژوونووس؛ ئەوانەیش، کە زۆر بەگەرمی لەسەر بڕیارە ئەخلاقییەکانی تاکەکەس رشتن هەندێک بەشێوەیەکی ناهۆشیارانە بۆ تەواوی گرووپ و کۆمەڵگاکان پاساو دەهێننەوە.

مێژوونووسی فەرەنسی لووفێبڤخ بەدواوی ئەوەدا دەگەڕێ بەرپرسیاریەتی کارەسات و خوێن رشتنی جەنگەکانی ناپلیۆن لەملی شۆڕشی فەرەنسی بکاتەوەو بیانخاتە ملی دیکتاتۆریەکی ژەنەراڵێک... هەوەسیشی.. بەئاسانی ناتوانێ میانڕەوی و ئاشتی قبووڵبکات[٨٩].

ئەمڕۆکە ئەڵمانییەکان تاوانبارکردنی خراپەکارییە کەسییەکانی هیتلەر وەک جێکارێکی قایلکەر دەهەنبەر بڕیاری ئەخلاقی مێژوونووس لەسەر ئەو کۆمەڵگەیەی هیتلەری بەرهەمهێناوە، بەگەرمی پێشوازیدەکەن.

رووسی و ئینگلیز و ئەمریکییەکان بەدڵ خۆشیەوە بەشداری هێرشە کەسییەکانی سەر ستالین و نوڤی شومبێرلا، یان ماک کارتی دەکەن وەک بەرانی قوربانی کردەوە خراپەکانیان. سەرەڕای ئەوە، پەسنکاری بڕیارە ئەخلاقییەکان لە بارەی تاکەکەسەکانەوە بەقەد تاوانبارکردنی تاکەکەسەکان تەفرەدەرو زیانبەخشە.

داننان بەوەی، کە هەندێک تاکەکەسی کۆیلەدار هەستێکی خانەدانانەیان هەبووە بەبەردەوامی وەک بەهانەیەک بەکاردەهێنرا لە پێناو تۆمەتبارنەکردنی کۆیلەداری وەک شتێکی بێ ئەخلاقی.

ماکس ڤێبەر ئاماژە بەوە دەدات، کۆیلەداری بێ خاوەن، کە تیایا سەرمایەداری قەرزار یانیش

کرێکار دەخاتە تۆڕەوە؛ هەروەها بەڕاستی لە جێگای خۆیدا گفتوگۆی ئەوە دەکات، کە پێویستە مێژوونووس بڕیاری ئەخلاقی لەسەر دەزگاکە بدات، نەک لەسەر ئەو تاکەکەسانەی دەزگاکە(یان) دروستکردووە[٩٠].

مێژوونووس دەربارەی بڕیاردان لەسەر تاکەکەسێکی ستەمکاری ڕۆژهەلاّت بەچاودێر دانانرێت. وەلێ پێویست ناکات گوێ مەدێ و بێ لایەن بمێنێتەوە، بۆ نموونە، لە نێوان ستەمکاری ڕۆژهەلاّت و دەزگاکانی ئەتینا لەسەردەمی ئێرکلیس-دا.

مێژوونووس بڕیار لەسەر کەسایەتی کۆیلەدا نادات.

بەلاّم ئەمە ڕێگەی لێناگرێت کۆمەلّگەیەکی خودان. کۆیلە تۆمەتبار بکات.

هەروەک بینیمان ڕاستییە مێژووییەکان بڕێک شرۆڤەکردنی پێشینە گریماندەکەن؛ شرۆڤە مێژووییەکانیش هەمیشە بڕیارە ئەخلاقییان لە خۆ دەگرن - یانیش ئەگەر زاراوەیەکی بێ لایەنترن پێ باشترە، ئەوا بڕیارە بەهادارەکان لەخۆ دەگرن.

هەرچۆنێک بێت، ئەمەش تەنها دەسپێکی ئاستەنگەکانمانە مێژوو بریتییە لە پرۆسێسێکی کێشمەکێشمکردن، کە تیایا دەرئەنجامەکان چ بەچاک چ بەخراپ بڕیاریان لەسەر بدەین، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یانیش ناڕاستەوخۆ - بەلاّم بەشێوەیەکی زیاتر ڕاستەوخۆ دەبن نەک ناڕاستەوخۆ - چەند گرووهێک لەسەر حیسابی گرووهەکانی دیکە سوودیان لێوەردەگرن. خەسارەتمەندەکانیش باجەکەی دەدەن.

دووچار هاتنی زیان و ئازار شتێکی ئاساییە لە مێژوودا. هەموو سەردەمێکی گەورەی مێژوو قوربانیان و سەرکەوتوانی خۆی هەیە.

ئەمەش بێ ڕادە پرسێکی ئالۆزە، چونکە پێوودانگێکمان نییە لەمیانەیەوە بتوانین دەستکەوتی بێ شوومارى هەندێکیان لە بەرامبەر قوربانیانی هەندێکی دیکەدا بپێوین: لەگەلّ ئەوەشدا دەبێت ئەم جۆرە پێودانگانە لەناکاو بهێندرێنە ئاراوە. ئەمەش بەتەنها پرسێکی مێژوو نییە.

زیاتر لە ژیانی ڕۆژانەدا سەرقالّتر دەبین نەک وەک هەندێک جار حەز دەکەین پێداویستی بەباشتر زانینی خراپەی کەمتر قبوولّ بکەین، یان کردنی خراپەیەک بۆ ئەوەی چاکەیەکمان دەستکەوێ.

پرسەکە لە مێژوودا هەندێک جار لە ژێر ناوونیشانی باربووی پەرەسەندن، یانیش، بەهای شۆڕش، تاووتوێکراوە ئەمەش چەمکێکی گومڕاکەرە.

هەروەک بێیکن لەگوتارێکدا دەربارەی، داهێنانەکان، دەلّێت: چەمووس بوون لەسەر دەست

بەسەرداگرتنی نەریتێک بەقەد داهێنانێک ئاشووبگێڕی بەدواوە دەبێت؟

باربووی پارێزگاریکردنیش کتومت بەقورسی دەکەوێتە سەر بێدەرەتانەکانەوە، هەروەک باربووی داهێنانەکەش دەکەوێتە سەرشانی ئەوانەی لە ئیمتیازاتەکانیان یاساغ کراون.

ئەو تێزەی، کە دەڵێ چاکەی هەندێک کەس پاساو بۆ ئازارەکانی هەندێکی تر دێنێتەوە بریتییە لە کۆڵەکەیەکی شاراوە لەهەر دەوڵەتێکدا، ئەم چەمکەش بەقەدر ئاینزایەکی رادیکالی پارێزگاری کارە.

دکتۆر جۆنسن بەتوندی شایەتمانی بەو گفتوگۆیە داوە، کە دەربارەی خراپەی کەمترە بۆ ئەوەی هێشتنەوەی نایەکسانی بێبەر پاساو بکات.

ئەوە باشترە هەندێک کەس زیزبکرێ نەک هیچ کەسێک دڵ خۆش نەبێ، بۆ ئەوەی ببێتە حاڵەتێک لە حاڵتی یەکسانی گشتی(٩١). وەلێ ئەم دۆز لەسەردەمەکانی گۆڕانی ریشەییدا لە شێوە دراماتیکیەیدا دەردەکەوێت؛ لێرەشدا توێژینەوەی هەڵوێستی مێژوونووس بەو ئاراستەیە ئاسانتر دێتە بەرچاومان.

با چیرۆکی بەپیشەسازیکردنی بەریتانیای گەورە لە نێوان دەوروبەری ١٧٨٠و ١٨٧٠ بەنموونە وەربگرین.

لەراستیدا هەر مێژوونووسێک لەوانەیە بەبێ گفتوگۆکردن شۆڕشی پیسەشازی بەدەستکەوتێکی گەورە و پێشکەوتن خواز دابنێت.

هەروەها رەنگە دەرکردنی جووتیارەکان لە زەوی و زاردا، و کۆکردنەوەی کرێکارەکان لە کارگە ناتەندروست و نشینگە پیس و پوخڵەکانداو بەکارهێنانی کرێکاری منداڵ - یش وەسف دەکات هەروەها رەنگە باس لەوە بکات، کە خراپەکاری (بەد رەفتاری abnse) لەکارکردنی پێڕۆکەدا دەرکەوتووە، و رەنگە بشڵێ، کە هەندێک خاوەن کار لە هەندێکی تریان بێ رەحمتربوونە، هەروەها بەهەتوانکردنێک قسە لە بارەی گەشەکردنی پەیتا پەیتای ویژدانی مرۆڤایەتی دەکات، کاتێک سیستەمەکە دادەمەزرێ وەلێ لەوانەیە دووبارە ئەوە گریمانبکات بەبێ ئەوەی ئاشکرای بکات، کە بەهەر حاڵ لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا پێوانەکانی تەنگەتاوکردن و وەکارخستن بەشێکی یاساغ نەکراوی باربووی بەپیشەسازیکردنەکە بوونە.

لە مێژوونووسێکیشم نەبیستووە. گوتبێتی، کە لەبەر زیادبوونی باربووەکان واباشتربوو جڵەوی پەرەسەندن بوەستێ و بەپیشەسازیکردنیش ئەنجامنەدرێ؛ گەر مێژوونووسێکی لەم چەشنەش هەبێت، ئەوا بێگومان سەر بەقووتابخانەی چێستەرتۆن و بێلۆکە، و بەشێوەیەکی تەواو کتوومت،

لەوانەیە لەلایەن مێژوونووسە جدیەکانەوە بەبایەخەوە وەرنەگیرێت. ئەم نموونەیە دەھەنبەر من گرنگیەکی تایبەتی هەیە، چونکە هیوام وایە لە مێژووەکەمدا دەربارەی رووسیای شوورەوی خێرا لە پرسی بەهەرەوەزیکردنی جووتیارەکان وەک بەشێک لە باربووی بەپیشەسازیکردن نزیک بکەمەوە؛ هەروەها باش ئەوە دەزانم، کە ئەگەر بەشێوەی مێژوونووسانی شۆڕشی پیشەسازی بەریتانیا پەژارە بۆ هەڤۆکگەری و بەد رەفتاریەکانی بەهەرەوەزکردنی هەڵبکێشم، وەلێ پرسێسەکە وەک بەشێکی یاساغ نەکراوی باربووی سیاسەتی ئارەزوومەندانە و پێویستی بەپیشەسازیکردن دابنێم، ئەوا دووچاری تاوانەکانی گاڵتەجاڕێ و لێبووردنی کردەوە خراپەکان دەبمەوە.

مێژوونووسانی داگیرکردنی ئاسیاو ئەفریقا لەلایەن نەتەوەکانی رۆژهەڵات و لەسەدەی نۆزدەهەمدا چاوپۆشی دەکەن نەک تەنها لەسەر بنچینەی کاریگەرییە مام ناوەندییەکەی لەسەر ئابووری جیهان، بەڵکو بەهۆی دەرئەنجامە درێژ خایەنەکانیەوەبو لەسەر نەتەوە دواکەوتووەکانی ئەم کیشوەرانە.

سەرەڕای ئەمە، دەڵێن هیندستانی هاوچەرخ وەچەی فەرمانڕەوایی بەریتانیایە، چینی هاوچەرخ بەرهەمی ئیمپریالیزمی سەدەی نۆزدەهەمی رۆژئاوایەو بەکاریگەری شۆڕشی رووسیاش موتوربەکرا.

بەداخەوە ئەو کرێکارە چینیانەی لە بەندەری پەیماننامەکانی کارگە رۆژئاواییەکاندا رەنجیان دەکێشا، یان لە کانەکانی باشووری ئەفریقیادا کاریاندەکرد، یان ئەوانەی لە جەنگی جیهانی یەکەمدا لەبەرەی رۆژئاوادا دەجەنگان، هیچ یەکێک لەوانە لەژیاندا نەماوە، تاوەکو شانازی بەهەر شکۆمەندییەکەوە یانیش قازانجێکەوە بکات، کە لەوانەیە لە شۆڕشی چینەوە سەرچاوە بگرتایە.

ئەوانەی باربووەکەیان داوە زۆر بەدەگمەنی ئەوانەن، کە قازانجەکانی دەدورنەوە.

بڕگە بەناوبانگە رەونەقدارەکەی ئەنگلس بەشێوەیەکی ناڕەحەت دەگونجێ: مێژوو دەربارەی مێ خوداوەندی لە هەموویان دڵڕەقترە، کە دووچەرخە سەرکەوتووەکەی نە تەنها لە جەنگدا، بەڵکو لە پەرەسەندنی ئابووری، ئاشتیخوازانەشدا، بەسەر کەڵەکەی جەستەکاندا رادەکێشێت.

هەروەها بەداخەوە ئێمە بەژن و پیاوەوە ئەوەندە دەبەنگین لە پێناو پێشکەوتنێکی راستەقینەدا خۆمان ئازار نادەین، مەگەر بەهۆی ئەو ئازار چەشتنەوە بێت، کە تاڕادەیەک نەگونجاوە، ئینجا ناچار دەبین ئەو کارە بکەین(٩٢).

دیاردیدانە مەیدانخوازییە بەناوبانگەی ئیڤان کارامازۆڤ هەڵەیەکی پاڵەوانانەیە.

کە دەڵێ: ئێمە لە کۆمەڵگەدا لەدایک دەبین، ئێمە لە مێژوودا لەدایک دەبین.

ساتێک نییە، کاتێک بلیتێکی قبووڵکردن بەناوی قایلبوون یانیش رەتکردنەوەی

پێشکەشدەکەین.

مێژوونووس وەڵامێکی ئەنجامگیرتری لەوەی تیۆلۆژی لەمەڕ پرسی دووچاربوونی ئازار نییە.

هەروەها مێژوونووس پەنا دەباتە بەر تێزی خراپەی کەمترو چاکەی زیاتر.

وەلێ ئایا ئەوە بریتی نییە لەو راستییەی، کە مێژوونووس بەپێچەوانەی زانا لە میانەی سروشتی مەتریاڵەکەی لەم پرسانەی بڕیاری ئەخلاقیدا سەرقاڵ دەکا، کە ناچارکردنی مێژوو بۆ پێودانگێکی بەهای سەرووی مێژوو پراکتیز دەکات؟

پێم وانییە ئەوە راستبێ.

با ئەوە گریمانبکەین، کە چەمکە پەتییەکانی وەک، باش، و ،خراپ، هەروەها پەرەسەندنە ئاڵۆزترەکانیان دەکەونە ئەودیو سنوورەکانی مێژووەوە.

وەلێ ئەم پەیتکردنانە تەنانەت لە توێژینەوەی ئەخلاقییەتی مێژوودا هەمان ئەو رۆڵە دەگێڕن، کە فۆرمەلۆژیکی و بیرکارییەکان لە زانستی فیزیکدا دەیگێڕن.

ئەم چەمکانە کاتیگۆری بنچینەیی هزرن؛ وەلێ تاوەکو نێوەرۆکێکی تایبەتیان تێدا دادەنرێ بێ ماناو یاساغ کراو دەبن لە پراکتیزەکردن.

گەر مەجازێکی جیاوازت پێ باشتر بێت، ئەوا ئەو بنەما ئەخلاقییانەی لە مێژوودا یانیش لە ژیانی رۆژانەدا پراکتیزیان دەکەین وەک چەکن لە بانکێکدا: کە بەشێکی چاپکراوە - و بەشێکی نووسراویان هەیە.

بەشی چاپکراو وشە پەتییەکانی وەک ئازادی و یەکسانی و دادپەروەری و دیموکراسی دەگرێتەوە.

ئەمانەش کاتیگۆری بنچینەیین.

وەلێ تاوەکو بەشەکەی تریان پڕ دەکەینەوە چەکەکە بێ نرخ دەمێنێتەوە، کە ئەو بەشە ئەوە روونکەکاتەوە تا چەند ئازادییان بۆ بەرەوا دەبینین، و بەیەکسانی خۆمانیان دەزانین، هەروەها تا هەر رادەیەک.

ئەو شێوازەی لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر چەکەکەی پێ پڕ دەکەینەوە. بریتییە لە پرسێکی مێژوو.

ئەو پرۆسێسی لەمیانەیەوە نێوەرۆکێکی مێژوویی تایبەت دەدرێتە چەمکە ئەخلاقییە پەتییەکان بریتییە لە پرۆسێسێکی مێژوویی؛ لە راستیدا بڕیارە ئەخلاقییەکانمان لەنێو ئەو چوارچێوە چەمکییەکەدا دروستدەبن، کە خۆی لە خۆیدا دروستکراوی مێژووە.

شێوەی کاریگەری مشتومڕی نێو دەوڵەتی هاوچەرخ دەربارەی پرسە ئەخلاقییەکان بریتییە لە جەدەلێک لەسەر چاوەڕاوە کێبەرکێ کەرەکاندا لە پێناو سەربەستی و دیموکراسی چەمکەکان پەتی و ئاودامانن.

وەلێ ئەو نێوەڕۆکەی لەنێویاندا دادەنرێ لەکاتێکەوە بۆکاتێک و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لەسەرتاسەری مێژوودا دەگۆڕێ تەنها لەمیانە پێودانگە مێژووییەکانەوە دەتوانین لە جێبەجێکردنی هەر پرسێکی پراکتیکی تێبگەین و تاوو توێبکەین.

با نموونەیەکی کەم میللیتر وەک پێودانگێکی بابەتی نەک وەک پێودانگێکی پڕ لە مشتومڕ وەربگرین، هەروەک هەوڵی بەکارهێنانی عەقلانیەتی ئابووری، دراوە، کە لە میانەیەوە دەتوانرێ ئارەزوومەندانگەرایی سیاسەتە ئابوورییەکان تاقیبکرێتەوەو بڕیاری لەسەر بدرێ.

هەوڵەکەش لەناکاو شکست دێنێ.

ئەو تیۆردانەرانەی لەسەر یاسا ئابوورییە کلاسیکیەکان پەروەردە بوونە بەشێوەیەکی بنچینەیی پلاندانان وەک خۆ هەڵقورتێنێکی نا عەقلانی لە پرۆسێسە عەقلانییە ئابوورییەکان نەفرێن دەکەن؛ بۆ نموونە پلانکێشکان پابەندبوون بەیاسای وەبازاڕخستن و داوا خواست لە سیاسەتی بەهایاندا رەتدەکەنەوە، و دەڵێن نرخەکان لەژێر سایەی پلاندانانداندا ناتوانن هیچ بنچینەیەکی عەقلانیان هەبێت.

بێگومان لەوانەیە راستبێ، پلاندانەران بەزۆری بەشێوەیەکی ناعەقلانی هەڵسوکەوتدەکەن، هەر لەبەرئەوەشە بەگێلانە کاردەکەن.

بەڵام ئەو پێودانگەی پێویستە لە میانەیەوە بڕیاردەن بریتی نییە لە کۆنە عەقلانیەتی ئابووری کلاسیکی. من وەک خۆم زیاتر لەگەڵ ئەو گفتوگۆ پێچەوانەیەدا هاوسۆزم، کە ئابووری سەربەخۆ کۆنترۆڵ نەکراو - و رێک نەخراوبووە ئەمەش هەر لە بنچینەدا ناعەقلانی بووە، هەروەها پلاندانان هەوڵێکە دەیەوێ، عەقلانیەتی ئابووری، بخاتە ناو پرۆسێسەکەوە.

وەلێ ئەو تاکە خاڵەی دەمەوێ ئێستا بیڵێم بریتییە لە حەتمیەتی دروستکردنی ستانداردێکی پەتی و سەرووی مێژوو، بەشێوەیەک لە میانەیەوە بتوانرێ کردە مێژووییەکان بڕیاردان لەسەر بدرێ.

هەریەکەیان بەشێوەیەکی حەتمی ئەستارنداردێکی بەم شێوەیەدا ئاماژە بە نێوەڕۆکێکی تایبەتی دەدەن، کە لەگەڵ هەلومەرج و خواستە مێژووییەکانیاندا دەگونجێت.

ئەمەش تۆمەتبارکردنێکی راستەقینەی ئەوانەیە، کە بەدوای ئەوەدا دەگەڕێن لەژێر تیشکی ئەو

بڕیارەی لە بارەی حاڵەت یانیش بوویەرە مێژووییەکانەوە دەدرێ ستانداردێک یان پێودانگێکی سەرووی مێژوویی دروستبکەن ئینجا ئەو ستانداردە چ لە دەستەڵاتی یەزدانی وەربگیرێ هەروەک تیۆلۆژییەکان داوای دەکەن، چ لە عەقڵی یانیش لە سروشتی چەقبەستوو وەربگیرێت هەروەک فەیلەسووفەکانی چەرخی ڕۆشنگەری داوایاندەکرد.

پرسەکە پرسی دەرکەوتنی کەموکورتییەکانیە لە پراکتیزکردنی ستانداردەکەدا، یان کەموکورتییەکان لە خودی ستانداردەکەداین. بەڵکو پرسەکە لە هەوڵی دروستکردنی ئەم جۆرە ستاندارده دایە، کە شتێکی نامێژوویيە و پێچەوانەی جەوهەری ڕاستەقینەی مێژووشە.

هەروەها وەڵامێکی دۆگمای ئەو پرسیارانە دەداتەوە، کە مێژوونووس بەهۆی کارەکەیەوە بەبەردەوامی ناچارە ئەم جۆرە پرسیارانە بکات: ئەو مێژوونووسەی پێشوەخت وەڵامی ئەم پرسیارانە قبووڵ دەکات وەک ئەوە وایە بەچاوبەستراوی بچێتە سەرکار و واز لە پیشەکەی بهێنێ.

مێژوو بریتییە لە جووڵە؛ جووڵەش بەشێوەیەکی متمانە واتە بەراوردکردن.

هەر لەبەرئەوەیە مێژوونووسان بڕیارە ئەخلاقییەکانیان بە وشەگەلێکی بەراوردکاری وەک، پەرەسەندن، و، کۆنە پەرستی، گوزارشت دەکەن نەک بە وشەی ڕەهای جێگە نەئاسای وەک، باش، و، خراپ، ئەمانەش کۆمەڵە هەوڵ و کۆششێکن بۆ پێناسەکردنی ئەو کۆمەڵگە جیاوازانە یانیش ئەو دیاردە مێژووییانە بەکاردێن، کە پەیوەندییان بە ستانداردێکی ڕەهاوە نییە، بەڵکو هەریەکە لەگەڵ ئەوەی تردا لە پەیوەندیاندان.

سەرەڕای ئەوە، کاتێک ئەم بەها سەربارەکی و ڕەها مێژووییانە لە ڕووی گریمانەوە تاقیدەکەینەوە، ئەوە دەدۆزینەوە، کە لە ڕاستیدا تەواو ڕەگیان لە مێژوودا داکوتاوە. سەرهەڵدانی بەهایەک یانیش ئایدیایەک لە کات و شوێنێکی دیاریکراودا بە هۆی هەلومەرجە مێژووییەکانی کات و شوێنەکەوە روون دەبێتەوە.

نێوەڕۆکی پراکتیکی گریمانە ڕەهاکانی وەک یەکسانی و دادپەروەری یانیش یاسای سروشتی لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی دیکە، یان لە کیشوەرێکەوە بۆ کیشوەرێکی دیکە دەگۆڕێ. هەر گروهێک بەها مێژووییەکانی خۆی هەیە، کە لە مێژوودا ریشە دادەکوتن.

هەر گروهێک لە بەرامبەر خۆتێوەسمینی بەها نامۆو نەگونجاوەکاندا خۆی دەپارێزێت، ئەوەش بە هۆی نازناوە شەرمەزارکەرەکانی وەک بورژوازی و سەرمایەداری، یان نادیموکراتی و توتالیتاری، یان چەمکی هێژ سادەتری وەک- نائینگلیزی و نائەمریکی- جیا دەکرێتەوە.

ئەو بەها، یانیش ستانداردەی لە کۆمەڵگەو مێژوو جیادەبێتەوە بە قەد تاکەکەسێکی ڕووت و

تەنها خەیالاوییە. مێژوونووسی جدی ئەو کەسەیە، کە تایبەتمەندییە مەرجدارەکان لە رووی مێژووییەوە بناسێتەوە، نەک ئەو کەسە بێت، کە لە پشت مێژووەوە لە پێناو بەهاکانیدا چاوەڕوانی بابەتگەرایی دەکات.

ئەو بیروباوەڕانەی بە دەستیان دەهێنن و ئەو ستانداردانەی بڕیاردانیش، کە دایاندەمەزرێنن بەشێکن لە مێژوو، هەروەها بە قەد هەر لایەنێکی دیکەی هەڵسوکەوتی مرۆڤ ئامادەی لێکۆڵینەوەی مێژووییین.

لەم رۆژگارەدا چەند زانستێکی کەم- بە تایبەتی زانستە کۆمەڵایەتییەکان- رەنگە داوای سەربەخۆیی تەواو بکەن، وەلێ مێژوو وابەستەییەکی بنچینەیی بەو شتانەی دەرەوەی خودی خۆیەوە نییە، کە رەنگە ئەم خەسڵەتە لە زانستەکانی تری جیا بکاتەوە.

بوارم بدەن ئەوە کورت بکەمەوە، کە هەوڵم دەدا لە بارەی ئەو بانگەشەیەوە بیڵێم، کە مێژوو بچێتە ریزی زانستەکانەوە. پێشتر واژەی زانست گەلێک لقی جیاوازی مەعریفەی دەگرتەوە، کە کۆمەڵێک تەکنیک و میتۆدی زۆر جیاوازی بەکاردەهێنا. بە شێوەیەک وا دیارە بەرپرسیاریەتی و زەحمەتی زیاتر کەوتبێتە سەر شانی ئەوانەی هەوڵیانداوە مێژوو لە زانست دووربخەنەوە نەک ئەوانەی بە دوای ئەوەدا گەڕاون بیخەنە ناو مێژووەوە.

شتێکی گرنگە، کە بەهانەکانی دوورخستنەوەی مێژوو لە هەوەسی زاناکانەوە سەرچاوەی نەدەگرت بۆ ئەوەی مێژوونووسان لە هاورێیەتی خۆیان دووربخەنەوە، بەڵکو لە هەوەسی مێژوونووس و فەیلەسووفەکانەوە سەرچاوەی دەگرت، کە حەزیان دەکرد پێگەی مێژوو وەک لقێکی ئەدەبیاتە مرۆییەکان بهێڵنەوە.

کێشمەکێشمەکە لەکەدار کردنی دابەشکردنی کۆنی نێوان مرۆڤایەتییەکان و زانست رەنگ دەداتەوە، کە تیایدا وا گریمانکراو مرۆڤایەتییەکان گوزارشت لە کەڵچەرێکی فراوانی چینی فەرمانڕەوا دەکەن، وەلێ زانست وا گریمانکرا بریتییە لە زەبەر بە دەستی ئەو تەکنیک کارانەی، کە خزمەتی ئەو چینە دەکەن. هەردوو وشەی، مرۆڤایەتییەکان و، مرۆیی، خۆیان لەم پەیڤاژوو پاشماوەیەکی زیانی ئەم کۆنە سەردەمە پیرۆزەن؛ هەروەها دژیەکی نێوان زانست و مێژوو جگە لە زمانی ئینگلیزی نەبێت، کە ئاماژە دەکات بە دابڕانێکی سەیری لەکەدار کردنەکە، لە هیچ زمانێکی تردا مانا نادات. گازندەی سەرەکیم دەربارەی رەتکردنەوەی نێونانی مێژوو بە زانست ئەوەیە، کەلەبەری نێوان، دوو چاندنەکە، بەر پاساو دەکات و دەیکاتە شتێکی هەمیشەیی.

خودی کەلەبەرەکە بەرهەمێکی ئەم لەکەدارکردنە کۆنەیەو لەسەر بنچینەی ستراکتۆری چینێکی

کۆمەڵگەی ئینگلیزی دامەزراوە، کە خودی خۆی دەگەڕێتەوە سەردەمی رابردوو؛ من خۆم بەوە قایل نیم، کە ئەو کەلێنەی مێژوونووس لە زەویناس جیادەکاتەوە هیچ لەو کەلێنە قووڵتر یانیش فراوانتر نەبێت، کە زەویناس لە فیزیکناس جیادەکاتەوە. وەلێ بە تێڕوانینی خۆم چاککردنەوەی کەلەبەرەکە بۆ ئەوە نییە زانستی سەرەتایی فێری مێژوونووسان بکرێ یان مێژووی سەرەتایی فێری زاناکان بکرێ. ئەمەش بریتییە لە رێگەیەکی داخراو، کە تیایا هزرکردنێکی سەرلێشێواو پێشەنگیمان دەکات.

سەرەڕای ئەوە، خودی زاناکان بەم شێوەیە هەڵسوکەوت ناکەن.

هەرگیز نەمبیستووە ئەندازیاران ئامۆژگاری بکرێن بۆ ئەوەی لە کلاسە سەرەتاییەکانی رووەکناسی ئامادەبن.

چارەسەرێک، کە رەنگە پێشنیاری بکەم بۆ چاککردنی ستانداردی مێژووەکەمانە- گەر بکرێ بڵێم- بۆ ئەوەی زانستی تر بێت، هەروەها بۆ ئەوەی داواکارییەکانمان لەسەر ئەو کەسانە بەهێزتر بن، کە دوای ئەو کارە دەکەون.

مێژوو وەک دیسپلینێکی ئەکادیمی لەم زانکۆیەدا هەندێک جار وەک سەبەتەیەکی بڵاوکراوەکان سەیری دەکرێت بۆ هەموو ئەوانەی، کە کلاسیک زۆر بە زەحمەت دەزانن و زانستیش زۆر بە جدی دەزانن.

ئەو دابەی ئومێدەوارم، کە لەم گەلاڵە نامانەدا بیگەیەنم ئەوەیە، کە مێژوو بابەتێکی زۆر زەحمەتترە لە وانە کلاسیکییەکان، هەروەها کتوومت بە قەد هەر زانستێکی تر جدیە. وەلێ ئەم چارەسەرە لەوانەیە باوەڕێکی بەهێزتر لە نێوان خودی مێژوونووسەکان لەسەر ئەوەی دەیکەن بسەپێنێ.

سێر کارلس سنۆو لە گەلاڵە نامەیەکی نوێدا دەرباری ئەم بابەتە ئامانجێکی هەبووە، کاتێک دژایەتی گەشبینی، هەڵوەشانەوەی زانایەک دەکات، کە، دەنگێکی کپکراو، و هەستێکی دژە کۆمەلایەتی هەیە، ئەوەی ئەو پێی دەڵێ، رۆشنفکرە ئەدەبییەکان(٩٣).

هەندێک مێژوونووس- تەنانەت- زۆرترینی ئەوانەی بەبێ ئەوەی مێژوونووس بن دەربارەی مێژوو دەنووسن- سەر بەم پۆلەی، رۆشنبیرە ئەدەبییەکانن، ئەوانە زۆر بە سەرقاڵییەوە پێمان دەڵێن، کە مێژوو زانست نییە، هەروەها ئەوە روون دەکەنەوە، کە ناکرێ و نابێ ببێ و ناتوانرێ، بە شێوەیەک بۆ دەستکەوت و توانا شاراوەکانی کاتیان نییە.

رێگەیەکی دیکە بۆ چارەسەرکردنی کەلەبەرەکە بەهێزکردنی تێگەیشتنێکی قووڵترە لە بارەی هاوڕێکی ئامانجی نێوان زاناکان و مێژوونووسەکان؛ ئەمەش بەهایەکی سەرەکی بایەخی نوێ و پەرەسەندنە لە مێژوو- و- فەلسەفەی زانستدا.

زاناكان و زانا كۆمەڵایەتییەكان و مێژوونووسان هەموویان بە یەكەوە لە لقە جیاوازەكانی هەمان توێژینەوە سەرقاڵ دەبن؛ واتە توێژینەوەی مرۆڤ و ژینگەكەی، توێژینەوەی كاریگەرییەكانی مرۆڤ لەسەر ژینگەكەیی و كاریگەری ژینگە لەسەر مرۆڤ.

ئامانجی توێژینەوەكەش هەمان شتە: كە بریتییە لە تێگەیشتنی زیاتری مرۆڤ لە بارەی ژینگەكەیەوەو زاڵبوون بە سەریدا.

پێشینە گریمان و میتۆدەكانی فیزیكناس و زەویناس و دەروونناس و مێژوونووس بە درێژی بە شێوەیەكی فراوان لە یەكتری جیاوازن؛ هەروەها بۆ ئەوەی گریمانەكە زانستیتر بێت، نامەوێ خۆم بە پێشنیاركردنی ئەوەوە بەندیوار بكەم، كە پێویستە مێژوونووس زۆر بە وردی پەیڕەوی میتۆدەكانی زانستی فیزیكی بكات.

بەڵام زانای فیزیكی و مێژوونووس لە ئامانجێكی سەرەكیدا یەكتری دەگرن ئەویش بریتییە لە راڤەكردن، هەروەها لە كردەی سەرەكی پرسیارو وەڵامدا یەكتری دەگرن. مێژوونووسیش وەک هەر زانایەكی دیكە بریتییە لە گیانەوەرێک، كە بە بەردەوامی پرسیاری، بۆچی؟ دەكات، لە گەڵاڵە نامەی داهاتوومدا ئەو شێوازانە تاقی دەكەمەوە، كە مێژوونووس لە میانەیانەوە پرسیار دادەنێت و هەر لە میانەیانەوە هەوڵی وەڵامدانەوەی دەدات.

## چوارەم

# هۆکارلێکدانەوە لە مێژوودا

گەر شیر لە ناو دەس مەنجەڵێکدا دابنێین بۆ ئەوەی بکولێ، ئەوا هەڵدەچێت.

نازانم، و هەرگیزیش نەموویستووە ئەوە بزانم بۆچی ئەو کارە روودەدات؛ گەر ناچاریش ببم، ئەوا لەوانەیە هۆکارەکە بدەمە پاڵ ویستێکی سروشتی هەڵچوون لە شیردا، ئەمەش راستە بەڵام هیچ شتێک راڤە ناکات. کەوابوو من زانایەکی سروشتناس نیم.

بە هەمان شێوە کەسێک دەتوانێ دەربارەی رووداوەکانی رابردوو بخوێنێتەوە، یان تەنانەت بشنووسێ بەبێ ئەوەی بیەوێ بزانێ بۆچی ئەو رووداوانە روویانداوە، یان بەو گووتەیە قایل دەبێ، کە جەنگی جیهانی دووەم بۆیە روویدا چونکە هیتلەر حەزی لە جەنگ بوو، ئەمەش تەواو راستە، بەڵام هیچ شتێک راڤە ناکات.

کەوابوو پێویستە مرۆڤ ئەو هەڵەیە نەکات خۆی بە قوتابییەکی مێژوو یانیش مێژوونووس ناو ببات.

توێژینەوەی مێژوو بریتییە لە توێژینەوەی هۆکارەکان. هەروەک لە کۆتایی دوا گەلاڵەنامەمدا وتم، مێژوونووس بە بەردەوامی دەپرسێت، بۆچی؟؛ مادامێکیش هیوای بە وەڵامێک هەبێت، ناتوانێ ئارام بگرێ.

مێژوونووسی گەورە- یان لەوانەیە پێویست بکا بە شێوەیەکی فراوانتر بڵێم، بیرمەندی گەورە- ئەو کەسەیە، کە دەربارەی شتە نوێکان یانیش لە پەیڤاژوو نوێکاندا بپرسێت، بۆچی؟

هیرۆدۆتسی باوکی مێژوو لە دەسپێکی کارەکەیدا مەبەستەکەی وا پێناسکردووە: مەبەستی بە زیندووهێشتنەوەی کارەکانی بەربەر و یۆنانەکانە، هەروەها بە تایبەتی دوای هەر شتێکی تر ئەوەیە هۆکاری جەنگانی هەریەکەیان لەگەڵ ئەوەیتردا بە دەستەوە بدەم.

هیرۆدوت ژمارەیەکی کەم دەروێشی لە جیهانی کۆندا پەیدا کرد: تەنانەت تیۆسیدیدس بەوە تاوانبار دەکرا، کە چەمکێکی روون و ئاشکرای لە بارەی بە هۆکارکردنەوە نییە[٩٤].

وەلێ کاتێک لە سەدەی هەژدەهەمدا بناخەکانی مێژوونووسینی راڤەکردنی رەخنەیی (Historiography) دادەنران، مۆنتسکیۆ لە کتێبی، لێکۆڵینەوەکان دەربارەی هۆکارەکانی مەزن بوونی رۆمانەکان و سەرهەڵدانیان و شکستهێنیان-دا ئەو بنەمایانە وەک خاڵی دەسپێکردنی کارەکەی وەردەگرێت: هۆکاری گشتی هەن، ئەخلاقی یان سروشتی، ئەمانە کار لە هەموو پادشانشینێک دەکەن، بەرزی دەکەنەوە، دەیپارێزن، یانیش لەبەریەکی هەڵدەوەشێنن؛ بە شێوەیەک هەموو ئەوانەی روودەدەن ملکەچی ئەم هۆکارانەن.

مونتسکیۆ چەند ساڵێکی کەم دواتر ئەم بیرۆکەیەی لە کتێبی رۆحی یاساکاندا گەشەپێداو گشتاندی.

دەڵێ. جێگای پێکەنینە ئەوە گریمان بکەین، کە چارەنووسی کوێرانە دەبێتە هۆی هەموو ئەو رووداوانەی لە جیهاندا دەیانبینین.

مرۆڤەکان بە تەنها لە لایەن فەنتازیاکانیانەوە فەرمانڕەوایی ناکرێن؛ رەفتارەکانیان لە یاسا دیاریکراوەکانەوە یانیش لەو بنەمایانەوە سەرچاوە دەگرن، کە لە سروشتی شتەکانەوە وەرگیراون. نزیکەی ٢٠٠ ساڵ دوای ئەوە، مێژوونووس و فەیلەسووفەکانی مێژوو بە هەوڵی رێکخستنی ئەزموونەکانی رابردووی مرۆڤایەتییەوە سەرقاڵبوون لە میانەی دۆزینەوەی هۆکاری رووداوە مێژووییەکان و ئەو یاسانەیش، کە هەڵیان دەسوورێنن.

هۆکارو یاساکان هەندێک جار وەک زاراوەی تەکنیکی، و هەندێک جار وەک زاراوەی بایەلۆژی، و هەندێک جار وەک زاراوەی ئەودیوو سروشت، و هەندێک جار وەک زاراوەی ئابووری، و هەندێک جار وەک زاراوەی دەروونناسی سەیریان دەکرا.

وەلێ ئەو ئاینزایە قبوولبوو، کە مێژوو لە رێکخەری رووداوەکانی رابردوو لە ریزبەندییەکی رێکوپێکی هۆکارو ئەنجامەکان پێکهاتووە.

ڤۆڵتێر لە گووتارەکەیدا دەربارەی مێژوو بۆ ئینسایکلۆپیدیا نووسیوویەتی: گەر هیچتان نەبێ پێمانی بڵێن جگە لەوەی، کە بەربەرییەک لەسەر کەنارەکانی ئوکسوس و جاکارتادا جێگەی بەربەرییەکی دیکەی گرتۆتەوە، ئایا بە ئێمە چی؟ لە ساڵانی دواتردا وێنەکە تا رادەیەک گۆڕانی بەسەردا هات.

ئەمڕۆکە لەبەر ئەو هۆکارانەی لە دوا گەلاڵەنامەمدا تاووتوێمکردوون چیتر قسە لە بارەی، یاسا مێژووییەکانەوە ناکەم؛ تەنانەت وشەی، هۆکاری بۆتە شتێکی مۆدێل کۆن، تا رادەیەک بە هۆی ئەو گونگگەراییە تایبەتییە فەلسەفییانەوە، کە پێویستیم بەوە نییە تەقە لە دەرگای باسکردنیان بدەم، تا

رادەیەکیش بە هۆی بەندیواری گریمانکراوی لەگەڵ قەزاو قەدەردا، کە لەم ساتەدا باسی دەکەم.

لەبەر ئەوە خەڵکانێک لە مێژوودا لە بارەی، هۆکارەوە قسە ناکەن، بەڵکو لە بارەی، راڤەکردن یان شرۆڤەکردن، یان لە بارەی لۆژیکی رەوشەکە، یان لە بارەی، لۆژیکی ناوەوەی رووداوەکان، (ئەم دەستەواژەیە لە دایسی وەرگیراوە)، یان رەتکردنەوەی ریبازی هۆکارگەرایی (بۆچی روویداوە) لە پێناو بەرژەوەندی ریبازی وەزیفی-دا (چۆن روویداوە)، لەگەڵ ئەوەشدا وا پێدەچێ ئەمە بە شێوەیەکی حەتمی پرسیاری، چۆنیەتی رووداندانەکەش، بگرێتەوە، کە وابوو دەمانباتەوە سەر پرسیاری، بۆچی؟ هەندێک خەڵکی دیکە جیاوازی دەکەن لە نێوان چەشنە جیاوازەکانی هۆکار- ئینجا چ میکانیکی بێت، چ بایەلۆژی بێت، چ دەروونی بێت، و هتد- هەروەها هۆکاری مێژوویی خۆی لە خۆیدا بە کاتیگۆرییەک دادەنێن.

لەگەڵ ئەوەشدا، کە ئەم جیاکردنەوانە تا رادەیەک شەرعین، بەڵام لەوانەیە لەبەر ئەم هۆکارانە جەختکردنەوە لەسەر خەسڵەتە هاوبەشەکانی هەموو چەشنەکانی هۆکار بە سوودتربێ لەو خەسڵەتەی لە یەکتریان جیادەکاتەوە.

من وەک خۆم بە بەکارهێنانی وشەی، هۆکار، بە مانا میللییەکەی قایلّ دەبم و ئەم چاککردنە تایبەتییانە پشتگوێ دەخەم. با بە پرسکردنی ئەوەی مێژوونووس بە پراکتیکی دەیکات دەست پێبکەین کاتێک رووبەڕووی پێداویستی دیاریکردنی هۆکاری رووداوەکان دەبێتەوە.

یەکەم تایبەتمەندی رێبازی مێژوونووس دەهەنبەر پرسی هۆکارەکەی ئەوەیە بە گشتی چەند هۆکارێک بۆ هەمان بوویەر دادەنێت.

رۆژێک لە رۆژان مارشاڵی ئابووریناس ئەوەی نووسی، کە: پێویستە خەڵکی لە رێگەی هەموو هۆو پێناوە گونجاوەکانەوە لە توێژینەوەی کرداری هەر هۆکارێک وشیار بکرێنەوە... بەبێ ئەوەی هۆکارەکانی تری لەگەڵیدا تێکەڵاو دەبن بە بایەخەوە وەربگیرێن[٩٥].

ئەو قوتابییەی لە وەڵامدانەوەی پرسیاری، بۆچی لە ساڵی ١٩١٧دا شۆڕشی رووسیا هەڵگیرسا؟، گەر تەنها هۆکارێک پێشکەش بکات لەوانە بەختدار بێت، کە پلەی سێیەم بە دەست بێنێ.

مێژوونووس لە کۆمەڵێک هۆکاری زۆر دەکۆڵێتەوە. ئەگەر پێویستی بە توێژینەوەی هۆکارەکانی شۆڕشی بەلشەڤی هەبوو، ئەوا رەنگە شکستە یەک بە دوای یەکە سەربازییەکانی رووسیا، و گەندەڵبوونی ئابووری رووسیا لە ژێر سایەی فشاری جەنگ، و چاوەڕوانی کاریگەری بەلشەڤییەکان، و شکستی حکومەتی قەیسەری لە چارەسەرکردنی کێشەی دابەشکردنی زەوی و زاردا، و چڕکردنەوەی پرۆلیتاری هەژارو بەکارهاتوو لە کارگەکانی پترۆگراد-دا، و ئەو راستییەش، کە لینین ئاوەزی خۆی

دەناسی و هیچ کەسێکی تر لە لاکەی دیکە ئەوەی نەدەزانی- بە کورتی، تێکەڵەیەکی ڕەشاوێژی ئابووری و سیاسی و ئایدۆلۆژی و هۆکاری کەسی و هۆکاری ماوە درێژو ماوە کورت، باس بکات.

وەلێ ئەمە بە خێرایی بەرەو تایبەتمەندی دووەمی ڕێبازی مێژوونووسمان دەبات.

ئەو قوتابییەی لە وەڵامی پرسیارەکەماندا بەوە قایل بووبێت کۆمەڵێک هۆکاری شۆڕشی رووسیا یەک بە دوای یەک روون بکاتەوەو بەم شێوەیە بەجێیان بهێڵێ، لەوانەیە پلەی دووەم بە دەست بهێنێت، وەلێ زەحمەتە پلەی یەکەم بە دەست بهێنێت؛ لەوانەیە بڕیاری تاقیکەرەوەکان ئەوەبێ، کە کەسێکی پڕ زانیارییە، وەلێ خەیاڵاوی نییە.

لەوانەیە مێژوونووسی راستەقینە هەست بە زۆرلێکردنکی پیشەیی بکات کاتێک ڕووبەڕووی ئەم لیستەی هۆکارەکانی خۆی دایناون دەبێتەوە بۆ ئەوەی ڕێکیان بخات، پلەدارکردنێکی ئەو هۆکارانەش دابمەزرێنی، کە لەوانەیە پەیوەندییان بە وانی ترەوە بچەسپێنی، و هەروەها بۆ ئەوەی بڕیار لەسەر ئەوە بدات کام هۆکار، یان کام پۆلی هۆکارەکان، پێویستە لە، دوا هەوار، یان، لە شیکاری کۆتایی، (دەستەواژەی کاریگەری مێژوونووسان)دا وەک دوا هۆکار، و هۆکاری گشت هۆکارەکان، گوزارشت بکرێت.

ئەمەش بریتییە لە شرۆڤەکردنی بابەتەکەی؛ مێژوونووس لە میانەی ئەو هۆکارانەوە دەناسرێت، کە شایەتمانیان پێدەدات.

گیبۆن لەبەریەک هەڵوەشان و شکستی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی داوەتە پاڵ سەرکەوتنی بەربەرێزم و ئایینەوە.

مێژوونووسە چاکسازە ئینگلیزەکانی سەدەی نۆزدەهەم سەرهەڵدان و سەرکەوتنی دەسەڵاتی بەریتانیایان داوەتە پاڵ پەرەسەندنی ئەو دەزگا سیاسیانەی بنەماکانی ئازادی دامەزراوەییان بەرجەستە دەکرد.

ئەمرۆکە گیبۆن و مێژوونووسە ئینگلیزەکانی سەدەی نۆزدەهەم وەک مۆدێل کۆن سەیر دەکرێن، چونکە ئەو هۆکارە ئابوورییانەیان پشتگوێ خستووە، کە مێژوونووسە هاوچەرخەکان لە پێشەنگی هۆکارەکانیان دادەنێن.

هەر تاووتوێیەکی خولیای پرسی دەسادەیی هۆکارەکانە. هنرێ پونکارێ، لەو کتێبەدا، کە لە دوا گەلاڵەنامەمدا چەند بڕگەیەکم لێ وەرگرتووە، تێبینی ئەوەی کردووە: زانست لە هەمان کاتدا بە ئاراستەی جۆراوجۆرگەرایی و ئاڵۆزیەتی، و، بە ئاراستەی چوونیەکی و سادەییەوە، پێشکەوتووە، ئەمەش ئەو پرۆسێسە دژیەک و دوو لایەنەیە، کە مەرجێکی پێویستی مەعریفە بووە[٩٦].

ئەم تێبینییە لە بارەی مێژووشەوە هەر راستە.

مێژوونووس لە میانەی فراوانکردن و قووڵکردنەوەی توێژینەوەکەی بە بەردەوامی وەڵامی زیاتر دەربارەی پرسیاری، بۆچی؟، کەڵەکە دەکات.، پەرەسەندنی ئەم ساڵانەی دوایی هەریەک لە مێژووی ئابووری، و کۆمەلایەتی و کلتووری و یاسایی- نەک باسکردنی تێڕوانینە نوێکان دەربارەی ئاڵۆزییەکانی مێژووی سیاسی، و تەکنیکە نوێکانی دەروونناسی و سەرژمێری- بەبێ شوومـاری ژمارەو بواری پرسیارەکانمانی زیاد کردووە.

کاتێک بێتراند رووسڵ سەرنجیدا، کە: هەر پێشکەوتنێک لە زانستدا زیاتر لەو چوونییەکە سەرەتاییانە دوورمان دەخاتەوە، کە یەکەم جار لە جیاکردنەوەیەکی گەورەتری پێشینەو پاشینەو لە بازنەیەکی هەمیشە فراوانتری پێشینە جیاکراوەکان (ناسراوەکان) وەک شتێکی بەندیوار بە بابەتەکەوە، تێبینی دەکرێن[٩٧]، ئەو بە وردی رەوشەکەی لە مێژوودا وەسف کردووە.

وەلێ مێژوونووس بە هۆی پێداگرتنییەوە لە تێگەیشتنی رابردوو لە هەمان کاتدا بە شێوەی زانا ناچار دەبێت فرەیی وەڵامەکانی سادە بکات و هەر وەڵامێک بکاتە پاشکۆی ئەوەی دیکەیان، هەروەها ناچارە پێڕەوییەک و چوونیەکییەک بە پاشاگەردانی رووداوەکان و پاشاگەردانی هۆکارە تایبەتییەکان ببەخشێت. خودایەک، و یاسایەک، و رەگەزێک، و رووداوێکی دوور لە دەستی خودا؛ یان داواکەی هنری ئادەمز بۆ، گشتاندنێکی گەورە، کە رەنگە خرۆشانی مرۆڤ تەواو بکات بۆ ئەوەی ببێتە رۆشنبیر[٩٨] ئەمانە لەم رۆژگارەدا وەک کۆمەڵە نووکتەیەکی مۆدێل کۆن ئاماژەیان پێدەدرێ.

وەلێ ئەوە بە راست دەمێنێتەوە، کە پێویستە مێژوونووس لە میانەی سادەکردن، و لە میانەی فرەکردنی هۆکارەکانەوە کاربکات.

مێژوو وەک زانست لە رێگەی ئەم رەوش دوو لایەن و بە رووکەش دژیەکەوە پێش دەکەوێ.

لێرەدا پێویستە بە ناچاری لە بابەتەکە لابدەم و لە دوو بابەتی نابەندیوار بە کارەکەوە بکۆڵمەوە، کە سەرنجمان بە لایەکی تردا دەبەن- یەکێکیان بریتییە لە، قەزاو قەدەر لە مێژوو-دا؛ یان نەگریسی هیگل؛ ئەوەی دیکەیان بریتییە لە، رێکەوت لە مێژوو-دا؛ یان، دەمی کلیۆپاترا، پێش هەموو شتێک پێویستە وشەیەک یا دوو وشە دەربارەی چۆنییەتی پەیدابوونیان بڵێم.

لە ١٩٣٠-یەکاندا پرۆفیسۆر کارل پۆپەر لە ڤیەنادا پەرتووکێکی سەنگینی دەربارەی تێڕوانینی نوێ لە زانستدا نووسی (بەم دواییانە لە ژێر ناوونیشانی لۆژیکی لێکۆڵینەی زانستی وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئینگلیزی)، لە ماوەی جەنگدا دوو پەرتووکی خودان تایبەتمەندییەکی میللیتر بە زمانی ئینگلیزی بڵاوکرانەوە: کۆمەڵگەی کراوەو دوژمنەکانی هەروەها نەداری هیستۆریسیزم[٩٩].

ئەم دوو پەرتوکانە لە ژێر کاریگەرییەکی سۆزاوی بەهێزی دژ بە کاردانەوەی هیگڵ، سەرەڕای

ئەفلاتوون، نووسراون، کە وەک پێشینەیەکی رۆحی ناتسیزم مامەڵەیان لەگەڵدا کردووە، هەروەها دژی ئەو مارکسیەتە روو کەشەن، کە بریتی بوو لە سیاسەتی چەپی بەریتانی لە ۱۹۳۰-یەکاندا، ئامانجە سەرەکییەکان بە گوێرەی گووتەی پۆپەر فەلسەفە حەتمییەکانی مێژووی هیگڵ و مارکس بوونە، کە بە یەکەوە لە ژێر ناوو ناتۆرەی خەجاڵەتباری هیستۆریسیزم کۆکراونەتەوە[۱۰۰].

سێر ئیسیاھ بێرلین لە ساڵی ١٩٥٤-دا گووتارێکی دەربارەی، حەتمییەتی مێژووی، بڵاوکردەوە.

ئیسیاھ هێرشکردنە سەر ئەفلاتوونی وەستاند، لەوانەیە لەبەر رێزگرتنی مانەوەی ئەو کۆڵەکە کۆنەی دامەزراوەی ئۆکسفۆرد بێت[۱۰۱]؛ هەروەها ئەو بەهانەیە دەخاتە سەر تۆمەتبارکردنەکە، کە لە پەرتووکی پۆپەردا نابینرێت، ئەویش ئەوەیە دەڵێت، Historicism»-ی هیگڵ و مارکس جێگای گازندەیە چونکە لە میانەی راڤەکردنی کردەوەکانی مرۆڤ بە زاراوەی هۆکاربەندییەوە بە شێوەیەکی شاراوە، ئاماژە دەدات بە رەتکردنەوەیەکی ویستی سەربەستی مرۆڤ، هەروەها مێژوونووسان بۆ راکردن لە ئەرکی گریمانکراوی خۆیان هاندەدات (کە لە دوا گەلاڵەنامەکەمدا قسەم لە بارەیەو کرد) بۆ ئەوەی مەرجی ئەخلاقی لە بارەی شارلەمان و ناپلیۆن و ستالینی مێژوو ئاشکرا بکەن.

بەم شێوەیە زۆر نەگۆڕاوە، وەلێ سێر ئیسیاھ بەرلین نووسەرێکی شایان بە خۆیەتی و بە شێوەیەکی فراوانیش شتەکانی دەخوێنرێنەوە. لە ماوەی ئەم پێنج شەش ساڵەی رابردوودا تا رادەیەک هەریەکێک لەم وڵاتەدا یان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، گووتارێکی دەربارەی مێژوو بنووسیایە، یان تەنانەت تێڕوانینێکی جدی دەربارەی کارێکی مێژوویی بنووسیایە، ئەوا گاڵتەیەکی لووتبەرزانەی بە هیگڵ و مارکس و بە حەتمییەت دەکرد، هەروەها ئاماژەی بە گاڵتە بازاڕی وازهێنان لە دانان بە رۆڵی رێکەوت لە مێژوودا دەکرد.

رەنگە ستەم بێت بەرپرسیارییەتی دەرویشەکانی سێر ئیساھ بخرێتە ئەستۆی ئەو.

تەنانەت کاتێک قسەی بێ ماناش دەکات، بە هۆی دووانی لەو بارەیەوە بە شێوازێکی دڵبەرو سەرنجڕاکێش شایانی لێبووردنی ئێمەیە.

ئەو دەرویشانەی شتە بێ ماناکان دووبارە دەکەنەوەو ناتوانن بیکەنە شتێکی سەرنجڕاکێش.

ئەوا بە هەرحاڵ هیچ شتێکی نوێ لەمەدا نییە.

کارلس کینگسلی، کە پرۆفیسۆرێکی زۆر بەناوبانگی شاهانەی مێژووی هاوچەرخمان نییە، رەنگە هەرگیز هیگڵی نەخوێندبێتەوە یانیش لە بارەی مارکسەوە نەیبیستبێت، بەڵام لە دەستپێکی گەلاڵەنامەکەیدا لە ١٨٦٠-ەکاندا لە بارەی، هێزی مرۆڤی نهێنی ئامێز لە شکاندنی یاساکانی بوونی خۆی» قسەی کردووە، وەک بەڵگەیەک، کە دەڵێ ناتوانرێ، دەرئەنجامی حەتمی» لە مێژوودا هەبێت[۱۰۲].

وەلێ لە سایەی بەختەوەیە کینگسلی-مان لە یادکردووە. پرۆفیسۆر پۆپەرو سێر ئیسیاه بێرلین لە نێوان خۆیاندا ئەم کۆششە بە هەدەرچووانەیان بۆ دیاردەیەکی ژیانی زیندوو گێڕایەوە؛ هەروەها بۆ لابردنی شێواویەکە ئارامگرتنێک پێویستە.

کەوا با یەکەم جار قەزاو قەدەر (determinism) وەربگرم، کە بەو بیروباوەڕە پێناسی دەکەم هەر شتێک رووبدات هۆکارێک یان چەند هۆکارێکی هەیە، وەلێ هیوام وایە لە شێوەی مشتومڕدا نەبێت، هەروەها ناکرێت بە شێوەیەکی جیاواز رووبدات مەگەر چەند شتێک لە رووی هۆکارێک یانیش هۆکارەکانەوە جیاوازبن[١٠٣].

قەزاوقەدەر دۆزێکی مێژوو نییە، بەڵکو دۆزی تەواوی هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤە.

ئەو مرۆڤەی کردەوەکانی بێ هۆکارن بە شێوەیەک هۆکارەکان دیاری نەکراو بن ئەوا مرۆڤ وەک تاکەکەسێکی تەنهایە لە دەرەوەی کۆمەڵگەدا، هەروەک لە گەلاڵەنامەی پێشتردا تاووتوێمان کرد.

جەختکردنی پرۆفیسۆر پۆپەر ئەوەیە، هەموو شتێک لە بواری کاروبارەکانی مرۆڤدا شیاوە[١٠٤].

ئینجا ئەم جەختکردنەوەیە چ بێ مانا بێ چ هەڵە بێت، هیچ کەسێک لە ژیانی رۆژانەدا نە باوەڕ بەمە دەکات و نە دەشتوانێ باوەڕی پێبکات.

ئەو راستییە حاشا هەڵنەگرەی دەڵێ هەموو شتێک هۆکارێکی هەیە بریتییە لە مەرجێکی توانای ئێمە بۆ تێگەیشتن لەوەی لە دەوروبەرماندا بەردەوامە[١٠٥].

چەشنی میردزمەی رۆمانی کافکا دەکەوێتە چوارچێوەی ئەو راستییەوە، هەر شتێک رووبدات هۆکارێکی روون و ئاشکرایی نییە، یان هیچ هۆکارێک ناتوانرێ دڵنیابوونەوەی لە بارەوە ئەنجام بدرێ: ئەمەش دەبێتە هۆی لەبەریەک هەڵوەشاندنی سەرلەبەری کەسایەتی مرۆڤ، کە لەسەر ئەو گریمانە بنیادنراوە، دەڵێ رووداوەکان هۆکاریان هەیە، هەروەها دەڵێ تەواوی ئەم هۆکارانە ئامادەگی دڵنیابوونەوەیان هەیە بۆ ئەوەی لە ئاوەزی مرۆڤدا نموونەیەکی تەواو بەندیوار لە بارەی ئێستاو رابردوو دروست بکەن بە شێوەیەک وەک رێبەرێکی کردەکە بەکاربهێنرێ.

لەوانەیە ژیانی رۆژانە شتێکی حەتمی بووایە مەگەر یەکێک گریمانی ئەوەی نەکردبایە، کە ئاکارو رەوشتی مرۆڤ بە هۆی ئەو هۆکارانەوە دیاریکراوە، کە لە بنچینەدا ئامادەگی لێ دڵنیابوونەوەیان هەیە.

جاری جاران خەڵکانێک بە کفر لە توێژینەوەی هۆکاری دیاردە سروشتییەکان دەگەیشتن، چونکە پێیان وابوو ئەم دیاردانە لە لایەن ویستی یەزدانەوە هەڵدەسوورێندرێن.

گازەندە کردنی سێر ئیسیاه بەرلین لە بەرامبەر راڤەکردنەکەماندا، بۆچی مرۆڤەکان ئەوەی

کردوویانە دەیکەن، لەسەرئەو بنەمایەی ئەم ئاکارانە لە لایەن ویستی مرۆڤەوە هەڵدەسووڕێندرێن، بۆ هەمان سیستەمی ئایدیاکان دەگەڕێتەوە، و لەوانەیە ئاماژەش بەوە بدات، کە ئەمڕۆکە زانستە کۆمەڵایەتییەکان لە هەمان قۆناغی پەرەسەندندان، هەروەک زانستە سروشتییەکان بڕیویانە کاتێک ئەم جۆرە بیانووانەیان ئاراستە دەکرا. با سەیرکەین چۆن چۆنی لە ژیانی رۆژانەدا هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم پرسەدا دەکەین.

هەروەک بە دوای کاروباری رۆژانەتدا دەگەڕێیت، خوو بەوەوە دەگری بەردەوام بگەیتە سمیت. بە زمانێکی نەرم و نیان ئەحواڵ پرسییەکی دەربارەی کەش و هەوا، یان دەربارەی رەوشی کۆلێژ یا کاروبارەکانی زانکۆ لێدەکەیت، بەڵام ئەمە شتێکی بێ ئامانجە؛ لە بەرامبەردا سمیت بە هەمان بێ مەبەستی و هەمان نەرم و نیانییەوە تێبینییەکە دەربارەی کەش و هەوا یا کاروبارەکان وەڵامدەداتەوە.

وەلێ وا دەبینێ بەیانییەک سمیت لە جیاتی ئەوەی ئەحواڵ پرسینەکەت بە شێوازە ئاساییەکەی وەڵام بداتەوە، رەخنەیەکی توندی گاڵتەجاڕی ئاراستەی سیما، یا تایبەتمەندی کەسیەتییەکەت دەکات، ئایا ئەوسا بەوە قایل دەبی شانەکانت هەڵتەکێنی، و ئەم کارە وەک بەڵگەیەکی قایلکەری ویستی سەربەستی سمیت سەیر بکەی، هەروەها وەک ئەو راستییە سەیری بکەی هەموو شتێک لە کاروباری مرۆڤدا شیاوە؟ گومان دەبەم نەخێر، بەوە قایل نابێت.

بە پێچەوانەوە لەوانەیە چەند دەستەواژەیەکی لەم چەشنەی خوارەوە بووروژێنێ: «سمیتی هەژار! بێگومان دەزانی باوکی لە تیمارستانێکی عەقڵدا کۆچی دوایی کردووە، یان» سمیتی هەژار! پێویستە چەرمەسەرییەکی زۆرتری لەگەڵ ژنەکەیدا هەبووبێ؛ بە مانایەکی دیکە، لەوانەیە هەوڵبدەی هۆکاری بە رووکەش بێ هۆکاری هەڵسوکەوتی سمیت بە بەڵگەی تەواو دیاری بکەیت، بە شێوەیەک بگەیتە ئەو دەرئەنجامەی پێویستە هۆکارێک هەبێت.

بەم شێوەیە لەوانەیە لە میانەی بە دەستەوەدانی راڤەکردنێکی هۆکارگەرایی هەڵسوکەوتی سمیت دووچاری تووڕەیی سێر ئیسیاه بەرلین ببێتەوە، کە بە توندی سکاڵای ئەوە دەکات گریمانی قەزاو قەدەری هیگڵ و مارکست بە ئاسانی باوەڕکردووەو لە ئەرکەکەی خۆت دوورکەوتوویتەوە بۆ ئەوەی سمیت وەک دەبەنگێک تۆمەتبار بکەیت. وەلێ هیچ کەسێک لە ژیانی رۆژانەدا ئەم تێڕوانینە بە هەند وەرناگرێت، یان ئەوە گریمان بکات، کە چ قەزاو قەدەر چ بەرپرسیارییەتی ئەخلاقی لە سەنگی مەحەکدان بە لای دۆڕان و بردنەوەدا.

تەنگژەی لۆژیکی تایبەت بە ویستی سەربەست و قەزاو قەدەر لە ژیانی راستەقینەدا روونادات.

ئەمەش مانای ئەوە نییە، کە هەندێک کردەوەکانی مرۆڤ سەربەستن و هەندێکی تریشیان سنووردارکراون. بەڵکو راستییەکەی ئەوەیە تەواوی کردەوەکانی مرۆڤ وەک یەک سەربەست و سنووردارن، ئەمەش دەکەوێتە سەر تێڕوانینی ئەو مرۆڤەی لێیان دەکۆڵێتەوە.

دووبارە پرسە پراکتیکییەکە شتێکی جیاوازە.

کردەوەکەی سمیت هۆکارێک، یان ژمارەیەک هۆکاری هەبووە؛ وەلێ ئەوەندەی بە هۆی هەڵسوکەوتی کەسییەتی خۆیەوە بووە، ئەوەندە بە هۆی ناچارکردنێکی دەرەکییەوە نەبووە، بە شێوەیەک لە رووی ئەخلاقییەوە بەرپرسیار بووە، چونکە ئەوە مەرجێکی ژیانی کۆمەڵایەتییە، کە مرۆڤە پێگەیشتووەکان لە رووی ئەخلاقییەوە لە کەسایەتی خۆیان بەرپرسیارن. وەلێ ئایا لەم حاڵەتە تایبەتییەدا بەرپرسیاریەتی کردنی کێشەیەکە دەهەنبەر بڕیاردانی پراکتیکیت.

وەلێ گەر ئەمەش بکەی مانای ئەوە نییە، کە کردەوەکەی ئەوت بەبێ هۆکار داناوە: چونکە هۆکارو بەرپرسیارییەتی ئەخلاقی دوو کاتیگۆری جیاوازن.

بەم دواییانە دامەزراوەیەک و کورسییەکی تاواناسی لەم زانکۆیەدا دامەزران.

بە دڵنیاییەوە وا هەست دەکەم هیچ یەکێک لەوانەی بایەخ بە لێکۆڵینەوەی هۆکارەکانی تاوان دەدەن ئەوە گریمان ناکەن، کە ئەم کارە وای لێکردوون بەرپرسیارییەتی ئەخلاقی تاوانبارەکە رەتبکەنەوە.

با هەنووکە بڕوانینە مێژوونووس.

مێژوونووس وەک مرۆڤێکی رەشۆکی باوەڕ بەوە دەکات کردەوەکانی مرۆڤ خودانی ئەو هۆکارانەن، کە لە بنچینەدا دەشێ لێیان دڵنیا ببینەوە.

لەوانەیە مێژوو بە چەشنی ژیانی رۆژانە شتێکی ئەستەمبووایە گەر ئەم گریمانەیە بە ئەنجام نەگەیەندرابایە.

ئەرکێکی تایبەتی مێژوونووسە لەم هۆکارانە بکۆڵێتەوە. رەنگە هەندێک کەس پێیان وابێ ئەم کارە لە لایەنێکی دیاریکراوی ئاکاری مرۆڤدا گرنگییەکی تایبەتی دەبەخشێتە مێژوونووس: بەڵام ویستی سەربەست رەت ناکاتەوە مادامێک ئەو گریمانە بەرگری لێنەکراوە بڵێ کردەوە خۆویستەکان هۆکاریان نییە.

بە هەمان شێوە مێژوونووس بە هۆی پرسی حەتمییەتیشەوە دڕدۆنگ نابێ.

مێژوونووسان وەک خەڵکانی دیکە، هەندێک جار زمانی رەوانبێژی بەکاردەهێنن، هەروەها وەک شتێکی، حەتمی، لە بارەی رووداوێکەوە قسە دەکەن لە کاتێکدا تەنها مەبەستیان ئەوەیە هاوکاتی

هۆکارەکانی وایان لە مرۆڤ کردووە پێشبینی ئەوە بکات بێ رادە بەهێز بووە.

بەم دواییانە بۆ وشەیەکی ورووژێنەر تەواوی مێژووەکەم گەڕام، وەلێ ناتوانم بە تەواوی ئەستۆ پاکی بە خۆم ببەخشم: لە بڕگەیەکدا نووسیوومە دوای شۆڕشی ١٩١٧ بە یەکدادانی نێوان بەلشەڤییەکان و هەوادارانی کڵێسەی ئەرتەدۆکسی شتێکی، حەتمی، بوو.

گومانی تێدا نییە عاقڵانەتر دەبوو گەر بمانووتبایە، زۆر پێدەچێ، وەلێ ئایا بە راستکردنەوەی فکرەیەکی پێدانتیکانە دەمبوورن؟ مێژوونووسەکان بە شێوەیەکی پراکتیکی ئەوە گریمان ناکەن، کە رووداوەکان پێش ئەوەی رووبدەن شتێکی حەتمین.

مێژوونووسەکان بە شێوەیەکی بەردەوام لەسەر بنەمای ئەو گریمانەی دەڵێ هەڵبژاردنەکان والابوونە ئەو رێڕەوە جێکارانە تاووتوێ دەکەن، کە لە چیرۆکدا بۆ ئەکتەرەکان فەراهەمن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە شێوەیەکی راست و دروست ئەوە راڤە دەکەن بۆچی لە سەرەنجامدا رێڕەوێک لە بری رێڕەوێکی تر هەڵبژێراوە.

هیچ شتێک لە مێژوودا حەتمی نییە، مەگەر بەو مانا شکلییە نەبێت، کە ئەگەر بە جۆرێکی تر روویاندابێت، ئەوا پێویستە هۆکارە بەرایییەکانیش جیاوازبووبن.

من وەک مێژوونووسێک ئامادەیی تەواوم هەیە واز لە هەریەک لەم وشانە بهێنم: «حەتمییەت، Unavoidable، inescapable، هەروەها تەنانەت، ineluctable.

لەم رەوشەدا ژیان دەبێتە شەوەزەنگ، بەڵام ئێمە بۆ هۆزانڤانان و میتافیزیکناسەکان بەجێیان دەهێڵین. ئەم تۆمەتی حەتمییەتە بێ ئامانجی و نەزۆکییەکی زۆر دەردەخا، هەروەها لەم ساڵانەی دواییدا بە هۆی ئەم تۆمەتەوە رەخنەو توندوتیژیەکی گەلێک زۆر درێژەیان هەبوو، بە شێوەیەک پێم وایە دەبێت بە دوای پاڵنەرە شاراوەکانی دوای ئەم تۆمەتەدا بگەڕێین.

گومان دەبەم سەرچاوەی سەرەکی ئەم تۆمەتی حەتمییەتە ئەوەبێ، کە پێی دەوترێ، قوتابخانەی هزری- ئەگەرو مەگەر- یان بە شێوەیەکی دروستتر ئەوەی پێی دەوترێ قوتابخانەی سۆزداری.

ئەم قوتابخانەیەش تا رادەیەک بە تەنها خۆی بە مێژووی هاوچەرخەوە دەلکێنێ.

ساڵی رابردوو لە زانکۆ کێیمبرجدا لێدوانێکی یەکێک لە کۆمەڵگاکانم بینی لە ژێر ناوونیشانی، ئایا شۆڕشی رووسی شتێکی حەتمی بوو؟ دڵنیام لەوەی ئەو لێدوانە وەک لێدوانێکی جدی مەبەستدار بووە.

وەلێ ئەگەر لێدوانێکت لەم بارەیەوە بینی، ئایا جەنگی گوڵەکان حەتمی بووە؟ لەوانەیە بە خێرایی گومانی نوکتەیەک بەری.

مێژوونووس دەربارەی داگیرکردنی نۆرمان یان جەنگی سەربەخۆیی ئەمریکا بە شێوەیەک دەنووسێت وەک بڵێی ئەوەی روویدا لە راستیدا پێویست بوو رووبدات، هەروەها وەک بڵێی مێژوونووس ئەرکی خۆیەتی بەم شێوە سادەییە ئەوەی روویداوەو بۆچی روویدا راڤە بکات؛ هەروەها کەس بەوە تاوانباری ناکەن خۆی دیتێرمینیستە و لەوەدا شکستی هێناوە ئەو ئەگەرە جێکارانە تاووتوێ بکات، ئەی ئەگەر بهاتایەو ولیەمی رزگارکەر یان هەڵگەڕاوەکان تێکبشکانایە.

هەر چۆنێک بێت، کاتێک بە وردی بەم شێوازە دەربارەی شۆڕشی ١٩١٧- رووسیام دەنووسی- تاکە شێوازی راستەقینەی مێژوونووسانەی- خۆم لە ژێر هێرشی رەخنەگرەکانمدا بینییەوە بەو بیانووەی بە شێوەیەکی شاراوە ئەوەی روویداوە وەک شتێک وەسفم کردووە کە پێویست بوو رووبدات، هەروەها لەبەرئەوەی بە وردی چاوم نەبڕیبوویە هەموو ئەو شتانەی دیکە، کە لەوانە بوو رووبدەن.

هەندێک کەس دەڵێن با وا دابنێین، ئەگەر ستۆلیپن کاتی هەبووایە چاکسازی زەوی و زار تەواو بکات، یان ئەگەر رووسیا نەڕۆیشتبایە جەنگ، لەوانەیە شۆڕش رووی نەدابایە؛ یان ئەوە گریمان بکە، کە ئەگەر حکومەتی کێرنسکی چاکەی بکردایە، هەروەها گەر بهاتایەو لە جیاتی بەلشەڤییەکان مەنشەڤییەکان یاخود شۆڕشگێرە کۆمەڵایەتییەکان سەرکردایەتی شۆڕشیان بە دەستەوە بگرتایە.

ئەم گریمانانە لە رووی تیۆرییەوە دەشێ وێنا بکرێن؛ هەروەها هەمیشە مرۆڤ دەتوانێ بە ئەگەرو مەگەرەکانی مێژوو یاری ناو ماڵ بکات.

وەلێ ئەم گریمانانە هیچ پەیوەندییەکیان بە قەزاو قەدەرەوە نییە؛ ئەوەی لەسەر باوەڕدار بە قەزاو قەدەر پێویستە وەڵامی بداتەوە ئەوەیە ئەو شتانەی پێویستە رووبدەن هەروەها پێویستە هۆکارەکانیشیان جیاوازبن.

بەم پێودانگە هیچ پەیوەندییەکیان بە مێژووەوە نییە.

خاڵی مەبەست ئەوەیە ئەمڕۆکە هیچ کەسێک بە جدی حەز ناکا دەرئەنجامەکانی داگیرکردنی نۆرمان یاخود سەربەخۆیی ئەمەریکا پێچەوانە بکاتەوە، یان نارەزاییەکی توند لە دژی ئەم رووداوانەدا دەربڕێ؛ هەروەها هیچ کەسێک نابێتە رێگر کاتێک مێژوونووس ئەم رووداوانە وەک بەشێکی داخراو سەودا دەکات.

بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەوانەی راستەوخۆ یانیش بە لە بڕی دانان لە دەرەنجامەکانی سەرکەوتنی بەلشەڤییەکان تووشی هاتوون، یان لە دەرئەنجامە دوورترەکانیشی ترسیان هەیە، ئارەزوویان لەوەیە نارەزاییەکانیان لە دژی ئەو سەرکەوتنە تۆمار بکەن؛ ئینجا کاتێک ئەمان مێژوو دەخوێننەوە ئەم کارە شێوەیەکی خراپی خەیاڵکردنیان وەردەگرێت دەربارەی هەموو ئەو شتە گونجاوانەی لەوانە بوو رووبدەن،

هەروەها ئەم کارە لە بەرامبەر ئەو مێژوونووسەی بە ئارامی لەسەر کارەکەی بەردەوام دەبێت لە بارەی راڤەکردنی ئەوەی روویداوەو بۆچی خەون و ویستەکانیان نایەنەدی- شێوەی گلەیی و گازەندەیەک وەردەگرێ. دردۆنگی مێژووی هاوچەرخ لەوەدایە خەڵکی ئەو کاتەیان بیردەکەوێتەوە، کە هێشتا هەڵبژاردن و ویستەکان سەربەستبوون؛ هەروەها بە ئەستەمی دەزانن هەڵوێستی ئەو مێژوونووسە هەڵبژێرن، کە بە هۆی ئەمری واقیعەوە هەڵبژاردنی ویستەکانی لە بەردەمدا داخستوون.

ئەمەش بریتییە لە کاردانەوەیەکی سەد دەر سەد سۆزداری و نامێژوویی.

وەلێ ئەمە زۆرترین بڕی سووتەمەنی بۆ ئەم شالاوە نوێیە لە دژی ڕێبازی گریمانکراوی، حەتمییەتی مێژوویی، دەستەبەر دەکات.

با بۆ هەتا هەتایە خۆمان لەم بابەتە لابەلایە رزگار بکەین. سەرچاوەیەکی تری هێرشەکە بریتییە لە خاچە نێودارەکەی لووتی کلیۆپاترا.

ئەمەش بریتییە لەو تیۆرەی بە شێوەیەکی گشتی مێژوو بە بەشێک لە ڕێکەوتەکان، و زنجیرەیەک رووداوی سنووردار بە هۆی ڕێکەوتی خۆوبەختەوە، دادەنێت، هەروەها دەڵێ ئەمانە تەنها بە هۆی هۆکاری ڕێکەوتەوەن.

دەرئەنجامی جەنگی ئاکتیوم بە هۆی جۆری ئەو هۆکارانەوە نەبوو، کە مێژوونووسان گریمانیان دەکرد، بەڵکو بە هۆی حەزکردنی ئەنتۆنی بوو لە کلیۆپاترا.

کاتێک باجزت بە هۆی تووشبوونی بە نەخۆشی جومگەکانەوە (gout) نەیتوانی بەرەو ناوەڕاستی ئەوروپا بکشێت، گیبۆن تێبینی ئەوەی کرد، تووشهاتنی مەزاجی مرۆڤێک بە نەخۆشییەکی توند لەوانەیە ڕێگە لە پەژارەی چەندین نەتەوە بگرێت یان دوای بخات[١٠٦].

کاتێک ئەسکەندەر پاشای یۆنانی لە پایزی ١٩٢٠-دا بە هۆی قەپی مەیموونێکی متووبوو (pet) گیانی لە دەستدا، ئەم رووداوە زنجیرەیەک رووداوی لێکەوتەوە بە شێوەیەک بوونە هۆی ئەوەی وینستۆن چەرچلی تێبینی ئەوە بکات، کە چارەکە ملیۆنێک کەس بە هۆی قەپی ئەم مەیموونەوە مردن[١٠٧]. یان دووبارە لێدوانەکەی ترۆتسکی دەربارەی ئەو حەمە ماڵتە نارەحەتەی لە کاتی راوکردنی مراوییە کێویدا دووچاری هات وەک نموونەیەک وەربگرە، ئەم حەمە ماڵتەیە لە ساتێکی هەرە گرنگی هەرا هەراکەی ترۆتسکی دابوو لە پاییزی ١٩٢٣- لەگەڵ هەریەک لە زینۆڤیف و کامینیف و ستالین-دا: مرۆڤ دەتوانێ بەربینی شۆڕشێک یاخود جەنگێک بکات، بەڵام مەحاڵە بتوانێ بەربینی دەرئەنجامەکانی گەشتێکی پاییزە بکات لە پێناو راوە مراوی کێویدا[١٠٨].

یەکەم شت، کە پێویستە روون بکرێتەوە ئەوەیە ئەم پرسە هیچ پەیوەندییەکی بە دۆزی

قەزاوقەدەرەوە نییە.

شەیدابوونی ئەنتۆنی بە کلیۆپاترا، نەخۆشی جومگەی باجزت، یان لەرزووتای ترۆتسکی، کتومت لە رووی هۆکارەوە بە ئەندازەی هەر شتێکی دیکە سنووردار بوونە، کە روودەدات.

شتێکی زۆر بێهوودەیە لەمەڕ جوانی کلیۆپاترا ئەوە پێشنیار بکەین، کە شەیدابوونی ئەنتۆنی بێ هۆکار بووە.

هەروەک لە ژیانی رۆژانەدا تێبینی دەکەین، پەیوەندی نێوان نێرو جوانی مێ یەکێکە لە ئاساییترین سەرەنجامەکانی هۆ و ئەنجام.

ئەم رێکەوتە رووداوانە لە مێژوودا گوزارشت لە زنجیرەیەک سەرەنجامی هۆ و ئەنجام دەکەن، بە شێوەیەک ئاستەنگ دەخەنە بەردەم ئەو سەرەنجامەی، کە مێژوونووس بە شێوەیەکی سەرەکی خوازیاری ئەوەیە لێی بکۆڵێتەوە- هەروەها گەر دەستەواژەیەکی رەوابێ لەگەڵ هەمان سەرەنجامدا بە یەکتریدا دەدەن.

لە راستیدا بیری لە جێگای خۆیدا لە بارەی بەیەکدادانێکی نێوان دوو زنجیرە هۆکارگەرایی سەربەخۆدا قسە دەکات(١٠٩) سێر ئیسیاه بێرلین گووتارەکەی لە بارەی حەتمییەتی مێژووییەوە بە ستایشکردنی بابەتێکی بێرنارد بێرنسن دەست پێدەکات، کە ئەو بابەتە دەربارەی، تێڕوانینی رێکەوت بەندییە لە مێژوودا، یەکێکە لەوانەی رێکەوت بەم مانایە لەگەڵ بەرپێواربوونی چارەنووسسازی هۆکاربەندی تێکەڵاو دەکات. وەلێ جیا لەم تێکەڵاوکردنە، پرسێکی راستەقینەمان هەیە. ئەویش ئەوەیە چۆن دەتوانین سەرەنجامێکی تۆکمەی هۆ و ئەنجامەکان لە مێژوودا بدۆزینەوە، هەروەها چۆن دەتوانین هەر مانایەک لە مێژوودا بدۆزینەوە، کاتێک لە هەر چرکەساتێکدا ریزبەندییەکەمان بە هۆی ریزبەندییەکی ترەوە دووچاری تێکشکان یاخود لە رێڕەولادان ببێتەوە؟، ئەمەش لە تێڕوانینی ئێمەدا پەیوەندی بە بابەتەکەوە نییە.

رەنگە لە پێناو تێبینی کردنی بنەچەکی ئەم رشتبوونە بەربڵاوە تازەیە لەسەر رۆڵی رێکەوت لە مێژوودا بۆ چرکە ساتێک لێرەدا بووەستین.

وا دیارە پۆلیبیۆس یەکەم مێژوونووس بوويێت بە هەر شێوازێکی سیستماتیکی گرنگی بەم چەمکە دابێت؛ هەروەها گیبۆن بە خێرایی پەردەی لەسەر هۆکارەکە راماڵی. گیبۆن تێبینی ئەوەی کرد، کە دوای ئەوەی گریکەکان وڵاتەکەیان بۆ (Province)ێک بچووک بوویەوە، هۆکاری سەرکەوتنەکانی رۆم دەبەنەوە سەر بەخت، نەک شایانبوونی کۆمارەکە(١١٠).

هەروەها تاکیتووس، کە مێژوونووسێکی سەردەمی گەندەڵی وڵاتەکەیەتی، یەکێکی تر بووە لەو

میـژوونوسـه کـۆنانەی دەربارەی ڕەنگدانەوە فـراوانەکـانی بەخت زۆر قـوولبـۆتەوە. نووسـەرە بەریتـانیـیـەکـان لە سـوونگەی سـەردەمی گـەشـەسـەندنی مـەزاجی دڕدۆنگی و ترس و بیـمی چاوەڕوانکراوەوە دووبارە لەسەر گرنگیِ ڕێکەوت لە مێژوودا ڕشتبوون، کە لەگەڵ دەسپێکی ئەم سەدەیەدا دەستی پێکردو دوای ساڵی ١٩١٤-ش تێبینی دەکرا.

وا دەردەکەوێ یەکەم مێژوونووس دوای دابڕانێکی زۆر ئەم تێبینییەی دووبارە توێژیبێتەوە بێری بوویێت، کە لە گووتارێکی ساڵی ١٩٠٩-دا دەربارەی، داروینیزم لە مێژوودا سەرنجی دایە، سروشتی ڕێکەوتی بەخت، کـە بە ڕادەیەکی زۆر، یارمـەتی چارەنووسـسـاز کـردنی ڕووداوەکـان دەدات لە پەرەسـەندنی کۆمـەڵایەتیـدا؛ هەروەها لە سـاڵی ١٩١٦-دا گـووتارێکی تایبـەتی بۆ ئەم مـەبەسـتـە تەرخانکرد لە ژێر ناوونیشانی، لووتی کلیۆپاترا-دا(١١١).

ئێچ. ئێی. ئێڵ. فیشـەر، لە بڕگەیەکدا کە پێشتر وەک نموونە وەرمانگرت، ڕزگاربوونی خۆی لە وەهم ڕەنگ دەداتەوە لە بەرامبەر شکستی خەونەکانی لیبڕاڵی دوای جەنگی جیهانی یەکەم، کە تیایا لە خـوێنەرەکـانی دەپارێتـەوە لە مـێـژوودا، ڕۆڵی بەرببینی نەکـراوەکـان و ئەگـەرە گـومـاندارەکـان، بناسنەوە(١١٢).

مـیللی بوونی ئەو تیـۆرەی دەڵێ مـێـژوو بەشـێکی ڕووداوە بە ڕێکەوتەکـانە لەم وڵاتەدا هاوکـاتە لەگەڵ سەرهەڵدانی قوتابخانەی ئەو فەیلەسووفانە لە فەڕەنسادا دەیانگووت (بوون) نە هۆکار، و نە لۆژیک، و نە پێداویستیشی هەیە- لەم بارەیەشەوە کتێبە نێودارەکەی سارتەر، L'Etre et le nean (بوون و نەبوون) وەک نموونەیەک وەردەگرم.

لە وڵاتی ئەڵـمانیاشدا هەروەک پێشـتـر تێبینیـمان کرد، ماینەکەی(meincke) مێژوونووسی شارەزا لە دوا ساتەکانی تەمەنیدا کەوتە ژێر کاریگەری بەخت لە مێژوودا. ماینەکە(meincke) بە بیـانووی ئەوە گلەیی لە ڕانکە (Ranke) دەکـات، کـە سـەرنجی تەواوی نەداوەتە چەمکی بەخت؛ هەروەها دوای جەنگی جیهـانی دووەم فەلاکەتە نەتەوەییەکانی چل ساڵی ڕابردووی خستە ئەستۆی زنجیـرەیەک ڕووداوی بە ڕێکەوت، فەلاکەتەکانیش بەم شێوەیەن: کردەوە پڕوپووچەکانی قەیسەر، و هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی کۆماری ڤایمەر لە هیندن بوورگدا، و تایبەتمەندی دڕدۆنگانەی هیتلەرو هتد... ئەمـانەش نابووتبوونی مەزاجی مێژوونووسێکی گەورە لە ژێر فشاری بەدبەختی وڵاتەکەیدا گوزارشت دەکەن(١١٣) ئەو تیـۆرانە جەخت دەکەنە سەر ڕۆڵی بەخت یاخود ڕێکەوت لە مێژوودا لە ناو گـروهێک یا نەتەوەیەکدا باون، کە لە ئاستێکی نزم- نەک بەرزی- ڕووداوە مێژووییەکاندان. ئەو تێڕوانینەی دەڵێ دەرئەنجامی تاقیکردنەوەکـان تەواو وابەسـتـەی یانسیبن هەمیـشـە لە نێو ئەوانەدا بەندو باوی

هەیە، کە لە پلەی سێیەمدا دانراون.

وەلێ دۆزینەوەی سەرچاوەکانی باوەڕێک مانای خۆ رزگارکردن نییە لەو باوەڕە؛ تەنانەت هێز ناچارین کتومت ئەوە بدۆزینەوە، کە ئایا، لووتی کلیۆپاترا، چی لە رووپەڕەکانی مێژوودا بە ئەنجام گەیاندووە.

بە شێوەیەکی بێ پێچ و پەنا مۆنتسکیۆ یەکەم کەس بوو هەوڵیدا لە دژی ئەم خۆتێهەڵقورتاندنە بەرگری لە یاساکانی مێژوو بکات. هەروەها لە پەرتووکەکەیدا دەربارەی مەزنی و دارمانی رۆمان نووسیوویەتی، ئەگەر هۆکارێکی تایبەتی وەک دەرئەنجامێکی رێکەوتی شەڕێک وڵاتێکی کاولکرد، ئەوا هۆکارێکی گشتی هەبووە بۆتە هۆی ئەوەی لە سوونگەی تاکە جەنگێکەوە دارمانی وڵاتێک سەرچاوە بگرێت.

هەروەها مارکسیەکان لەسەر ئەم پرسە تا رادەیەک دوودڵیان هەبوو.

مارکس تەنها جارێک لەو بارەیەوە نووسیوویەتی، ئەویش تەنها لە نامەیەکدا:

رەنگە مێژووی جیهان تایبەتمەندییەکی پڕ لە رازی هەبووایە گەر بهاتایەو بوارێک بۆ بەخت لە مێژوودا نەبووایە. بێگومان خودی ئەم بەختە دەبێتە بەشێک لە ئاراستەی گشتی پەرەسەندن و لە میانەی شێوەکانی تری بەختەوە قەرەبوو دەکرێتەوە.

وەلێ خێراکردن و دواخستن وابەستەی ئەم چەشنە، رووداوە بە رێکەوتانە، دەبێت، بە شێوەیەک بەختەکە، تایبەتمەندی ئەو تاکانە دەگرێتەوە، کە لە سەرەتادا لە پێشەنگی بزووتنەوەیەکدان[١١٤].

هەروەها مارکس بە سێ چەشن لە مێژوودا پاساوی بۆ بەخت هێناوەتەوە.

چەشنی یەکەم زۆر گرنگ نەبووە ئەم چەشنە، خێراکردن، و، دواخستنی، لە توانادایە، بەڵام ناتوانێ بە هۆی ماتە دیاردیدانەوە بە شێوەیەکی ریشەیی رێڕەوی رووداوەکان بگۆڕێ.

چەشنی دووەم، بەختێک لە میانەی بەختێکی ترەوە قەرەبوو کراوەتە، بە شێوەیەک لە کۆتاییدا بەخت خودی خۆی پووچەڵ کردۆتەوە.

چەشنی سێیەم، بەخت بە شێوەیەکی تایبەتی لە تایبەتمەندی تاکەکەسەکاندا روونبۆتەوە[١١٥].

ترۆتسکی لە رێگەی وێکچوونێکی بەرپێوەری زیرەکانەوە تیۆری قەرەبووکردن و خۆپووچەڵکردنەوەی رێکەوتەکانی پشت ئەستوور کردووە:

سەرلەبەری پرۆسێسی مێژوو بریتییە لە تیشکدانەوەیەکی یاسای مێژوویی لە میانەی بوویەری رێکەوتەوە.

رەنگە لە زمانی بایۆلۆژیدا باس لەوە بکەین، کە یاسایی مێژوویی لە میانەی هەڵبژاردنی سروشتی

ڕێکەوتەکانەوە پەی پێدەبرێ[١١٦].

دان بەوەدا دەنێم، کە ئەم تیۆرە نە قایلکەرەو نە دڵنەواییکەریشە.

ئەمڕۆکە ڕۆڵی ڕێکەوت لە مێژوودا بە شێوەیەکی جدی لەلایەن ئەو کەسانەوە زێدەڕۆیی تێدا دەکرێت، کە ئارەزوویان لە جەختکردنەوەی گرنگییەکەیەتی.

وەلێ ڕێکەوت هەیە، هەروەها ئەو گووتەیەی دەڵێ بەخت تەنها ڕووداوەکان خێرا دەکات یا دوا دەخات، وەلێ ڕێڕەوەکە ناگۆڕێ، تەنها بۆ ئەوەیە گاڵتەو یاری بە وشەکان بکات.

هەروەها هۆکارێکم نەدۆزییەوە بۆ ئەوەی باوەڕ بەوە بێنم، کە بوویەرێکی بە ڕێکەوت- بۆ نموونە مردنی پێش وەختی لینین لە تەمەنی پەنجاو چوار سالیدا- لە لایەن هیچ ڕێکەوتێکی تری بەم شێوازە وە بە چەشنێکی ئۆتۆماتیکی قەرەبوو بکرێتەوە بۆ ئەوەی تەرازووی پرۆسێسی مێژوویی نۆژەن بکاتەوە.

ئەو تێڕوانینەی دەڵێ ڕێکەوت لە مێژوودا تەنها پێوەری نەزانیمانە- بە شێوەیەکی سادە ناوی چەند شتێکە، کە ناتوانین تێیان بگەین[١١٧]، بە هەمان ئەندازەی تیۆرەکەی تر ناتەواوە.

گومانی تیا نییە ئەم کارە هەندێک جار ڕوودەدات. ناوی هەسارە گەڕۆکەکان لەوەوە سەری هەڵدا، کە بێگومان گەڕۆکن، لە کاتێکدا خەڵکی وایاندەزانی ئەم هەسارانە بە شێوەیەکی ڕەشاوێژی بە ئاسماندا دێن و دەچن، و پێوودانگی جووڵانەوەکانیشیان نەزاندراوە. وەسفکردنی هەندێک شت بە بەدبەخت بریتییە لە شێوازێکی کاریگەری خۆقورتارکردن لە ئەرکی ماندووکەرانەی لێکۆڵینەوەی هۆکارەکانی؛ هەروەها کاتێک کەسێک پێم دەڵێت مێژوو بەشێکی ڕێکەوتەکانە، گومانی تەمبەڵی عەقڵی یاخود گومانی ئاست نزمی چالاکی ڕۆشنبیری لێدەکەم. پیشەیەکی پراکتیکی بەندوباوی مێژوونووسە جدییەکانە ئاماژە بەوە بدەن، کە هەندێک لەو شتانەی تا ئێستا وەک ڕێکەوت مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە، بە هیچ شێوەیەک ڕێکەوت نەبوونە، وەلێ دەشێ لە ڕووی عەقڵییەوە ڕاڤە بکرێن و بە چەشنێکی گرنگ لە شێوازێکی فراوانتری ڕووداوەکاندا هاوڕێک بکرێن.

وەلێ ئەم کردەیەش بە تەواوی وەڵامی پرسیارەکەمان ناداتەوە.

ڕێکەوت تەنها شتێک نییە نەتوانین لێی تێبگەین.

باوەڕم وایە، پێویستە لە پێڕۆیەکی تەواو جیاوازی ئایدیاکاندا دەبێت بۆ چارەسەری ڕێکەوت لە مێژوودا بگەڕێین.

لە قۆناغێکی پێشتردا بینیمان، مێژوونووس ڕاستییەکان هەڵدەبژێرێت و ڕێکیان دەخات بۆ ئەوەی ببنە ڕاستی مێژوویی، ئینجا لەگەڵ ئەو کارەدا مێژوو دەست پێدەکات. هەرچەندە سەرلەبەری

ڕاستییەکان ڕاستی مێژوویی نین، بەڵام جیاکردنەوەی نێوان ڕاستییە مێژوویی و نامێژووییەکان ئەوەندە ڕەق و بەردەوام نییە؛ هەروەها گەر دەستەواژەیەکی ڕەوابێ، دەتوانرێ هەر ڕاستییەک بگەیەنرێتە ئاستی ڕاستییەکی مێژوویی ئەگەر بێت و گرنگی و بەندیوارییەکانی بزاندرێن.

هەنووکە پڕوسێسێکی تا ڕادەیەک هاوشێوە لە ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوونووسدا دەبینین، بە شێوەیە سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی هۆکارەکانە.

پەیوەندەی مێژوونووس بە هۆکارەکانی خودانی هەمان ئەو تایبەتمەندییە دوو لایەنەو ئاڵوگۆڕیە، کە پەیوەندی مێژوونووس بە ڕاستییەکانییەوە هەیەتی.

هۆکارەکان شڕۆڤەکردنی پرۆسێسی مێژوویی مێژوونووس چارەنووسساز دەکەن، کە وابوو شڕۆڤەکانی مێژوونووسیش هەڵبژاردن و ڕێکخستنی هۆکارەکان چارەنووس ساز دەکات. پلەدارکردنی هۆکارەکان و گرنگی ڕێژەیی هەر هۆکارێک یاخود کۆمەڵە هۆکارێک یانیش گرنگی ڕێژەیی هۆکارێکی دیکە بریتییە لە جەوهەری شڕۆڤەکردنەکەی مێژوونووس.

ئەم کردەیەش کلیلی چارەسەری پرسی ڕێکەوت لە مێژوودا دەسازێنێ.

شێوەی لووتی کلیۆپاترا، و نەخۆشی جوومگەکانی باجزت، و قەپی ئەو مەیموونەی پادشا ئەسکەندەری کوشت، هەروەها مردنی لینین- هەموویان بریتی بوون لەو ڕێکەوتانەی ڕێڕەوی مێژووییان گۆڕی.

شتێکی بێهوودەیە هەوڵی ئەوە بدەین ئەو ڕێکەوتانە بە خێرایی لەبەرچاو لا ببەین، یان بە شێوەیەک لە شێوەکان وایان نیشان بدەین بێ ئەنجامبوونە.

لە لایەکی ترەوە، بەو ئەندازەیەی ڕێکەوتە بوویەربوونە، ئەوەندە نەچوونەتە چوارچێوەی شڕۆڤەکردنی عەقڵانی مێژووەوە، یان بەو ئەندازەیە نەچوونەتە چوارچێوەی پلەدارکردنی هۆکارە گرنگەکانی مێژوونووسەوە.

زیاتر لە جارێک ئاماژە بە هەریەک لە پرۆفیسۆر پۆپەرو پرۆفیسۆر بەرلین دەدەم بەو ناوەی دیارترین و پڕ خوێنەرترین نوێنەرانی ئەم قوتابخانەیەن- ئەوە گریمان دەکەن، کە هەوڵی مێژوونووس بۆ دۆزینەوەی گرنگی لە پرۆسێسی مێژووییداو هەڵێنجانی دەرئەنجامەکان لەو پرۆسێسەوە یەکسانە بە هەوڵی کەمکردنەوەی، ئەزموونی گشتی، بۆ پێڕۆیەکی چوونیەک و هەماهەنگ، هەروەها بوونی ڕێکەوت لە مێژوودا هەر هەوڵێکی لەم بابەتە بە ئاقاری شکستدا دەبات.

وەلێ هیچ مێژوونووسێکی عەقڵانی چاوەڕوانی ئەوە ناکات کارێکی خەیاڵی ئەنجام دەدات لە پێناو دەردەستکردنی، تەواوی ئەزموونەکاندا،؛ چونکە ناتوانێ زیاتر لە پارچەیەکی بچووکی

راستییەکان بەدەست بهێنێ تەنانەت ئەگەر بڕگە بازنەی هەڵبژێراوی خۆی یاخود لایەنێکی مێژووش بێت.

جیهانی مێژوونووس بە چەشنی جیهانی زانا کۆپییەکی فۆتۆگرافی جیهانی راستەقینە نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە دروستکردنی ئەو مودێلەیە، کە کەمتر یان زیاتر بە شێوەیەکی چالاکانە وزە دەبەخشێتە مێژوونووس لێی تێبگات و راسەری بکات.

مێژوونووس ئەو بەشە لە ئەزموونەکانی رابردوو دەپاڵێنێ، یان زۆربەی هەرەزۆری ئەزموونە بەردەستەکانی رابردوو دەپاڵێوێت، کە پێی وایە بە کەڵکی راڤەکردن و شرۆڤەکردن دێت، ئینجا لە سوونگەی ئەم بەشەوە ئەو دەرئەنجامانە هەڵدەهێنجێت، کە وەک رێبەرێکی کردەکە بەکار دەهێنرێن.

نووسەرێکی میللی هاوچەرخ لە بارەی دەسکەوتەکانی زانست قسە دەکات و بە شێوەیەکی گرافیکی ئاماژە بەرەوشی مەزاجی مرۆڤ دەکات، بە شێوەیەک ئەم رەوشی مەزاجە (دەماغ)، لە چەمەدانی جل و جۆری «راستییە» تێبینیکراوکاندا کنەو پشکنین دەکات، بە یەکەوە راستییە پەیوەندیدارەکان هەڵدەبژێرێ و پینەیان دەکات و بەو شێوەیە دروستیان دەکات تا وەکو بە یەکەوە دەبنە لێفەیەکی دووراوی عەقلانی و لۆژیکی «مەعریفە»؛ بەڵام ئەو پارچەو پەڕۆیانەی پەیوەندییان بە بابەتەکەوە نەبێت دەیانخاتە لاوە(١١٨).

پێویستە لەبەر سنوور بۆ دانانێکی مەترسییەکانی پەیوەند بە خودگەرایی هێژ نەگونجاوەوە ئەو چەمکە وەک وێنەیەکی ئەو شێوازە قبووڵ بکەم، کە مەزاجی مێژوونووسەکە کاری پێدەکات. لەوانەیە ئەم رێسایە فەیلەسووفان و تەنانەت هەندێک لە مێژوونووسانیش سەرسام بکاو راچڵەکێنێ. وەلێ رێساکە سەد دەر سەد لای ئەو خەڵکە رەشۆکیانە کارێکی ئاساییە، کە بە دوای کارێکی پراکتیکی ژیاندا دەگەڕێن.

با گەڕانەوەی جۆن لە ئاهەنگێک روون بکەمەوە، کە زیاتر لە ئاستی پێویست مەشروباتی خواردبوویەوە، جۆن بە ئۆتۆمبێلێک گەڕایەوە برێکەکانی کاریان نەدەکرد، ئینجا لە پەنایەکی زۆر نەدیودا خۆی بە رۆبنسن-دا دەکێشێ و دەیکوژێ، رۆبنسن لەو ساتەوەختەدا لە رێگاکە دەپەڕییەوە بۆ ئەوەی لە دوکانی سەر سووچەکە جگەرە بکڕێ.

دوای ئەوەی مەسەلەی هەراو هۆریاکە روونبوویەوە- با بڵێین لە بنکەیەکی پۆلیس-دا کۆدەبینەوە بۆ ئەوەی لە هۆکارەکانی رووداوەکە بکۆڵینەوە.

ئایا ئەم رووداوە بە هۆی حاڵەتی نیمچە سەرخۆشی شوفێرەکەوە بووە، کە لەوانەیە لەم حاڵەتەدا سکالایەکی تاوانباری لێبدرێتە دادگا؟ یان ئایا بە هۆی ناتەواوی برێکەکانەوە بووە- لەم حاڵەتەشدا

لەوانەیە ئەو گاراژە لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێ، کە تەنها هەفتەیەک پێش ئەم رووداوە سەیارەکەی بە وردی پشکنی بوو؟ یان ئایا بە هۆی پەنا نەدیوەکەوە بوو، لەم حاڵەتەشدا لەوانەیە دەستەڵاتدارانی رێگاکە بانگهێشت بکرێن بۆ ئەوەی سەرنجی خۆیان لەسەر مەسەلەکە پێشکەش بکەن؟ لە کاتێکدا ئەم پرسیارە پراکتیکیانەمان گفتوگۆ دەکرد، دوو پیاوماقووڵی ناسراو- کە نامەوێ بیانناسێنم- خۆیان کرد بە ژوورەکەداو بە زمانێکی پاراو و رازی کردنێکی بەهێزەوە دەڵێن، ئەگەر رۆبنسن ئەو ئێوارەیە جگەرەی لێ نەبڕابایە، لەوانەیە لە رێگاکە نەپەڕیبایەوەو لەوانەیە نەکوژرابایە؛ کە وابوو ئارەزووی رۆبنسن بۆ جگەرە هۆکاری مردنەکەی بووە؛ بە شێوەیەک هەر لێکۆڵینەوەیەک ئەم هۆکارە پشتگوێ بخات تەنها دەبێتە کات بە فیڕۆدان، کە وابوو هەر دەرئەنجامێکی لێوەی هەڵێنجرابێت بێ سوودە. باشە، ئەی چی بکەین؟ ئەوەندەی توانیمان بە خێرایی لێشاوی قسە پاراوەکانیان دەوەستێنین و بەرە بەرە گەشتیارەکانمان بەرێزەوە بەرەو دەرگاکە پاڵ دەنێین، ئینجا دەرگاوانەکە ئاگادار دەکەینەوە، کە بە هیچ شێوەیەک رێگەیان نەدات جارێکی تر بێنە ژوورەوە، ئینجا دەست بە لێکۆڵینەوە دەکەین.

بەڵام ئایا چ وەڵامێکمان بۆ قسەبڕەکان پێیە؟ بێگومان رۆبنسن بۆیە کوژرا، چونکە جگەرەکێش بوو. هەرچییەک لە مێژوودا لە لایەن پشتیوانانی بەخت و ئەگەراندنەوە بگووترێ سەد دەر سەد راستەو سەد دەر سەد لۆژیکییە.

ئەم چەمکە هەمان ئەو چەشنە لۆژیکە بێ رەحمەی هەیە، کە لەم پەرتووکەدا بەرچاومان دەکەوێت:
(Alice in wonderland and through the looking glass).

لە کاتێکدا هیچ کەسێک بە قەد من بەم نموونە گونجاوانەی رۆشنبیری ئۆکسفۆرد سەرسام نییە، بەڵام وای بە باشتر دەزانم شێوازە جیاوازەکانی لۆژیکی خۆم لە چەند بەشێکی جیاوازدا بهێڵمەوە.

شێوازی دۆج سۆنی شێوازێکی مێژوو نییە.

لەبەرئەوەی مێژوو رەوشێکی هەڵبژاردنە لەسەر بنەمای گرنگی مانایی مێژوویی، بۆیە جارێکی دیکە دەستەواژەکەی تالکۆت پارسن وەردەگرین، دەڵێ: مێژوو بریتییە لە «سیستەمێکی هەڵبژێر» نەک تەنها لە رووی ئاراستەکانی مەعریفییەوە، بەڵکو لە رووی ئاراستەکانی هۆکارگەراییشەوە بەرەو ئاقاری واقیع بینی.

مێژوونووس لە دەریای بێ سەرو بنی راستییەکاندا کتومت ئەو راستییانە هەڵدەبژێرێ، کە بۆ مەبەستەکانی خۆی گرنگن، هەروەها لە فرە ریزبەندییەکانی هۆ و ئەنجامدا تەنها ئەو هۆ و ئەنجامانە هەڵدەبژێرێ، کە لە رووی مێژووییەوە گرنگن؛ پێوودانگی گرنگی مێژووییش بریتییە لە توانای مێژوونووس بۆ گونجاندنیان لە شێوازی شرۆڤەکردن و راڤەکردنی عەقڵانی خۆیدا.

پێویسته سەرەنجامە نامەبەستەکانی دیکەی هۆ و ئەنجامەکان رەتبکرێنەوە، نەک لەبەرئەوەی پەیوەندی نێوان هۆ و ئەنجام شتێکی جیاوازە، بەڵکو لەبەرئەوەی خودی سەرەنجامەکە هیچ پەیوەندییەکی بە بابەتەکەوە نییە.

مێژوونووس دەتوانێ واز لەم سەرەنجامە بهێنێ؛ ئەو سەرەنجامە بە کەڵکی شرۆڤەکردنی عەقڵی نایەت، هەروەها نە بۆ رابردوو- و- نە بۆ ئێستا هیچ مانایەکی نییە.

راستە هەریەک لە لووتی کلیۆپاترا، و نەخۆشی جوومگەکانی باجزت، یان قەپی مەیموونەکەی ئەسکەندەر، یان مردنی لینین، یان جگەرەکێشانی رۆبنسن، ئەنجامیان هەبوو.

بەڵام وەک پێشنیارکردنێکی گشتی وتنی ئەو دەستەواژەیە هیچ مانایەک نادات، کە: جەنەراڵەکان بۆیە جەنگەکان دەدۆڕێنن، چونکە شەیدای شاژنە جوانەکان دەبن، یان بڵێین بۆیە جەنگەکان هەڵدەگیرسێن، چونکە پادشاکان مەیموونی متووبوو رادەگرن، یان بڵێین خەڵکی بۆیە لەسەر جادەکان دەکوژرێن، چونکە جگەرە دەکێشن.

ئەگەر لە لایەکی ترەوە بە کەسێکی رەشۆکی بڵێی بۆیە رۆبنسن کوژرا، چونکە شوفێرەکە سەرخۆش بوو، یان لەبەرئەوەی برێکەکان کاریان نەدەکرد، یان لەبەرئەوەی پەنایەکی نەدیوو لەسەر جادەکە هەبوو، ئەمە لای ئەو کەسە سەد دەر سەد راڤەکردنێکی عەقڵانی و مەعقول دەبێت؛ ئینجا گەر جیاکردنەوەی هۆکاری راستەقینەی مردنی رۆبنسن هەڵبژێرێ، تەنانەت لەوانەیە بڵێ ئەم هۆکارانە هۆکاری راستەقینەی مردنی رۆبنسنن، نەک ئارەزووی جگەرەکێشانی. بە هەمان شێوە گەر ئەوە بە قوتابییەکی مێژوو بڵێی، کە کێشمەکێشمەکانی یەکییەتی شوورەوی لە ١٩٢٠-ەکاندا بە هۆی مشتومڕەکانەوە بوون لەمەڕ تێکڕای بڕی بە پیشەسازیکردندا، یان بە هۆی مشتومڕکردنەوە بوون لە بارەی دابینکردنی باشترین هۆ و پێناو و کەرەستی هاندانی جووتیارەکان بۆ ئەوەی دەغڵ و دان دابچێنن و خواردنی شارۆچکەکان دەستەبەر بکەن، یان تەنانەت خواستە کەسییەکانی سەرکردە کێبەرکێکەرەکان دەستەبەر بکەن، ئەوسا قوتابییەکە هەست بەوە دەکات ئەم هۆکارانە عەقڵانین و لە رووی مێژووییەوە بریتین لە کۆمەڵە راڤەکردنێکی گرنگ، بەو مانایەی دەتوانرێ لەسەر رەوشە مێژووییەکانی دیکەدا پراکتیس بکرێن، هەروەها بەو مانایەی بریتین لە هۆکارە، راستەقینەکانی، ئەوەی روویدا، لە کاتێکدا رووداوی مردنی پێشوەختی لینین بەم شێوەیە نەبوو. گەر قوتابییەکە باش لەم شتانە وردبێتەوە، لەوانەیە تەنانەت ئەو گووتەی هیگڵی بێتەوە یاد لە پێشەکی پەرتووکی «فەلسەفەی ماف»دا ئەم گووتەیە زۆر بە نموونە وەرگیراوەو زۆریش بە هەڵە لێی تێگەیشتوون، دەڵێ: «ئەوەی عەقڵانی بێت بریتییە لە راستی، هەروەها ئەوەی راست بێ بریتییە لە عەقڵانی».

با بۆ چرکە ساتێک بگەڕێینەوە سەر هۆکارەکانی مردنی ڕۆبنسن.

لە جیاکردنەوەی ئەوەدا هیچ ئاستەنگێکمان نییە، کە هەندێک هۆکار عەقلانی و ڕاستەقینە» بوونەو هەندێکی تر ناعەقلانی و ناجەوهەری بوونە.

وەلێ ئایا لە میانەی چ پێودانگێکەوە جیاکردنەوەکەمان ئەنجامداوە؟ توانسی عەقڵ بە شێوەیەکی ئاسایی بۆ مەبەستێک مومامەرەسە دەکرێت.

هەندێک جار ڕۆشنبیرەکان لەوانەیە لە پێناو گاڵتەدا بیربکەنەوە، یان پێیان وایە بە شێوەیەکی عەقلانی بیردەکەنەوە، وەلێ گەر بە شێوەیەکی بێ پێچ و پەنا بدوێن، ئەوا مرۆڤەکان بۆ مەبەستێک بیردەکەنەوە.

ئینجا مادامێک چەند ڕاڤەکردنێکی دیاریکراومان بە عەقلانی داناو هەندێک ڕاڤەکردنی تریشمان بە ناعەقلانی دانا، پێشنیار دەکەم، کە جیاوازیمان کردووە لە نێوان ئەو ڕاڤەکردنانەی، کە خزمەتیان بە مەبەستێک کردووەو ئەو ڕاڤەکردنانەیش، کە خزمەتیان بە هیچ مەبەستێک نەکردووە.

لەم حاڵەتەی هەنووکە لە ژێر گفتوگۆدایە شتێکی ماقووڵبوو ئەوە گریمان بکەین، کە کۆنتڕۆڵکردنی خواردنەوەی زۆری کحول لای شوفێرەکان، یان کۆنتڕۆڵکردنی توندتری چاودێری برێکەکان، یان چاککردنی ڕێگاوبانەکان، لەوانەیە خزمەت بە مەبەستی کەمکردنەوەی ژمارەی قەزاو قەدەرەکانی پەڕینەوە بکات. وەلێ بە هیچ شێوەیەک عەقلانی نەدەبوو، کە گریمان بکەین دەتوانرا بە هۆی ڕێگرتنی خەڵکی لە جگەرەکێشان ژمارەی قوربانیانی قەزاو قەدەری پەڕینەوە کەم بکرێتەوە. ئەمەش بریتی بوو لەو پێوودانگەی لە میانەیەوە جیاکردنەوەکەمان ئەنجامدا.

هەروەها هەمان شت دەهەنبەر هۆکارەکان لە مێژوودا لەسەر هەڵوێستمان پراکتیس دەبێت.

کەوابوو پێویستە جیاوازی لە نێوان هۆکارە عەقلانی و ناجەوهەرییەکاندا بکەین.

چونکە ئەوانەی پێشتر بە شێوەیەکی شاراوە لە سەر وڵاتەکانی ترو لە سەر سەردەمەکانی تر، هەروەها لەسەر هەڵومەرجەکانی تردا پراکتیس دەبن، دەبنە هۆی گشتاندنێکی بەرهەمدار، هەروەها دەتوانین وانەیان لێ فێرببین؛ کەوابوو ئەوانە خزمەت بە فراوانکردن و قووڵکردنەوەی تێگەیشتنمان دەکەن[119].

ناتوانرێ هۆکارە ناجەوهەرییەکان بگشتێندرێن؛ چونکە پڕ بە مانای وشە بریتین لە هۆکاری هەڵاوێرە (ناوازە)، هەروەها هیچ وانەیەکمان فێر ناکەن سەرەنجام هیچ دەرئەنجامێکیشیان لێ ناکەوێتەوە.

بەڵام پێویستە لێرەدا خاڵێکی تر بهێنمە ئەنجام.

کتومت بریتییە لە بیرۆکەی ئامانجێک بەو تێڕوانینەی، کە کلیلی چارەسەرکردنی هۆکارلێکدانەوە لە مێژوودا بۆ ئێمە دەستەبەر دەکات؛ ئەم تێڕوانینەش وەک پێویست بڕیارە بەهادارەکان دەگرێتەوە.

هەروەک لە دوا گەلاڵە نامەدا بینیمان، هەمیشە شرۆڤەکردن لە مێژوودا وابەستەی بڕیارە بەهادارەکان دەبێت، هەروەها هۆکارگەرایی وابەستەی شرۆڤەکردن دەبێت.

بە گوێرەی قسەکانی ماینەکە (Meinecke)- ماینەکەی گەورە، ماینەکەی ١٩٢٠-ەکان- توێژینەوەی هۆکارگەراییەکان بە مێژوودا بەبێ ئاماژەدان بە بەهاکان شتێکی مەحاڵە... هەمیشە توێژینەوەی بەهاکان دەکەوێتە دوای توێژینەوەی هۆکارگەراییەکان چ ڕاستەوخۆ بێت چ ناڕاستەوخۆ[١٢٠].

هەروەها ئەم چەمکە ئەوەم بیردەخاتەوە، کە پێشتر دەربارەی ئەرکی دوولایەنەو ئاڵوگۆڕی مێژوو قسەم لە بارەیەوە کرد- ئەم ئەرکە تێگەیشتنمان لە ژێر تیشکی ئێستادا لە بارەی ڕابردوو بە هێز دەکات هەروەها لە ژێر تیشکی ڕابردوودا تێگەیشتنمان لە بارەی ئێستادا بە هێز دەکات.

وەلێ هەر شتێک- وەک شەیدابوونی ئەنتۆنی بە کلیۆپاترا- بەشداری ئەم مەبەستە دوو لایەنەیە نەکات، ئەوا لە ڕوانگەی مێژوونووسەوە شتێکی مردوو-و- نەزۆکە. کاتێ ئەوە هاتووە لەم کاتە ناسک و گرنگەدا دان بنێم بە فێڵێکی زۆر خراپ، کە لە ئێوەم کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، چونکە بێگومان لە میانەیەوە بۆ تێگەیشتن لە بابەتەکە هیچ ئاستەنگی و دوودڵییەکتان تووش نەهاتووە، هەروەها چەندین جار بۆ کورتکردنەوەو سادەکردنی ئەوەی وتوومە یارمەتی داوم، کەواتە ڕەنگە زۆر لێبووردە بووبێت، کە ئەم فێڵەت وەک پاژێکی گونجاوی لێکردنەوەو کورتکردنەوە سەیر کردووە. تا بە ئەم ساتەش دەگا بە بەردەوامی دەستەواژەی «ڕابردوو-و- ئێستا»ی تەقلیدیم بەکارهێناوە.

وەلێ مادام هەموومان ئەوە بزانین، ئێستا شتێکی تیۆرییە بە شێوەیەک بریتییە لە هێڵێکی دابەشکەری خەیاڵی لە نێوان ڕابردوو-و- داهاتوودا.

کاتێک لە بارەی ئێستاوە قسەم دەکرد ڕەهەندێکی تری کاتم بە قاچاغ کردە بیانوو.

پێم وایە پێشاندانی ئەوە شتێکی ئاسانە، کە برەودان بە ڕابردوو-و- برەودان بە داهاتوو دوو شتی بەندیوارین، چونکە ڕابردوو-و- داهاتوو بەشێکی هەمان ماوەی سەردەمەکەن.

هێڵی سنووردانانی نێوان سەردەمەکانی پێش مێژوو-و- سەردەمە مێژووییەکان تەنها کاتێک دەکێشرێ، کە خەڵکی لە سەردەمی ئێستادا لە ژیان گوزەراندن دەوەستن، هەروەها بە شێوەیەکی هۆشیارانە چ لە ڕابردوویان و چ لە داهاتوویاندا تامەزرۆ دەبن.

مێژوو بە گوزەرکردنی کەلەپوورو تەقلیدی وەچەکان دەست پێدەکات؛ تەقلیدیش بریتییە لە

گواستنەوەی داب و نەریت و وانەکانی رابردوو بۆ داهاتوو.

تۆمارەکانی رابردوو لە پێناو سوودی وەچەکانی داهاتوودا هەڵدەگیرێن.

مـێـژوونووسی هۆڵەندی هوویتـسـینگا دەڵێ: هزری مـێـژوویی هەمـیـشـە شتـێکی ئارمـانج گەراییە[١٢١].

بەم دواییانە سێر کارلس سنۆو لە بارەی رۆتەرفۆردەوە ئەوەی نووسیووە، کە «ئەویش وەک هەموو زاناکان... تا رادەیەک بەبێ بیرکردنەوە لەوەی چ مانایەکی هەبووە، لە ئێسقانەکانیدا داهاتوویەکی هەبووە»[١٢٢].

گومان دەبەم، کە مێژوونووسە باشەکان، چ بیر لەوە بکەنەوە چ بیرنەکەوە لە ئێسقانەکانیاندا داهاتوو هەیە.

مێژوونووس سەرەڕای پرسیاری «بۆچی؟» پرسیاری «بۆ کوێ؟»-ش دەکات.

## پێنجەم

# مێژوو وەک پێشکەوتن

بوارم بدەن بە وەرگرتنی بڕگەیەکی دەسپێکی گەلاڵەنامەی پرۆفیسۆر پۆویک دەست پێبکەم، کە سی ساڵ بەر لە ئێستا نووسیوویەتی، بەو ناوەی پرۆفیسۆری شاهانەیە لە مێژووی هاوچەرخ لە زانکۆی ئۆکسفۆرد-دا:

لاقەکردن بۆ شرۆڤەکردنی مێژوو ئەوەندە بە قووڵی رەگی داکووتاوە، مەگەر تێڕوانینێکی ئاقاداریمان نەبێت دەربارەی رابردوو، ئەوا یا ئەوەتا بەرەو سۆفیگەری دەچین یانیش بەرەو گومانگەرایی دەچین(١٢٣).

پێم وایە، سۆفیگەری، گوزارشت لەو تێڕوانینە دەکات، کە پێی وایە مانای مێژوو دەکەوێتە شوێنێک لە دەرەوەی مێژوودا، واتە لە بوارەکانی تیۆلۆژی یان لە بوارەکانی توێژینەوەی کۆتایی بوونەوەرو جیهاندا (Eschatology)- ئەم تێڕوانینەش تێڕوانینی نووسەرەکانی وەک بێردیاف یان نیبوور یان تۆینبی بوو(١٢٤).

گومانگەرایی، هەروەک چەندین جار نموونەم بۆی هێنایەوە، گوزارشت لەو تێڕوانینە دەکات، کە پێی وایە مێژوو مانای نییە، یانیش کۆمەڵێک مانای راست یا ناڕاستی وەک یەکی هەیە، یان ئەو مانایەی هەیە، کە وەک سەپاندنێک هەڵیدەبژێرین تا بە بەر مێژوویدا بکەین.

رەنگە ئەم دوو تێڕوانینە ئەمڕۆکە بە هەرەمێنترین تێڕوانین بن لە بارەی مێژووەوە.

وەلێ بێ سێ و دوو هەریەک لەم دوو تێڕوانینە رەتدەکەمەوە.

ئەم رەوشەش لەگەڵ ئەو دەستەواژە نامۆیە بەجێمان دەهێڵێ، بەڵام ئەوەندە هەیە سەرنجڕاکێشە، کە دەڵێ «تێڕوانینێکی ئاقادار لە بارەی رابردوو».

هیچ ڕێگایەک نییە پێمان بڵێ پرۆفیسۆر پۆویک چی لە هزردا بووە کاتێک ئەم دەستەواژەیەی نووسیووە، بۆیە هەوڵ دەدەم شرۆڤەکردنی تایبەتی خۆم لەو بارەیەوە بخوێنمەوە. بە شێوەیەکی جەوهەری چاندی کلاسیکی گریک و ڕۆمان بە شێوەی چاندە کۆنەکانی ئاسیا دوو چاندی نامێژوویی بوون. هەروەک پێشتر بینیمان، هێرۆدۆتسی باوکی مێژوو چەند نەوەیەکی کەمی هەبوو؛ هەروەها نووسەرەکانی شوێنەواری کلاسیکی بە شێوەیەکی گشتی بایەخێکی کەمیان بە هەریەک لە ڕابردوو- و- داهاتوو دەدا.

تیوسیدیدس باوەڕی وابوو، کە هیچ شتێکی گرنگ پێش سەردەمی ئەو ڕووداوانە ڕووی نەداوە، کە ئەو وەسفی کردووە، هەروەها باوەڕی وابوو، کە پێناچی هیچ شتێکی گرنگ لەمەولا ڕوویدابێ، لووکریتووس لە سوونگەی گوێ مەدێیی خۆیەوە دەهەنبەر ڕابردوو گوێ مەدێیی مرۆڤ دەهەنبەر داهاتوو دێنێتە ئەنجام و دەڵێ:

لەوە وردببنەوە چۆن پێش لەدایکبوونمان سەردەمەکانی ڕابردووی سەردەمێکی بێ کۆتایی جێگای بایەخی ئێمە نەبوونە. ئەمەش بریتییە لە ئاوێنەیەک، کە سروشتی سەردەمی داهاتووی دوای لەدایکبوونمان دەخاتە بەرچاو[١٢٥].

تێڕوانینە هۆزانڤانییەکان لە بارەی داهاتوویەکی گەشتر شێوەی تێڕوانینەکانی گەڕانەوەیەک بۆ سەردەمێکی زێڕینی ڕابردوویان وەرگرتووە- ئەمەش بریتییە لە تێڕوانینێکی بازنەیی، کە ڕەوتەکانی مێژوو دەکاتە هاوشێوەی ڕەوتەکانی سروشت.

تەنها ڤیرجیل لە چوارەم سروودی شوانانەی خۆیدا وێنەیەکی کلاسیکی لە بارەی گەڕانەوەیک بۆ سەردەمی زێڕین بە دەستەوە دەدات، هەروەها بە شێوەیەکی کاتی لە (Aeneid)-دا سروشتی ئەوەی کردووە چەمکی بازنەیی ببڕێت: «imperium sine fine deadi» کە دواجار نازناوی نیمچە پێغەمبەرێکی مەسیحی بە ڤیرجیل بەخشی.

جوولەکەکان و دواتریش مەسیحییەکان لە میانەی گریمانکردنی ئامانجێک کە پێیان وابوو ڕەوتی مێژوویی بە ئاڕاستەی ئەو ئامانجە دەجوولێت، بە تەواوی سرشتێکی نوێیان دروستکرد- ئەمەش بریتییە لە تێڕوانینی ئامانجگەرایی مێژوو.

کەوابوو مێژوو مەبەست و مانایەکی دەردەستکەوتووە، بەڵام لەسەر حیسابی لە دەستدانی تایبەتمەندییە عەلمانییەکەی. دەردەستکەوتنی ئامانجی مێژوو لەوانەیە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی

مانای کۆتایی مێژوو بگەیەنێت: خودی مێژوو بۆتە تیۆلۆژیایەکی سروشتی بڕیاردانی خودایی (The-odicy).

ئەمەش تێڕوانینی چەرخی ناوەڕاست بوو لە بارەی مێژوو. لە چەرخی ڕێنسانسدا تێڕوانینی کلاسیکی لە بارەی جیهانی چەقگەرایی مرۆڤ (anthropocentric)و پێشەنگی عەقڵ نوێکرایەوە، وەلێ تێڕوانینی ڕەشبینانەی کلاسیکی دەهەنبەر داهاتوو لە لایەن تێڕوانینێکی گەشبینانەوە جێگەی گیرایەوە، کە لە تەقلیدی جوو- مەسیحی وەرگیرابوو.

سەردەم، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان دووژمن و خراپەکار بوو، ئێستاکە بۆتە هاوڕێ و ئەفرێنەر: دەستەواژەکەی هۆراس، سەردەمی وێرانکەر چ شتێک وێران ناکات؟

«Damnosa quid non imminuit dies?» بیخەنە قالبی بەراوردکارییەوە لەگەڵ دەستەواژەکەی باکۆندا، کە دەڵێ «ڕاستی دەستە خوشکی سەردەمە» «Veritas temporis fila».

عەقلانییەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری خۆیان دامەزرێنەری هیستۆریۆگرافی هاوچەرخ بوون، هەروەها تێڕوانینی ئامانجگەرایی جوو- مەسیحیان پاراست، وەلێ ئامانجەکەیان بە عەلمانیکرد؛ کە وابوو توانیوویانە تایبەتمەندی عەقلانی خودی ڕەوتی مێژوویی نوێ بکەنەوە.

مێژوو بە ئاراستەی ئامانجی کامڵکردنی پێگەی مرۆڤ لەسەر زەویدا پەرەی دەسەند.

گیبۆن، کە یەکێکە لە گەورەترین مێژوونووسانی سەردەمی ڕۆشنگەری، بە هۆی سروشتی بابەتەکەیەوە ڕێگەی تۆمارکردنی ئەوەی لێنەگیرا، کە پێی دەوت، دەرئەنجامی کەیف خۆشی ئەویش ئەوەیە هەموو سەردەمێکی جیهان هەریەک لەمانەی خوارەوەی زیادی کردووەو تەنانەت هێژ زیادیان دەکات ئەوانیش بریتین لە سامانی ڕاستەقینەو کامەرانی و مەعریفەو ڕەنگە نایابی ڕەگەزی مرۆڤیش بێت[١٢٦]..

پەرستشی پەرەسەندن لەو چرکەساتەدا گەیشتە چڵەپۆپە، کە هەریەک لە دەسەڵات و گەشەسەندوویی و باوەڕ بە خۆبوون لە ئاست بەرزی خۆیاندا بوون؛ هەروەها کاتێک مێژوونووس و نووسەرە بەریتانییەکان لە نێو گەرم و گوڕترین دەروێشەکانی پەرستشیەکە دابوون. دیاردەکە ئەوەندە ئاساییە پێویستی بە ڕوونکردنەوە نییە؛ هەروەها تەنها پێویستیم بەوە هەیە بڕگەیەک تا دوو بڕگە وەک نموونە بۆ پیشاندانی ئەوە وەربگرم، کە چۆن بەم دواییانە باوەڕبوون بە پێشکەوتن بوو بە گریمانێکی نکۆڵی لێنەکراوی سەرلەبەری بیرکردنەوەمان.

ئاکتۆن لە راپۆرتی ساڵی ١٨٩٦-دا دەربارەی پرۆژەی مێژووی هاوچەرخی کێیمبرج- لە گەڵاڵەنامەی یەکەمدا بە نموونە وەرم گرت- وەک «زانستێکی پێشکەوتنخواز» ئاماژەی بە مێژوو داوە؛ هەروەها لە پێشەکی بەرگی یەکەمی مێژووەکەدا نووسیوویەتی «ناچارین وەک گریمانێکی زانستی ئەو گریمانەی بە پێی یاساو رێساکانی مێژوو دەنووسرێ، پێشکەوتنێک لە کاروبارەکانی مرۆڤدا گریمان بکەین».

دامپیەر، کە مامۆستایەکی کۆلێژەکەم بوو کاتێک قووتابی زانکۆ بووم، لە دوا بەشی مێژووەکەدا، کە لە ساڵی ١٩١٠-دا بلاو کراوەتەوە، هەستی بە هیچ گومانێک نەکردووەو دەڵێ «سەردەمەکانی داهاتوو لەمەڕ پەرەسەندنی توانای مرۆڤ بەسەر سەرچاوەکانی سروشت و زرنگی بەکارهێنانیان لە پێناو خۆشگوزەرانی رەگەزەکەیدا هیچ سنووردانانێک بە خۆیانەوە نابینن»[١٢٧].

بە هۆی ئەوەی دەمەوێ بیڵێم، شتێکی شەرعییە دان بەوەدا بنێم، کە ئەمە بریتی بووە لەو دەوروبەرەی تێیدا پەروەردە بوومە، هەروەها بێ هیچ پارێزکردنێک پشتگیری واژەکانی بیتراند رووسێڵ دەکەم، کە بە نیو پشت دەکەوێتە پێش منەوەو دەڵێ: «من لە نێو لافاوی بە جۆش و خرۆشی گەشبینی سەردەمی ڤیکتۆریدا پەروەردە بوومەو، هەروەها... هەندێک هیواو ئاواتم لا دەمێنێتەوە، کە ئەوسا ئاسان بوو»[١٢٨].

کاتێک بێری لە ساڵی ١٩٢٠-دا کتێبێکی خۆی بە ناوی بیری پێشکەوتن (The Idea of progress) نووسی، پێش ئەو کاتە کەش و هەوایەکی ساردوسڕتر بەندوباوی هەبوو، بێری گوناحی ئەو کەشە ساردوسڕە بە گوێرەی چەشنی گوێڕایەڵی سەردەم دەخاتە ئەستۆی ئەو تیۆردانەرە دۆگمایانەی فەرمانڕەوایی تۆقاندنی ئەمڕۆکەیان لە رووسیادا دامەزراند، لەگەڵ ئەوەشدا بێری هێژ پێشکەوتنی وەک زیندووکەرەوەو کۆنترۆڵکەری هزری چاندی رۆژئاوا وەسفکردووە»[١٢٩].

لەو ساتەوە ئەم سەرنجە خامۆش بوو.

دەڵێن نیکۆلاسی یەکەمی رووسیا بڕیارێکی دەرکرد بە پێی ئەو بڕیارە وشەی، پێشکەوتنی قەدەغەکرد،: ئێستا کە دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر تازە بە تازە فەیلەسووف و مێژوونووسانی ئەوروپای رۆژئاوا، تەنانەت فەیلەسووف و مێژوونووسەکانی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش لەگەڵیدا کۆکن.

تیۆری پێشکەوتن بوو بە شتێکی ماندەڵ لێکراو.

چەمکی دارمانی رۆژئاوا بوو بە دەستەواژەیەکی ئەوەندە ئاسایی، کە چیتر پێویستی بە وەرگرتنی شایەت حاڵ نەبێت.

وەلێ بە چاوپۆشین لە هەموو زایەڵەیەک، ئایا لە راستیدا چی روویدا؟ لە لایەن چ کەسێکەوە ئەم شەپۆلی بیروباوەڕە نوێیە دامەزرێنرا؟ پێم وایە رۆژێکی تر تەنها بە بینینی تێبینییەکەی بێتراند رووسڵ راچڵەکاوم، کە هەرگیز نەمبینیبوو بە شێوەیەک لای من دەردەکەوت، کە هەستێکی گرنگی چینایەتی دەربخات: بە شێوەیەکی گشتی ئەمرۆکە لە جیهاندا ئازادییەکی زۆر کەمتر لەو ئازادییە هەیە، کە سەد ساڵێک پێش ئێستا هەبوو،(١٣٠).

بۆ پێوانەکردنی ئازادی تولێکی پێوانم نییە، هەروەها نازانم چۆن ئازادی کەمتری کۆمەڵێک خەڵکی کەم لە بەرامبەر ئازادی زۆرتری کۆمەڵێک خەڵکی زۆرتردا پێوودانگ دەکرێ. وەلێ بە هەر پێوودانگێک بێت تەنها دەتوانم دەستەواژەکە بە ناڕاستییەکی خەیاڵ پلاوی دابنێم.

هەروەها یەکێک لەو تێڕوانینە بە لەزە سەرنجڕاکێشەرانەی زیاتر سەرنجم رادەکێشێت، ئەو تێڕوانینەیە، کە جار بە جار مستەر ئیێ. جێی. پی. تێیلەر لە بارەی ژیانی ئەکادیمی ئۆکسفۆردەوە پێشکەشمان دەکات.

تێیلەر دەڵێ: هەموو ئەو قسەو قسەلۆکانەی لە بارەی دارمانی چاندنەوە دەکرێن تەنها مانای ئەوەن، کە پرۆفیسۆرەکانی زانکۆ لە سەر هەبوونی خزمەتکاری ماڵی راهاتوون و ئێستاکەش خۆیان قاپ و قاچاخەکان دەشۆرن،(١٣١).

بێگومان لەوانەیە شۆردنی قاپ و قاچاخەکان لە لایەن پرۆفیسۆرەکانەوە لە جیاتی خزمەتکارە ماڵییەکانی پێشتر خۆی لە خۆیدا هێمایەکی پێشکەوتن بێت.

هەروەها لە دەستدانی دەسەڵاتی سپی پێستەکان لە ئەفریقیادا، کە هەوادارانی ئیمپراتۆرییەت دەخاتە گومانەوە، کۆمارستەکانی باشووری ئەفریقیاش، هەروەها بەرهەمهێنەرەکانی پشکی زێڕو مس، لەوانەیە لای هەندێک کەسی تر وەک پێشکەوتن بێنە بەرچاو. هیچ عەقڵانییەتێک لەوەدا نابینم بۆچی دەبێت لە بارەی ئەم پرسی پێشکەوتنەوە هەر بە سرووشت بڕیاری ١٩٥٠-کانم پێ لە بڕیاری ١٨٩٠-ەکان باشتربێ، یان بڕیاری خەڵکی ئینگلیزم پێ باشتربێ لە بڕیاری خەڵکی رووسی و ئاسیاو ئەفریقیا، یان بڕیاری رۆشنبیرانی.چینی ناوەڕاستم پێ باشتر بێت لە بڕیاری خەڵکی سەر جادە، کە بە گوێرەی قسەکانی مستەر ماکمیلان هەرگیز شتێکی ئەوەندە باشیان نەبووە.

بوارمان بدەن بۆ چرکەساتێک هەڵوەستە بڕیارێک لەسەر پرسەکە بدەین ئاخۆ لە سەردەمی پێشکەوتندا دەژیێن یاخود لە سەردەمی داڕماندا، هەروەها بوارمان بدەن تۆزێکی تر بە وردی ئەوە تاقی بکەینەوە، کە بە شێوەیەکی شاراوە لە چەمکی پێشکەوتندا دیاری پێدەدرێت، و چ گریمانانێک دەکەونە پشتییەوە، هەروەها تا چ ئەندازەیەک ئەم چەمک و گریمانانە بوونەتە چەمک و گریمانی بەرگری لێنەکراو.

بەر لە هەموو شتێک پێویستە ئەو هاشوو هووشەی دەربارەی پێشکەوتن و پەرەسەندن لە ئارادایە بڕەوێنمەوە.

بیرمەندانی چەرخی ڕۆشنگەری دوو تێڕوانینی بە ئاشکرا دژیەکیان هەڵبژاردووە.

ئەو بیرمەندانە ویستوویانە شوێنی مرۆڤ لە جیهانی سروشتدا بپارێزن: واتە یاساکانی مێژوویيان لەگەڵ یاساکانی سروشتدا یەکسان کردووە.

لە لایەکی ترەوە باوەڕیان بە پێشکەوتن هەبووە.

وەلێ ئایا بۆ دانانی سروشت وەک پێشکەوتنخوازو بە بەردەوامی دانانی وەک پێشکەوتنێکی بەردەوام بە ئاڕاستەی ئامانجێک چ زەمینەیەکی هەبووە؟

هیگڵ لە میانەی جیاکردنەوەیەکی توندی مێژوو لە سروشت، کە یەکەمیان پێشکەوتنخواز بووەو دووەمیان پێشکەوتنخواز نەبووە دووچاری ئاستەنگی و دڵەڕاوکێ هات.

وا دیار بوو شۆڕشی داروینی لە ڕێگەی یەکسان کردنی پێشکەوتن و پەرەسەندنەوە تەواوی کۆسپ و تەگەرەکان ڕابماڵێت:

لە کۆتاییدا سروشت بە چەشنی مێژوو بوو بە پێشکەوتنخواز. وەلێ ئەم یەکسانکردنە ڕێگەی لە یەکتر نەگشتنێکی مەترسیدارتری کردووە، ئەویش بە هۆی تێکەڵ و پێکەڵکردنی بۆ ماوەی بایەلۆژی لەگەڵ دەسکەوتی کۆمەڵایەتیدا، کە یەکەمیان سەرچاوەی پەرەسەندنەو دووەمیشیان سەرچاوەی پێشکەوتنە لە مێژوودا.

جیاکردنەوەکە ئاسایی و بێ پێچ و پەنایە.

منالێکی بچکۆلە لە خێزانێکی چینیدا دابنێ، منالەکە بە سپی پێستی گەورە دەبێ، بەلام بە چینی قسە دەکات.

ڕەنگی پێست بۆ ماوەیەکی (میرات) بایەلۆژییە، زمان دەسکەوتێکی کۆمەلایەتییە، کە لە

ڕێگەی توانای مێشکی مرۆڤە دەگوێزرێتەوە. لە میانەی بۆماوەییەوە پەرەسەندن بە هەزاران یان بە ملیۆنەها ساڵ پێوراوە؛ دوابەدوای دەستپێکردنی مێژووی نووسراو هیچ جۆرەگۆڕانێکی بەرپێوانەکراو لە مرۆڤدا رووی نەداوە.

بەڵام پێشکەوتن دەتوانرێ لە میانەی دەسکەوتەوە لە وەچەکاندا پێوانە بکرێ.

جەوهەری مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی عەقڵانی ئەوەیە، کە لە میانەی کەڵەکە کردنی ئەزموونی وەچەکانی رابردووەوە توانا شاراوەکانی پەرەپێبدات.

دەڵێن مرۆڤی مۆدێرن مێشکێکی فراوانترو توانایەکی زگماکی فراوانتری هزری نییە لە پێشینەکانی پێنج هەزار ساڵ بەر لە ئێستای.

وەلێ چالاککردنی بیرکردنەوەی مرۆڤ چەندین جار بە هۆی فێربوون و بە یەکەوە گرێدانی ئەزموونەکانی لەگەڵ ئەزموونی وەچەکانی رابردوودا زیادی کردووە.

گواستنەوەی تایبەتمەندییە دەردەستکەوتووەکان، ئەو گواستنەوەیەی بایەلۆژیناسەکان رەت دەکەنەوە، بریتییە لە بناغەیەکی راستەقینەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی.

مێژوو لە میانەی گواستنەوەی زەبر بە دەستییە دەردەستکەوتووەکانەوە لە وەچەیەکەوە بۆ وەچەیەکی تر پێش دەکەوێت. دووەم، نە پێویستیمان بەوە هەیەو نە دەشێ پێشکەوتن وەک خودان سەرەتایەک یان کۆتاییەکی دیاریکراو وێنا بکەین.

ئەو باوەڕەی کەمتر لە پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا هەرەمێنی هەبوو، کە بە گوێرەی ئەم بیروباوەڕە شارستانییەت لە هەزارەی چوارەمی بەر لە زاییندا لە دۆڵی نیل داهێنراوە، ئەمڕۆ لەو کرۆنۆلۆژیایە پتر جێگای متمانە نییە، کە دروستکردنی جیهانی لە ٤٠٠٤ - ی بەر لە زاییندا دادەنا.

لەوانەیە لە دایکبوونی شارستانییەت وەک خاڵێکی دەستپێکردنی گریمانی پێشکەوتن وەربگرین، بەڵام بە دڵنیاییەوە شارستانییەت داهێنانێک نەبووە، بەڵکو بریتی بووە لە رەوتێکی لەسەرخۆی بێ کۆتایی پەرەسەندن، کە تێیدا لەوانەیە لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر کۆمەڵە قەڵەمبازێکی سەرنجڕاکێش روویاندابێ.

پێویست ناکا خۆمان بەو پرسیارەو دووچاری دەردەسەری بکەین کەی پێشکەوتن- یان شارستانییەت- دەستی پێکردووە. گریمانی کۆتاییەکی دیاریکراوی پێشکەوتن لە یەکتر حاڵی نەبوونێکی خراپتری لێکەوتۆتەوە.

هیگڵ بەو بیانوەی کۆتایی پێشکەوتنی لە حکومەتی پاشایەتی پروسیادا دەبینی کەوتە بەر گازاندەو تۆمەتبارکردنەوە- بە شێوەیەکی بێ پێچ و پەنا ئەمە دەرئەنجامی شرۆڤەکردنێکی ماندووبووانەی تێڕوانینی خۆی بوو لە بارەی مەحاڵبوونی بەرینی کردنەوە.

وەلێ گومڕاییەکەی هیگڵ بە هۆی نووسەری بەناوبانگی سەردەمی ڤیکتوری ئارنۆلد روگبایەوە تاجی کرایە سەر، رووگبای لە دەسپێکی گەلاڵەنامەکەیدا وەک پرۆفیسۆری مێژووی هاوچەرخ لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لە ساڵی ١٨٤١-دا پێی وابوو مێژووی هاوچەرخ دوا قۆناغ دەبێت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا: ئەم چەمکە وا دیارە هێماکانی نەمانی کات هەڵبگرێت، وەک بڵێی لە دوای مێژووی هاوچەرخ مێژووی داهاتوو بوونی نابێ[١٣٢].

بەرینی کردنی مارکس، کە دەڵێ شۆڕشی کرێکاری لەوانەیە ئامانجی کۆتایی کۆمەڵگەیەکی بێ چینایەتی دەستەبەر بکات چ لە رووی لۆژیک و چ لە رووی ئەخلاقەوە کەمتر دەکەوێتە بەر رەخنەو توانج لێدانەوە؛ وەلێ پێشینە گریمانکردنی کۆتاییەکی مێژوو عەڵقەیەکی ئیسکاتۆلۆژیانەی هەیە، کە زیاتر لەگەڵ تیۆلۆژیناسدا دەگونجێت نەک لەگەڵ مێژوونووسدا، هەروەها بۆ هەڵەی ئامانجێکی دەرەوەی مێژوو دەگەڕێتەوە.

گومانی تیا نییە کۆتاییەکی سنووردار سەرنجی عەقڵی مرۆڤ رادەکێشێت؛ هەروەها وا دیارە تێڕوانینی ئاکتن لە بارەی رێوڕەسمی مێژوو وەک پێشکەوتنێکی بێ کۆتایی بە ئاراستەی ئازادی نارەحەت و نادیار بێت.

وەلێ ئەگەر بێت و مێژوونووس بیەوێ گریمانی پێشکەوتنەکەی رزگار بکات، ئەوا پێم وایە دەبێت ئامادەگی ئەوەی هەبێت ئەم گریمانەیە وەک رەوتێک دابنێت، کە داخواست و هەلومەرجی سەردەمەکانی دواتر کرۆکی تایبەتی خۆیان دەخەنە نێو ئەم رەوتەوە.

ئەمەش بریتییە لە مەبەستی تێزەکەی ئاکتن، کە دەڵێ مێژوو تەنها تۆمارێکی پێشکەوتن نییە، بەڵکو «زانستێکی پێشکەوتنخوازە»، یان گەر بتانەوێ، مێژوو بە هەریەکە لە دوو ماناکانی وشەکە- چ وەک رێڕەوی رووداوەکان و چ وەک تۆماری ئەو رووداوانە- پێشکەوتنخوازە.

بوارمان بدەن وەسفی ئاکتن لە بارەی پێشکەوتنی ئازادی لە مێژوودا بێنینەوە یاد: بە هۆی کۆششە یەکگرتووەکانی پەژموورەدەکانەوەیە لە ژێر سایەی تەنگەتاو کردندا دروستبووە، تا وەکو بەرەنگاری قەڵەمڕەوی هێزو هەڵەی بەردەوام بکات، بە شێوەیەک لە گۆڕانێکی خێرادا بەڵام لە پێشکەوتنێکی

تەوات و سستی چوارسەد ساڵەدا، ئازادی پارێزراوەو دەستەبەرکراوەو فراوانکراوەو دواجار مانای بە دەستەوە داوە[١٣٣]. ئاکتن لە رووی رێڕەوی رووداوەکانەوە مێژووی وەک پێشکەوتن بەرەو ئازادی وێناکردووە، بەڵام لە رووی تۆماری ئەو رووداوانە مێژووی وەک پێشکەوتن بەرەو تێگەیشتنی ئازادی وێناکردووە: کە وابوو هەردوو رەوتەکە شان بە شانی یەکتری پەرەیان سەندووە[١٣٤].

برادلی فەیلەسووف لە سەردەمێکدا دەینووسی، کە بەراوردکارییەکان لە سوونگەی پەرەسەندنەوە باو بوون، ئینجا سەرنجی داوەو دەڵێ: «لە روانگەی بیروباوەڕی ئایینییەوە کۆتایی پەرەسەندن ئەوە پێشکەش دەکات، کە پێشتر پەرەی سەندووە»[١٣٥].

بەڵام لە روانگەی مێژوونووسەوە کۆتایی پێشکەوتن پێشتر پەرەی نەسەندووە.

ئەمەش بریتییە لە شتێک هێژ بە چەشنێکی بێ سنوور دوورەدەستە؛ هەروەها دیاردیدەرەکان بەو ئاڕاستەیە تەنها کاتێک دەکەونە بەرچاو، کە ئێمە پێشبکەوین.

ئەمەش لە گرنگییەکەی کەم ناکاتەوە.

قیبلەنووماکە رێبەرێکی بە نرخ و بایەخدارە.

وەلێ نەخشەی رێگاکە نییە، بەم شێوەیە تەنها کاتێک نێوەڕێکی مێژوو تاقی دەکەینەوە دەتوانرێ ئەو نێوەڕۆکە بە دەستبهێنرێ.

خاڵی سێیەمم ئەوەیە هیچ کەسێکی ژیر هەرگیز باوەڕی بەو چەشنە پێشکەوتنە نەبووە، کە لە هێڵێکی راستی بێ هەورازو نشێودا پێشکەوتبێت و بە بەردەوامی تێپەڕ ببێ، تەنانەت توندوتیژترین هەڵگەڕانەوەش وەک پێویست ئەوەندە بۆ بیروباوەڕەکە کوشندە نییە. بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا سەردەمەکانی داکشانەوەو سەردەمەکانی پێشکەوتن هەن.

سەرەڕای ئەوە، رەنگە کردەیەکی هەڵەشانە بێت گریمانی ئەوە بکەین، کە دوای پاشەکشەکردنێک، پێشکەوتن لە هەمان خاڵەوە یاخود بە درێژایی هەمان هێڵ دووبارە دەست پێدەکاتەوە.

سێ چوار شارستانییەکەی هیگڵ و مارکس، بیست و یەک شارستانییەکەی توینبی، و تیۆری خوولی ژیانی شارستانییەکان کە پێی وایە شارستانییەکان بە نێو سەرهەڵدان و لەبەریەک هەڵوەشان و دارماندا تێپەڕبوون- ئەم جۆرە نەخشەسازییانە خۆی لە خۆیدا مانایەک نابەخشن.

وەلێ ئەم نەخشەسازییانە هێمایەکی ئەو راستییە تێبینی کراوانەن، کە ئەو کۆششەی بۆ بەرەوپێش بردنی شارستانی پێویستە لە شوێنێکدا لە ناو دەچێت و دواتر لە شوێنێکی تردا دووبارە دەبێتەوە، کە

وابوو هەر جۆرە پێشکەوتنێک لە مێژوودا تێبینی بکەین، ئەوا بە دڵنیاییەوە چ لە رووی کات و چ لە رووی شوێنەوە بە هەمیشە بەردەوام نییە.

لە راستیدا، گەر خووم بە فۆرمەلکردنی یاساکانی مێژووەوە گرتبێت، ئەوا یەکێک لەو یاسایانە لەوانەیە دەرئەنجامی ئەو گروهە بێ- ناوی دەنێی چین، نەتەوەیەک، کیشوەرێک، شارستانییەک، ئەوەی دەتەوێ- کە لە سەردەمێکدا رۆڵی پێشەنگبوون لە پێشخستنی شارستانییەتێکدا دەگێڕێ، بەڵام لەوە ناچێ هەمان رۆڵ لە سەردەمی داهاتوودا بگێڕێت، ئەمەش لەبەر ئەو هۆکارەیە، کە سەردەمەکە تا سەر ئێسقان بە تەقلیدو سەرنج و ئایدیۆلۆژیاکانی سەردەمی پێشتر جۆشدراوە بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی لەگەڵ خواست و هەلومەرجەکانی سەردەمی داهاتوودا بگونجێنێ[١٣٦].

کە وابوو لە جێگای خۆبەتی سەردەمێکی لەبەریەک هەڵوەشان لای گروهێک لە دایکبوونی پێشکەوتنێکی نوێ لای گروهێکی دیکە بنوێنێ.

پێشکەوتن بە هیچ شێوەیەک مانای پێشکەوتنی یەکسان و هاوزەمان بۆ هەمووان ناگەیەنێ.

شتێکی گرنگە ئەوە بزانین، کە تا رادەیەک هەموو پێغەمبەرانی رۆژگاری دواتری باس لێوەکەرانی لەبەریەک هەڵوەشان و ئەو گومانبەرانەشمان، کە هیچ مانایەک لە مێژوودا بە رەوا نابینین و گریمانی ئەوە دەکەن پێشکەوتن شتێکی مردووە، سەر بەو بەشەی جیهان و سەر بە ئەو چینەی کۆمەڵگەن، کە بە شێوەیەکی سەرکەوتووانە بۆ چەندین وەچە رۆڵی پێشەنگێک و سەردەستەیەکیان لە پێشخستنی شارستانییەتدا گێڕاوە.

هیچ شین و گریانێکی بۆ ئەوان تێدا نییە، گەر باس لەوە بکەن، کە ئەو رۆڵەی گروهەکەیان لە رابردوودا گێڕاویەتی لەم ساتەدا گروهی دیکە دەیگێڕن.

بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا مێژوویەک، کە گاڵتەیەکی زۆر سووک و چروکانەیان پێدەکات ناتوانێ ببێتە رەوتێکی پڕ ماناو عەقڵانی .

وەلێ ئەگەر مەبەستمان دەستپێوەگرتنی گریمانی پێشکەوتن بێت، ئەوا پێم وایە دەبێت مەرجی هێڵە پچڕ پچڕەکە قبووڵ بکەین.

لە کۆتاییدا، دیە سەر باسی ئەو پرسەی نێوەڕۆکی جەوهەری پێشکەوتن بە گوێرەی کردەی مێژوویی چییە.

بۆ نموونە، ئەو خەڵکانەی لە پێناو فراوانکردنی مافە مەدەنییەکان بۆ هەمووان، یان لە پێناو

چاکسازی جێبەجێکردنی سزادا، یان لە پێناو لە ناوبردنی نایەکسانییەکانی رەگەزو ساماندا تێدەکۆشن، ئەوانە خەڵکانێکن کتومت بە شێوەیەکی هۆشیارانە دەیانەوێ ئەو حاڵەتانە ئەنجام بدەن: ئەوان بە شێوەیەکی ناهۆشیارانە بە دوای، «پێشکەوتن»دا دەگەڕێن بۆ ئەوەی «یاسایەک» یان «گریمانێک» یان «پێشکەوتنێکی مێژوویی» بەدەست بهێنن.

ئەو کەسە مێژوونووسە، کە گریمانی پێشکەوتنی خودی خۆی بە سەر کردەوەکانیاندا جێبەجێ دەکات، هەروەها کردەوەکانیان وەک پێشکەوتن شرۆڤە دەکات.

وەلێ ئەمە چەمکی پێشکەوتن پووچەڵ ناکاتەوە.

خۆم بە خۆشحاڵ دەزانم، کە لەم حاڵەدا هاوڕای سێر ئیزیاه بێرلینم، کە هەرچەندە هەریەک لە وشەکانی، پێشکەوتن و کۆنەپەرستی» لەوانەیە تا رادەیەکی زۆر بە خراپی بەکارهێنرابن، بەڵام دوو چەمکی پووچ و ڤالا نین»[١٣٧].

ئەم دەستەواژەیە بریتییە لە پێشینە گریمانی مێژوو، کە دەڵێ مرۆڤ لە میانەی ئەزموونی پێشینەکانییەوە توانای سوود وەرگرتنی هەیە (هەرچەندە وەک پێویست سوود وەرناگرێت)، هەروەها دەڵێ پێشکەوتن لە مێژوودا بە پێچەوانەی پەرەسەندن لە سروشتدا وابەستەی گواستنەوەی سەرچاوە دەردەستکەوتووەکان دەبێت.

ئەم سەرچاوانە هەریەک لە سامانی ماددی و توانای دەستبەسەراگرتنی ژینگەو گۆڕینی بۆ ژینگەیەکی بە سوود، دەگرنەوە.

لە راستیدا هەریەک لە دوو فاکتەرەکە بەندیوارییەکی زۆر نزیکیان بە یەکترەوە هەیەو هەریەکەیان کار دەکاتە سەر ئەوەیتر.

مارکس کۆشش و کردەوەی مرۆڤ وەک بناخەی کۆشکێکی ئاودامان دادەنێت، وا دیارە ئەم فۆرمەلەیە شیاوی قبوولکردن بێت، بە مەرجێک گەر بێت و مانایەکی فراوانتری تەواو بە واژەی، کۆشش و کردەوە،وە بلکێندرێت.

وەلێ کەڵەکەکردنی سەرچاوەکان بە تەنها سوودی نییە، تەنها مەگەر بێتوو نەک تەنها لەگەڵ کەڵەکەکردنی سەرچاوەکاندا ئەزموون و مەعریفەی تەکنیکی و کۆمەڵایەتی زێدە بوو بهێنرێتە بەرهەم، بەڵکو دەبێ سەردەستەیی زێدەبووی ژینگەی مرۆڤیش بە مانایەکی فراوانتر بەرهەم بهێنرێت، ئینجا ئەم کەڵەکەکردنە سوودی دەبێت.

پێم وایە لەم ئان و ساتەدا کەمێکی خەڵک پرسیار لە بارەی راستەقینەیی پێشکەوتن دەکەن لە کەڵکەکردنی هەریەک لە سەرچاوە ماددییەکان و مەعریفە زانستیدا، هەروەها بە هەمان شێوە لە بارەی سەردەستەیی زاڵبوون بەسەر ژینگەشدا بە مانایەکی تەکنۆلۆژی خەڵکێکی کەم دەکەونە پرسیارکردنەوە.

ئەوەی دەخرێتە ژێر پرسیارەوە ئەوەیە ئاخۆ هیچ پێشکەوتنێک لە سەدەی بیستەمدا لە سیستەمی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەمان، و سەردەستەییمان بەسەر ژینگەی کۆمەڵایەتی، و ژینگەی نەتەوەیی یان نێونەتەوەیی ئەنجامدراوە، ئاخۆ لە راستیدا هیچ بەرەو پاشەوەچوونێکی بەرچاو رووی نەداوە. ئایا پەرەسەندنی مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی داماوی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی چارەنووسساز ناکەوێتە پشتی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژییەوە؟

ئەو نیشانەی ئەم پرسیارە سروش دەکەن روون و بەرچاون. وەلێ سەرەڕای ئەوە گومانی ئەوە دەبەم، کە بە هەڵە بخرێتەڕوو.

مێژوو چەندین خاڵی وەرچەرخانی زانداروی هەیە، ئایا لە کوێدا سەرکردایەتی و دەسادەیی لە گروهێکەوە بۆ گروهێکی دیکە تێپەڕیووە، ئایا لە کامە بڕگەی جیهانەوە بۆ بڕگەکەی تر گوێزراوەتەوە: سەردەمی سەرهەڵدانی دەوڵەتی مۆدێرن و گوێزرانەوەی چەقی دەسەڵات لە ناوچەکانی دەریای ناوەڕاستەوە بۆ ئەورووپای رۆژئاوا، و سەردەمی شۆڕشی فەڕەنسی، گەر هەریەک لەمانە بریتی بووبن لە نموونەی مۆدێرنی روون و ئاشکرا، ئەوا ئەم سەردەمانە هەمیشە سەردەمی گۆڕانکاری توندوتیژو تێکۆشانن لە پێناو هێزو دەسەڵاتدا.

دەسەڵاتە کۆنەکان لاواز دەبن، و نیشانەکانی وەرچەرخانی کۆن ون دەبن، لە سوونگەی بە یەکدادانێکی تێکورکانەو جارسبوونیشەوە سیستەمی نوێ سەرهەڵدەدات.

ئەوەی دەمەوێ پێشنیاریکەم ئەوەیە، کە ئێمە بە نێو سەردەمێکی لەم چەشنەدا تێدەپەڕین.

پێم وایە بە سادەیی و ساکاری لای من هەڵەیە باس لەوە بکەم، کە تێگەیشتنمان لە پرسی رێکخستنی کۆمەڵایەتی یانیش هەستی هاوڕێیەتیمان بۆ رێکخستنی کۆمەڵگە لە ژێر سایەی ئەوەی، کە ئەم تێگەیشتنە بەرەو دوا نشووستی هێناوە: لە راستیدا بە سەرکەشییەوە دەڵێم ئەم تێگەیشتنانە زۆر زیاتربوونە.

مەسەلەکە ئەوە نییە تواناکانمان کەمیان کردبێت، یان چۆنیەتییە ئەخلاقییەکانمان لەبەریەک

هەڵوەشابن، بەڵکو مەسەلە ئەوەیە بە هۆی گۆڕانی تەرازووی دەسەڵات لە نێوان کیشوەرەکان و نەتەوەکان و چینەکاندا سەردەمی کێشمەکێشم و گۆڕانی لە پڕی کۆمەڵایەتی بێ شوومار فشاری لەسەر ئەم تواناو چۆنیەتییانە زیادکردوەو چالاکبوونیانیشی لە پێناو دەسکەوتی پۆزەتیڤدا سنووردارو پووچەڵکردۆتەوە، کە وابوو ئێمەش لە ناو ئەو سەردەمە نێوبراوەدا ژیان دەگوزەرێنین.

لە کاتێکدا حەز ناکەم هێزی مەیدانخوازی پەنجا ساڵی رابردوو لەمەڕ باوەڕبوون بە پێشکەوتن لە جیهانی رۆژئاوادا لەکەدار بکەم، وەلێ هێژ بەوە قایل نیم، کە پێشکەوتن لە مێژوودا بە کۆتاهاتبێت.

وەلێ پێم وایە، گەر زێتر لە سەر نێوەڕۆکی پێشکەوتن تەنگەتاوم بکەن، ئەوا تەنها دەتوانم شتێکی لەم چەشنە وەڵام بدەمەوە.

بیرۆکەی ئامانجێکی سنووردارو خۆش پێناسی پێشکەوتن لە مێژوودا بە زۆری لە لایەن بیرمەندانی سەدەی نۆزدەهەمەوە گریمانکرا، ئینجا سەلمێندرا نەزۆک و نەپراکتیزە. باوەڕ بە پێشکەوتن مانای باوەڕبوون نییە بە هەر رەوتێکی حەتمی و ئۆتۆماتیکی، بەڵکو باوەڕبوونە بە پەرەسەندنی پێشکەوتنخوازی توانا شاراوەکانی مرۆڤ. پێشکەوتن زاراوەیەکی پەتییە؛ هەروەها ئەو ئامانجە بەرهەستانەی مرۆڤ عەوداڵی دەردەستکردنیانییە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی لە سوونگەی رەوتی مێژووەوە سەرچاوە دەگرن، نەک لە سەرچاوەیەکی تری دەرەوەی مێژوو.

دان بەوەدا دەنێم نە باوەڕم بە تەواوکاری مرۆڤەو نە بە بەهەشتێکی داهاتووە لە سەر زەویدا.

رەنگە تا ئەو ئەندازەیە لەگەڵ تیۆلۆژیست و سۆفییەکاندا بسازێم، کە جەخت لەسەر ئەوە بکەن ئەو قەباڵبوونە لە مێژوودا بەر بار نییە.

وەلێ بە توانستی بێ سنووری پێشکەوتن- یان پێشکەوتنێک کە ناکەوێتە ژێر هیچ سنوورێکەوە بۆ ئەوەی بتوانین یان پێویستمان پێی بێ وێنای بکەین- بە ئاراستەی ئەو ئامانجانە رازیم، کە تەنها کاتێک دەتوانرێ پێناس بکرێن، کە ئێمە بەرەو پیریانەوە بچین، هەروەها تەنها لە پرۆسێسی بەدەستهێنانیاندا بتوانرێ راستیەتیان هورکار بکرێت.

نازانم چۆن کۆمەڵگە بەبێ چەمکێکی لەم چەشنەی پێشکەوتن لە ژیان بەردەوام دەبێت.

هەموو کۆمەڵگەیەکی ژیار لە پێناو بەرژەوەندی وەچە هێژ لە دایک نەبووەکاندا کۆمەڵێک قوربانی بەسەر وەچە زیندووەکاندا دەسەپێنێ.

بەر پاساوکردنی ئەم قوربانییانە بە ناوی جیهانێکی باشتر لە داهاتوودا بریتییە لە قامێکی

عەلمانی بەر پاساوکردنیان بە ناوی مەبەستێکی یەزدانییەوە.

بە گوێرەی گووتەکانی بێری، بنەمای ئەرک و فەرمانی وەچەی داهاتوو دەرئەنجامێکی سروشتی راستەوخۆی بیرۆکەی پێشکەوتنە»[١٣٨].

لەوانەیە ئەم ئەرک و فەرمانە پێویستی بە بەرپاساوکردن نەبێت.

ئینجا گەر پێویستیشی بە بەرپاساوکردن بێت، ئەوا رێگەیەکی تری بەرپاساوکردنی ئەم ئەرک و فەرمانە نازانم.

ئەمەش بەرەو خاڵێکی گرنگتری بابەتگەرایم دەبات لە مێژوودا. خودی وشەکە فریودەرو بەرگوومانە.

لە گەڵاڵە نامەیەکی پێشتردا ئەوەم تاووتوێکردبوو، کە زانستە کۆمەڵایەتییەکان بە مێژووشەوە ناتوانن خۆیان لەگەڵ تیۆری ئەو مەعریفەیەدا بگونجێنن، کە خودو بابەت دوور لە یەکتری دادەنێت، هەروەها جیاکردنەوەیەکی توند لە نێوان چاودێریکەرو چاودێریکراودا دەسەپێنێ. پێویستیمان بە شێوازێکی نوێ دەبێت، کە لەمەڕ رەوتی پەیوەندی ئاڵۆزی ئاڵوگۆڕو کارلێککردنی نێوانیاندا دادوەری بکات.

راستییەکانی مێژوو ناتوانن ببنە راستی پەتی بابەتییانەی مێژوو، چونکە تەنها کاتێک دەبنە راستی مێژوو، کە مێژوونووس گرنگی و مانایان پێوە دەلکێنێ.

گەر هێژ لەسەر بەکارهێنانی زاراوە تەقلیدییەکە بەردەوامبین، ئەوا ناتوانرێ بابەتگەرایی لە مێژوودا ببێتە بابەتگەرایی راستییەک، بەڵکو تەنها دەبێتە بابەتگەرایی پەیوەندی نێوان راستی و شرۆڤەکردن و پەیوەندی نێوان رابردوو، و ئێستا، و داهاتوو.

پێویستیم بەوە نییە بگەڕێمەوە سەر ئەو هۆکارانەی، کە وایان لێکردم هەوڵی بڕیاردان لەسەر رووداوە مێژووییەکان لە میانەی دامەزراندنی پێوودانگێکی رەهای بەهاکان لە دەرەوەو جیا لە مێژوو وەک شتێکی نامێژوویی رەت بکەمەوە.

بەڵام چەمکی راستی رەها لەگەڵ جیهانی مێژوودا ناگونجێ، یان گومان دەبەم لەگەڵ جیهانی زانستیشدا ناگونجێ. تەنها سادەترین جۆری روونکاری مێژوویی دەتوانێ بڕیار لەسەر ئەوە بدات بە شێوەیەکی رەها راستە یان بە شێوەیەکی رەها هەڵەیە.

بۆ نموونە، لە ئاستێکی ئاڵۆزتردا مێژوونووس، کە مشتومڕی بڕیاری یەکێک لە پێشینەکانی

دەکات، هەڵدەستێ بە شێوەیەکی ئەخلاقی تۆمەتباری دەکات، نەک وەک هەڵەیەکی رەها، بەڵکو وەک ناتەواوی، یان وەک تاک لایەنە، یان وەک فریودەر، یان وەک بەرهەمی ئەو تێڕوانینە تۆمەتباری دەکات، کە بەڵگەکانی دواتر کەوناراو نا پێوەندکراوە.

ئەو گووتەیەی دەڵێ شۆڕشی رووسیا بە هۆی گەوجی نیکۆلاسی دووەم یان بە هۆی لێهاتوویی لینینەوە هەڵگیرسا ئەوەندە ناتەواوە، کە بە تەواوی فریودەرە.

بەڵام ناتوانرێ بە شێوەیەکی رەها پێی بووترێ هەڵە.

مێژوونووس لە شتە رەهاکانی ئەم چەشنە ناکۆڵێتەوە.

با دووبارە بێینەوە سەر حاڵەتە پەژارەدارەکەی مردنی رۆبنسن.

بابەتگەرایی لێکۆڵینەوەکەمان لەم رووداوە وابەستەی ئەوە نابێ راستییەکانمان بە شێوەیەکی دروست بە دەستبهێنین- چونکە ئەمانە جێگای مشتومڕ نەبوونە- بەڵکو وابەستە دەبێ بە جیاکردنەوەی نێوان راستی یا راستییە گرنگەکان، کە تامەزرۆیان بووین، و راستییە رێکەوتەکان، کە توانیمان فەرامۆشیان بکەین.

بە ئاسانمان زانی ئەم جیاکردنەوەیە ئەنجام بدەین، چونکە پێوودانگ و ئەزموونی گرنگی ماناکە بریتی بوو لە بنچینەی بابەتگەرایی روون و ئاشکرای ئێمە، هەروەها بەندیواربوو بە ئامانجی کەمکردنەوەی مردووەکان لەسەررێگە.

وەلێ ئەو مێژوونووسە کەسێکی کەم بەختترە لەو لێکۆڵەرەی، کە لە پێش ئەودا مەبەستی سادەو سنووورداری کەمکردنەوەی قوربانیانی پەڕینەوەی هەیە.

هەروەها مێژوونووس لە ئەرک و فەرمانی شرۆڤەکردنەکەیدا پێویستی بە پێوودانگی گرنگی ماناکە دەبێت، کە بریتییە لە پێوودانگی بابەتگەراییکەشی، بۆ ئەوەی جیاوازی لە نێوان رووداوی گرنگ و رێکەوتی ناجەوهەریدا بکات؛ هەروەها تەنها دەتوانێ لە بەندیوارییەتی ئامانجەکەدا ئەم پێوودانگە بدۆزێتەوە.

بەڵام ئەم ئامانجە وەک پێویست ئامانجێکی پەرەپێدەرە، چونکە شرۆڤەکردنی پەرەپێدەری رابردوو ئەرکێکی پێویستی مێژووەوە.

ئەو گریمانە تەقلیدییەی دەڵێ گۆڕان هەمیشە بە گوێرەی شتێکی چەسپاو و نەگۆڕەوە راڤە دەکرێت، پێچەوانەی ئەزموونەکانی مێژوونووسە.

پرۆفیسۆر بە تەرفیلد دەڵێ: ئەو مێژوونووسەی تەنها ڕەهابوون بە گۆڕان بزانێ لەوانەیە بە شێوەیەکی شاراوە بوارێک بۆ خۆی بە شایان ببینێ، کە مێژوونووسان پێویستییان بەوە نییە پەیڕەوی ئەو بکەن(۱۳۹).

ڕەهایی لە مێژوودا شتێک نییە لە رابردوو تا لێیەوە دەست پێبکەین؛ شتێک نییە لە ئێستادا، چونکە هەموو هزرێکی ئێستا وەک پێویست ڕێژەییە.

ڕەهایی شتێکە هێژ ناتەواوەو لە ڕەوتی دروستبووندایە- ڕەهایی شتێکە لە داهاتوودا، کە بە پیریبیەوە دەچین، تەنها کاتێک شێوە دەگرێ، کە بە پیریبیەوە بچین، ئینجا لە ژێر تیشکی ڕەهاییدا کاتێک بە پیرییەوە دەچین بەرە بەرە شرۆڤەکردنی رابردوومان دروستدەکەین.

ئەمەش بریتییە لە ڕاستییەکی عەلمانی لە دوای ئەو ئەفسانە ئایینییەی دەڵێ تەنها لە ڕۆژی دواییدا مانای مێژوو دەردەکەوێ. پێوودانگەکەمان پێوودانگێکی ڕەها نییە بە مانایەکی چەقبەستووی هەندێک شت، بە شێوەیەک بڵێ دوێنێ و ئەمڕۆ و هەمیشە هەمان شتە: ئەم چەشنە ڕەهاییەش لەگەڵ سروشتی مێژوودا ناگونجێت.

بەڵام لە ڕووی ڕاڤەکردنمان لە بارەی رابردووەوە شتێکی ڕەهایە.

ئەم ڕەهاگەراییە ئەو تیۆرە ڕێژەییە ڕەت دەکاتەوە، کە دەڵێ هەر شرۆڤەکردنێک وەک یەکێکی تر باشە، یان دەڵێ هەموو شرۆڤەکردنێک لە کات و شوێنی خۆیدا ڕاستە، هەروەها ئەو سەنگی مەحەکە دەستەبەر دەکات، کە لە میانەیەوە شرۆڤەکەمان لە بارەی رابردوو بڕیاری کۆتایی لەسەر دەدرێت.

ئەمەش تاکە مانای ئاراستەیە لە مێژوودا، کە وزەمان پێدەبەخشێ ڕووداوەکانی رابردوو ڕێکبخەین و شرۆڤەیان بکەین- ئەمەش بریتییە لە ئەرکی مێژوونووس- هەروەها تاکە ئاراستەیە لە ئێستا وزەو تواناکانی مرۆڤ لە پێناو داهاتوودا بەرەڵلا بکات و ڕێکبخات- ئەمەش ئەرکی پیاوانی دەوڵەت و ئابووریناسان و چاکسازە کۆمەڵایەتییەکانە.

وەڵێ خودی بە دینامیکی و پێشکەوتنخواز دەمێنێتەوە. کاتێک هەریەک لە هەستی ئاراستەکەمان و شرۆڤەکەمان لە بارەی رابردوو پێشکەش دەکەین هەردووکیان دووچاری پەرەسەندن و هەموارکردنی بەردەوام دەبن.

هیگڵ ڕەهاییەکەی لە شێوەیەکی سۆفیگەرانەی جیهانی ڕۆحدا داپۆشیوەو هەڵەیەکی بنچینەیی لەوەدا کردووە لە جیاتی ئەوەی مێژوو بەرەو داهاتوو ئاراستە بکات لە سەردەمی ئێستادا کۆتایی بە

ڕەوتی مێژوو هێناوە.

هیگڵ ڕەوتێکی بەردەوامی پەرەسەندن لە ڕابردوودا دەبینێتەوە، کەچی بە شێوەیەکی نەشیاو ئەم ڕەوتە لە داهاتوودا ڕەتدەکاتەوە. ئەوانەی دوای هیگڵ، کە تا سەر ئێسقان بیریان لە سروشتی مێژوو کردەوە تێکەڵەیەکی پێکهاتوو لە ڕابردوو-و- داهاتوویان لە نێو ئەو سروشتەدا بینییەوە. تۆکڤیل هەرچەندە بە تەواوی خۆی بەرینەکرد لە زمانی تیۆلۆژی سەردەمەکەی و نێوەڕۆکێکی زۆر تەنگی بە ڕەهاییەکەی بەخشی، بەڵام گەیشتە جەوهەری پرسەکە.

تۆکڤیل وەک دیاردەیەکی ئاودامان و بەردەوام قسەی لە بارەی پەرەسەندنی یەکسانییەوە کردووەو دەڵێ: ئەگەر خەڵکی ئەم سەردەمەمان وەک ڕابردوو-و- داهاتووی مێژووەکەیان لە یەک کاتدا بڕواننە پەرەسەندنی هەنگاو بە هەنگاو و پێشکەوتنخوازی یەکسانی ، ئەوا ئەم تاکە دۆزینەوەیە تایبەتمەندییەکی پیرۆزی ویستی سەروەرو پەروەردگاریان بەم پەرەسەندنە دەبەخشێ(١٤٠).

دەتوانرا بەشێکی گرنگی لەسەر ئەو بیرۆکە هێژ ناتەواوە بنووسرایە.

مارکس هەرچەندە بەشداری چەند قەدەغەکردنێکی هیگڵی کردووە لە بارەی ڕوانین لە داهاتوو، هەروا بە شێوەیەکی سەرەکی خۆی بەوە خەریککردووە، وانە گووتنەوەکەی بە شێوەیەکی چەسپاو لە مێژووی ڕابردوودا ڕیشە داکوتێ، بەڵام بە هۆی سروشتی بابەتەکەیەوە ناچاربوو ڕەهاییەکەی لە بارەی کۆمەڵگەی بێ چینایەتییەوە پەڕاگەندەی داهاتوو بکات.

بیری تۆزێک بە دەبەنگی بیرۆکەی پێشکەوتنی بە هەمان مەبەست بە تیۆرێک وەسفکردووە، کە پێکهاتەیەکی ڕابردوو-و- بەربینییەکی داهاتوو دەگرێتەوە(١٤١).

نامیەر لە دەستەواژەیەکی بە ئەنقەست دژیەکدا بۆ دەوڵەمەندکردنی نموونەکانی دەڵێ: «مێژوونووسەکان ڕابردوو وێنا دەکەن و داهاتوو وەبیر خۆیان دێننەوە»(١٤٢). تەنها داهاتوو دەتوانێ کلیلی شرۆڤەکردنی ڕابردوو دەستەبەر بکات؛ ئێمەش تەنها بەو مانایە دەتوانین قسە لە بارەی بابەتگەرایی کۆتایی لە مێژوودا بکەین.

ئەو گوتەیەی دەڵێ ڕابردوو تیشک دەخاتە سەر داهاتوو، هەروەها داهاتووش تیشک دەخاتە سەر ڕابردوو لە یەک کاتدا لە ئاستی بەر پاساوکردن و شرۆڤەکردنی مێژوودایە.

کە وابوو مەبەستمان لەوە چییە کاتێک ستایشی بوونە بابەتگەرایی مێژوونووسێک دەکەین، یان دەڵێین مێژوونووسێک لە مێژوونووسێکی تر بابەتیترە؟

به شێوەیەکی دیارو بەرچاو مەبەستمان ئەوە نییە مێژوونووس ڕاستییەکانی بە دروستی بە دەست بێنێ، بەڵکو زیاتر مەبەستمان ئەوەیە ڕاستییە دروستەکان هەڵبژێرێ، یان بە مانایەکی دیکە مەبەستمان ئەوەیە پێوودانگی دروستی گرنگی ماناکە جێبەجێ بکات.

پێم وایە کاتێک بە مێژوونووسێک دەڵێین بابەتی مەبەستمان دوو شتە.

پێش هەموو شتێک مەبەستمان ئەوەیە توانای هەیە لە سەر ئاستی تێڕوانینە سنووردارەکانی پێگەی خۆی لە کۆمەڵگەو مێژوودا زاڵبێت و بەرزبێتەوە- توانایەک، هەروەک لە گەلاڵە نامەیەکی پێشتردا پێشنیارمکرد، تا ڕادەیەک وابەستەی توانای خۆی بێت بۆ ناسینەوەی ئەندازەی تێوەگلانەکەی لەو پێگەیەدا، واتە بۆ ناسینەوەی مەحاڵییەتی بابەتگەرایی گشتی.

دووەم، مەبەستمان ئەوەیە مێژوونووس توانای ئەوەی هەیە بە ڕێگایەکی لەم چەشنە تێڕوانینەکەی پەراگەندەی داهاتوو بکات بە شێوەیەک تێڕوانینەکە بتوانێ ڕوانینێکی بەردەوامتر و قووڵتری لەمەڕ ڕابردوو بداتێ، کە زیاتر بێ لە ڕوانینی ئەو مێژوونووسانەی تێڕوانینیان بە تەواوی بە هۆی پێگەی ڕاستەوخۆ یان لە کۆمەڵگەدا کۆسپی تێدەکەوێ. ئەمڕۆکە هیچ مێژوونووسێک لە ڕووی، مێژووی کۆتایی» متمانەی ئاکتن دووبارە ناکاتەوە.

وەلێ هەندێ مێژوونووس بە شێوەیەکی تۆکمەتر مێژوو دەنووسن، هەروەها تایبەتمەندی ئەم چەشنە کۆتایی و بابەتگەراییەی لە مێژوونووسانی دیکە زیاترە، ئەمانەش ئەو مێژوونووسانەن، کە تایبەتمەندییەکیان هەیە ڕەنگە من بە، تێڕوانینی ماوە درێژ بە سەر ڕابردوو-و- داهاتوودا نێوزەدی بکەم.

مێژوونووسی پسپۆڕ لە ڕابردوو تەنها کاتێک دەتوانێ خۆی لە بابەتگەرایی نزیک بکاتەوە، کە بە پیر تێگەیشتنی داهاتووەوە بچێت.

هەر لەبەر ئەوە بوو لە گەلاڵە نامەیەکی پێشتردا وەک دایەلۆگێک لە نێوان ڕابردوو-و- داهاتوو قسەم لە بارەی مێژوو کرد، بە شێوەیەکی وردتر دەبوو بە دایەلۆگی نێوان بوویەرەکانی ڕابردوو-و- بوویەرەکانی داهاتوو، و بەرە بەرە سەرهەڵدانی ئامانجەکانی داهاتوو ناوم ببردنایە. شرۆڤەکردنی مێژوونووس لە بارەی ڕابردوو و هەڵبژاردنی ڕاستی ماناداروو بەندیوار بە بابەتەکە، بە هۆی سەرهەڵدانی پێشکەوتنخوازانەی ئامانجە نوێکانەوە پەرەدەسێنێت.

با ئاسانترین ڕوونکردنەوە وەربگرین، مادام ئامانجی سەرەکی ڕێکخستنی ئازادییە

دەستوورییەکان و مافە سیاسییەکان بێت، ئەوا مێژوونووس بە زاراوەی سیاسی و دەستووری رابردوو شرۆڤە دەکات.

کاتێک ئامانجە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان جێگای ئامانجە سیاسی و دەستوورییەکان دەگرنەوە، مێژوونووسان دەگەڕێنەوە سەر شرۆڤە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان لە بارەی رابردوو.

لەم رەوتەدا رەنگە گومانبەر بە شێوەیەکی ماقووڵانە بڵێ شرۆڤەی نوێ لە شرۆڤەی کۆن راستتر نییە؛ و هەریەکیان بۆ سەردەمی خۆیان راستن.

سەرەڕای ئەوە، چونکە خۆخەریککردنی پێشوەخت بە ئامانجە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان قۆناغێکی فراوانترو پێشکەوتووتری پەرەسەندنی مرۆڤ لە خۆخەریککردنی پێشوەخت بە ئامانجە سیاسی و دەستوورییەکان گوزارشت دەکات، کەوابوو رەنگە بوترێ شرۆڤەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی مێژووش قۆناغێکی پێشکەوتووتری مێژوو لە شرۆڤەکردنێکی پاوانکراوی سیاسی گوزارشتبکات.

شرۆڤەکردنی نوێ شرۆڤەکردنی کۆن رەت ناکاتەوە، بەڵکو لە نێو خۆی دەگرێت و جێگەی دەگرێتەوە.

نووسینی مێژوو لەسەر بنەمای تاقیکردنەوەی رەخنەیی سەرچاوەکان (Historigraphy) بریتییە لە زانستێکی پێشکەوتنخواز، بەو مانایەی بە بەردەوامی هەوڵی دابینکردنی فراوانکردن و قووڵکردنەوەی تێڕوانینەکان دەدات بە نێو رەوتی ئەو بوویەرانەی، کە خۆی لە خۆیدا رەوتێکی پێشکەوتنخوازە. ئەمەش ئەو تێڕوانینەیە، کە تێیدا پێویستیمان بە چەمکی، تێڕوانینێکی رۆنەر لە رابردوو»دا دەبێت.

هیستۆریگرافی هاوچەرخ لە ماوەی ئەم دوو سەدەیەی رابردوودا بە باوەڕبوونێکی دوولایەنە بە پێشکەوتن گەشەی سەندووە، هەروەها ناتوانێ بەبێ ئەم چەشنە باوەڕە لە بووندا بمێنێتەوە، چونکە ئەمە بریتییە لەو باوەڕەی، کە بە پێوودانگی گرنگ و پڕ مانای خۆیی و بە سەنگی مەحەکی خۆی هیستۆریۆگرافی ساز دەکات بۆ جیاکردنەوەی نێوان راستی و رێکەوتی ناجەوهەریدا.

گۆتە (Geothe) لە گفتوگۆیەکی دوا ساتەکانی تەمەنیدا تا رادەیەک بەبێ پەروایی گرێی گۆردیانی بری و دەڵێ: کاتێک سەردەمەکان بەرەو نەمان دەچن، هەموو ئامانجەکان خودین، بەڵام لە لایەکی ترەوە کاتێک هەموو دۆزەکان ئامادەی سەردەمێکی نوێن، هەموو ئامانجەکان بابەتین[١٤٣].

هیچ کەسێک دەسبەرداری ئەوە نییە نە باوەڕ بە داهاتووی مێژوو نە باوەڕ بە داهاتووی کۆمەڵگەش بکات.

دەشێ بڵێین لەوانەیە کۆمەڵگەکەمان بە هۆی گەندەڵی لە سەرخۆ کاول دەبێ یانیش تیادەچێ، هەروەها بڵێین لەوانەیە مێژوو بەبێ ئامانج یان مانایەکی گرنگ دەبێتە تیۆلۆژیا (ئاینزانی)- واتە نەک توێژینەوەی دەسکەوتەکانی مرۆڤ، بەڵکو توێژینەوەی مەبەستی یەزدانی- یان ببێتە وێژە- واتە، گێڕانەوەی چیرۆک و ئەفسانەکان. بەڵام ئەمە بەو مانایە مێژوو نییە، کە لە دوو سەد ساڵی رابردوودا زانیومانە.

هێژ پێویستە لە گازەندەی بە هەڕەمێن و ئاسایی هەر تیۆرێک بکۆڵمەوە، کە پێودانگی کۆتایی بڕیاری مێژوویی لە داهاتوودا دەبینێتەوە.

دەڵێن تیۆرێکی لەم چەشنە بە شێوەیەکی شاراوە بڕیار لەسەر سەرکەوتوویی پێوودانگی کۆتایی بڕیارەکە دەدات، هەروەها دەڵێن بە شێوەیەکی شاراوە بڕیار لەسەر ئەوە دەدات، ئەگەر شتێک ئێستا نەبێ، لە داهاتوودا دەبێ، هەر راستە. لە دووسەد ساڵی رابردوودا زۆربەی هەرە زۆری مێژوونووسان نەک هەر تەنها ئەو ئاڕاستەیان گریمان دەکرد، کە مێژوو لە میانەیەوە دەجووڵێ، بەڵکو بە شێوەیەکی گشتی هۆشیارانە یانیش ناهۆشیارانە پێیان وابوو ئەم ئاڕاستەیە ئاڕاستەیەکی راستە، بە شێوەیەک لە خراپترەوە بۆ چاکترو لە نزمترەوە بۆ بەرزتر مرۆڤی جووڵاندووە.

مێژوونووس نەک تەنها دانی بە ئاڕاستەکەدا نەناوە، بەڵکو لێشی کەوتۆتە گومانەوە.

ئەو پێودانگە پڕ مانایی و گرنگییەی مێژوونووس لەمەڕ رابردوو لە رێبازی لێکۆڵینەوەکەیدا پراکتیسی کردووە نەک تەنها مانایەکی ئەو رەوتە نییە، کە مێژوو لە سەری جووڵاوە، بەڵکو مانایەکی تێوەگلانی ئەخلاقی خۆیەتی لەو رەوتە.

دوو لق چییەتی نێوان، وا هەیەو، دەبێت ببێ» ، هەروەها دوو لق چییەتی نێوان راستی و بەها لە نێو چوو، ئەوەش تێڕوانینێکی گەشبینانەیە، بەرهەمی سەردەمی ئەوپەڕی باوەڕبوونە بە داهاتوو؛ چاکسازو ئازادیخوازەکان، هیگڵی و مارکسییەکان، تیۆلۆژیست و عەقڵانییەکان، کەم یا زۆر بە شێوەیەکی چەسپاو و وێکساز پابەندی ئەم دوو لق چییەتە بوون.

ئەم دوو لق چییەتییە بۆ ماوەی دوو سەد ساڵ بەبێ زێدەڕویی تێداکردن وەک وەڵامێکی قبوڵکراو و شاراوەی پرسیاری، مێژوو چییە؟» وەسفکراوە، لەگەڵ میزاجی ترس و رەوشی هەنووکەدا

پەرچەکردارێک لە دژی ئەم تێڕوانینەدا روویدا، کە بواری بۆ ئەو تیۆلۆژیستانە چۆڵکرد، کە لە دەرەوەی مێژوودا بە دوای مانای مێژوودا دەگەڕێن، هەروەها بواری دایە ئەو گومانبارانەی بە هیچ شێوەیەک مانا لە مێژوودا نادۆزنەوە.

بە ئەوپەڕی دڵنیایی و بە ئەوپەڕی جەختکردنەوەوە دەڵێین جیاوازیکردن لە نێوان، وا هەیە «وا، دەبێ ببێت» شتێکی رەهایەو ناتوانرێ چارەسەر بکرێت، هەروەها ناتوانرێ، بەهاکان «لە، راستییەکان» وەربگیرێن. پێم وایە ئەمە رێگەیەکی هەڵەیە.

با سەیرکەین چۆن ژمارەیەکی کەمی مێژوونووسان، یان نووسەرانی مێژوو کەم یا زۆر بە رەشاوێژی دیدو بۆچوونیان دەربارەی ئەم پرسە هەڵبژاردووە.

گیبۆن ئەو بەشەی لە چیرۆکەکەیدا بۆ سەرکەوتنەکانی ئیسلامی تەرخانکردووە لەسەر ئەو بنچینەیە بەرپاساوی دەکات، کە، هێژ پەیڕەوانی محەمەد ئایینی و مەدەنی لە جیهانی رۆژهەڵاتدا بە دەستەوە دەگرن.

هەروەها دەڵێ هەمان کۆشش لە بەرامبەر ئەو کۆمەڵە هەڤۆکانە بێ هوودە بوو، کە لە نێوان سەدەکانی حەوت و دوانزەدا لە دەشتەکانی سەکیزیاوە سەر بەرەو ژێر بوونەوە، چونکە شکۆمەندی عەرشی بێزەنتە ئەم هێرشە گێرەشێوێنانەی تێک بەرپەرچ دەدایەوەو دەهێشتەوە(١٤٤).

وا دیارە ئەم بەرپاساوکردنە ناماقووڵ نەبێت.

مێژوو بە شێوەیەکی گشتی بریتییە لە تۆماری ئەوەی خەڵکی کردوویانە، نەک ئەوەی نەیانتوانییوە بیکەن: تا ئەم ئەندازەیە بە شێوەیەکی حەتمی چیرۆکێکی سەرکەوتووە.

پرۆڤیسۆر تۆنی تێبینی ئەوە دەکات، کە مێژوونووسان لە میانەی دەرخستنی ناو و ناوبانگی ئەو هێزانەی سەرکەوتوونەو لە بنەکۆک خزاندنی ئەو هێزانەی لە نێوچوونە روخسارێکی حەتمی بوون دەبەخشنە پێرۆی هەیی(١٤٥).

وەلێ ئایا ئەمە بە مانایەک جەوهەری کاری مێژوونووس نییە؟ پێویستە مێژوونووس بەرەنگاربوونەوە بە سووک سەیر نەکات؛ مێژوونووس نابێ سەرکەوتن وەک شتێکی سادەو ساکار سەیر بکات مەگەر بە شتێکی زۆر گرنگ و هەستیاریشی سەیر نەکات. هەندێک جار ئەوانەی شکستیان خواردووە بە قەد سەرکەوتووەکان بەشدارییەکی گرنگ لە ئەنجامی کۆتاییدا دەکەن.

ئەمانەش لای هەر مێژوونووسێک پێرۆی بنچینەیی ئاسایین. وەلێ بە شێوەیەکی گشتی

مێژوونووس خۆی بەوانەوە خەریک دەکات، کە شتێکیان بە دەستهێناوە، ئینجا براوە بن یانیش شکست خواردوو.

من لە یاری کریکێتدا پسپۆڕ نیم، بەڵام پێدەچێ لاپەڕەکانی بە ناوی ئەو کەسانە نەخشێندرابن کە چەند سەدەیەکیان لە مێژووی ئەم یارییەدا دروستکردووە نەک ئەوانەی دۆڕاندوویانە.

دەستەواژە بەناوبانگەکەی هیگڵ ئەوەی دەڵێ لە مێژوودا، تەنها ئەو خەڵکانە دەتوانن بێنە ژێر تێبینیمانەوە، کە دەوڵەت دروستدەکەن[١٤٦]» هەر زوو بە زوو کەوتە بەر ڕەخنەوە، چونکە بەهایەکی پاوانکراو بە شێوەیەکی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییەوە دەلکێنێت و ڕێگا بۆ پەرستیارێکی زیانبەخشی دەوڵەت خۆش دەکات.

بەڵام لە رووی بنەماوە ئەوەی هیگڵ دەیەوێ بیڵێ راستە، و جیاکردنەوەیەکی ئاسایی لە نێوان پێش مێژوو-و- مێژوودا ڕەنگ دەداتەوە؛ تەنها ئەو خەڵکانەی تا رادەیەک لە ڕێکخستنی کۆمەڵگەکەیاندا سەرکەوتنیان بە دەستهێناوە وازیان لە هەڤۆکگەری سەرەتایی هێناوەو چوونەتە مێژووەوە.

کارلیل لە پەرتووکەکەیدا بە ناوی، شۆڕشی فەڕەنسا «لوی (Louis) چواردەهەم بە، لادەرچییەکی بەرجەستەی جیهان» نێوزەد دەکات. بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا حەزی لەم دەستەواژەیە بووە، چونکە دواتر لە بڕگەیەکی درێژتردا ڕەوشاندوویەتی: ئایا چ بزووتنەوەیەکی دەمدەمی نوێی جیهانی ئەمەیە: بزووتنەوەی دامودەزگاکان، بزووتنەوەی ڕێکخستنە کۆمەڵایەتییەکان، بزووتنەوەی میزاجە تاکەکەسییەکان، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بە ئالیکاری کاریان کردووە، ئێستاکەش لە بە یەکدادانی بە سەهووچوودا دێن و دەچن و ستەم دەکەن؟ ئەمە شتێکی حەتمییە؛ ئەمە شکاندنی لە ریز دەرچوونی داب و نەریتێکی جیهانییە، کە لە کۆتاییدا بۆتە شتێکی کەونارا[١٤٧].

پێوودانگەکە جارێکی تر مێژوویییە: ئەوەی لە سەردەمێکدا گونجاو بوویێت لە سەردەمێکی تردا بۆتە لادەری (solecism)، ئەویش لەسەر ئەو حسابە تۆمەتبار دەکرێ.

تەنانەت سێر ئیسیاه بەرلین کاتێک لە بەرزاییەکانی پەتیکردنی فەلسەفییەوە دێتە خوارێ و لە ڕەوشە هەستیارە مێژووییەکان دەکۆڵێتەوە، وا دیارە هاتبێتە سەر ئەم تێڕوانینە.

بێرلین دوای بڵاوکردنەوەی گوتارەکەی بە ناوی «حەتمییەتی مێژوویی» لە پەخشێکی رادیۆییدا سەرەڕای کەموکوڕییەکانی بیسمارک نەک تەنها وەک کەسێکی «لێهاتوو» ستایش دەکا، بەڵکو بە

گەورەترین نموونەی سیاسەتمەدارێکی پڕ هێزترین دەستخەری بڕیاری سیاسی سەدەی رابردووی داناوە، هەروەها لەم روانگەیەوە لە پێناو بەرژەوەندی بیسمارکدا چونکە بە قازانجی ئەو تەواو دەبێت، بێرلین لەگەڵ پیاوانی وەک جۆزێفی دووەمی نەمساو رۆبسپیرو لینین و هیتلەردا بەراوردی دەکات، بە شێوەیەک نەیانتوانی ئامانجە پۆزەتیڤەکانیان بەدی بێنن.

من ئەم بڕیارە بە سەیر دەزانم، وەلێ ئەوەی لەم چرکەساتەدا سەرنجم رادەکێشێت پێوودانگی بڕیارەکەیە.

سێر ئیسیاه دەڵێت بیسمارک لەو مادانە تێگەیشتبوو، کە کاری تێدا دەکردن؛ ئەوانیتر بە هۆی ئەو تیۆرە پەتیانەوە رێگایان ونکردبوو؛ کە نەیاندەتوانی کاریان پێبکەن.

ناوەڕۆکی چیرۆکەکە ئەوەیە، شکست لە بەرەنگاری کردنی ئەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە کامەیان باشتر... لە پێناو میتۆدێکی سیستماتیکی یان بانگەشەی پرەنسیپی شەرعیەتێک کاردەکات» (١٤٨).

بە دەستەواژەیەکی دیکە پێوودانگی بڕیاردان لە مێژوودا، بانگەشەکردنێکی سەرەکی شەرعییەتی ئاودامان، نییە، بەڵکو پێوودانگی بڕیاردان لە مێژوودا بریتییە لەوەی، کامەیان باشتر کاردەکات.

پێویست ناکا ئاماژە بەوە بدەم تەنها لە کاتی راڤکردنی رابردوودا خوازیاری ئەم پێوودانگەین، ئەوی باشتر کاردەکا.

گەر یەکێک پێت بڵێ پێی وابووە لەم حاڵەتەدا یەکیەتی بەریتانیای گەورەو وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دەوڵەتێکداو لە ژێر یەک سەردەستەیی و سەروەریدا شتێکی خوازیاربوو، ئەوا لەوانەیە بەوە قایل بیت، کە تێڕوانینێکی هەستیاربووە.

گەر بەردەوامبووایە و بیووتایە پاشایەتی دەستووری وەک شێوەیەکی حکومەت لە دیموکراسی سەرۆکایەتی باشتربوو، ئەوا هەروەها بەوە قایل دەبێت، کە گوتەیەکی تەواو هەستیاربووە.

بەڵام وا دەبینێ پێیدەوتی ئەو پێشنیاری کردووە خۆی بۆ ئەنجامدانی شاڵاوێک تەرخانکردووە لە پێناو یەکخستنی هەردوو دەوڵەتەکە لە ژێر سەردەستەیی تاجی بەریتانیادا؛ ئەوا لەوانەیە بە شێوەیەک وەڵام بدەیتەوە، کە لەوانەیە کاتی خۆی بە فیڕۆ دابێت.

گەر هەوڵبدەیت هۆکارەکە روون بکەیتەوە، لەوانەیە پێی بڵێیت ناکرێ دۆزەکانی لەم چەشنە لەسەر بنچینەی پرەنسیپێکی ئەپلیکاسیۆنی گشتیدا مشتومڕ بکرێن، بەڵکو پێویستە لە هەلومەرجە

مێژووییە دیاریکراوەکاندا کاریان پێبکرێت؛ تەنانەت لەوانەیە بە قسەکردن لە بارەی مێژوو بە (H)ی گەورە تاوانێکی گەورە ئەنجامبدەیت و پێی بلێی، کە (History) دژی ئەوە.

کاری سیاستمەدار تەنها ئەوە ناگرێتەوە، کە لە رووی ئەخلاقی و تیۆرییەوە خوازیارییەتی، بەڵکو پێویستە هێزە هەییەکان و ئەوەش بگرێتەوە، کە چۆن دەتوانن بەرپەباربوونی کەرتەکەی ئامانجە ویستراوەکان دەسکاری بکەن یانیش ئاراستە بکەن.

بڕیارە سیاسییەکانمان ئەو بڕیارانەی لە تیشکی شرۆڤەکەمان لە بارەی مێژوو وەرگیراون لەم چارەسەرە مامناوەندییەدا ریشە دادەکوتن.

بە شێوەیەکی ریشەیی هیچ شتێک لە دانانی پێوودانگی پەتی گریمانکراوی خوازیارانەو تۆمەتبارکردنی رابردوو لە ژێر تیشکی ئەو پێوودانگە هەڵەتر نییە.

لەبەرئەوەی وشەی، سەرکەوتن، زۆر دیاردیدانی دەخسۆکی شاراوەی پێوەلکێندراوە، بوارمان بدەن بە هەر نرخێک بێت دەستەواژەی، کامەیان باشتر کاردەکای بێ لایەنی لە جێ دابنێین.

چونکە لە چەندین شوێنی ئەم گەلاڵە نامانەدا لەگەڵ سێر ئیسیاه بیرلیندا ناسازم، بەختەوەرم هەرچۆنێک بێت بتوانم وەسفەکە بەم ئاستە تەبایی بوونە بە کۆتا بێنم. قبووڵکردنی پێوودانگی، ئەوەی باشتر کاردەکات، بواری جێبەجێ کردنەکەی نە خۆیا (self-evident) دەکات نە ئاساندەکات.

ئەمە بریتی نییە لەو پێودانگەی بڕیارە خێراکان هاندەدات، یان مل بۆ ئەو تێڕوانینە کەچ بکات، کە دەڵێ ئەوەی هەیە راستە.

وەنەبێ مێژوو رەوشی پڕ لە نشووستی بە خۆیەوە نەبینێ. مێژوو دان دەنێت بەوەی پێی دەڵێم، دەسکەوتی جێماوە: رەنگە نشووستییە خۆیاکانی ئەمڕۆ بەشداری کردنێکی ژیواری دەستکەوتی سبەی بئەفرێنن- لەسەر شێوەی ئەو پێغەمبەرانەی پێش سەردەمی خۆیان لە دایکدەبن. لە راستیدا، یەکێک لە خەسڵەتە چاکەکانی ئەم پێودانگە لە سەرووی پێودانگی پرەنسیپی ئاودامان و چەسپاوی گریمانکراوەوە ئەوەیە داوامان لێدەکات بڕیارەکەمان دوابخەین یا ئەوەتا لە ژێر تیشکی ئەو شتانەی هێژ روویان نەداوە بیسازێنین.

پرودۆن، کە بە شێوەیەکی بێ پێچ و پەنا لە بارەی پرەنسیپە پەتییە ئەخلاقییەکانەوە دواوە، کودەتای ناپلیۆنی سێیەمی بەخشیوە دوای ئەوەی سەرکەوتنی بە دەستهێناوە؛ مارکس لەبەرئەوەی پێودانگی پرەنسیپە پەتییە ئەخلاقییەکانی رەتکردۆتەوە، بە هۆی ئەم لێبووردنەوە پرودۆنی

تۆمەتبارکردووە.

ئەگەر لە سونگەی تێڕوانینێکی مێژوویی کۆنترەوە سەرنجبدەین، لەوانەیە بەوە قایلبین، کە پرودۆن هەڵەبووەو مارکس راستبووە.

دەسکەوتەکەی بسمارک دەرهاویشتەیەکی نایاب بۆ تاقیکردنەوەی ئەم پرسە بڕیارە مێژووییە دەستەبەر دەکات؛ لە کاتێکدا پێوودانگی سێر ئیسیاه بێرلین، ئەوەی باشتر کاردەکات، قبووڵ دەکەم، ئەوا هێژ بە هۆی ئەو سنووره ماوە کورت و تەنگەبەرانەوە سەرسام دەبم، کە بێرلین بە ئاشکرایی بەوە قایله لە نێویاندا ئەم پێودانگە پراکتیس بکات.

ئایا ئەوەی بسمارک کردوویەتی لە راستیدا کارێکی باش بووە؟ پێم وایە ئەوەی ئەو کردبووی بە هۆی فەلاکەتێکی گەورە.

ئەمە مانای ئەوە نییە دەمەوێ بسمارک تۆمەتبار بکەم، کە رایخی ئەڵمانیای دروستکرد، یان جەماوەری ئەڵمانیا ئەوانەی ئەوەیان دەویست و هاریکاری دروستکردنیانکرد.

وەلێ وەک مێژوونووسێک هێژ چەندین پرسیارم هەیە. ئایا فەلاکەتی دوماهی بۆیە روویدا، چونکە چەند کەم و کورتی و چەوتییەکی شاراوە لە پێکهاتەی رایخدا هەبوون؟ یان بە هۆی چەند شتێکەوە بوو لە هەلومەرجە ناوخۆییەکاندا، کە ئەفراندیان و چارەنووسازکرا بوو بۆ ئەوەی ببێتە خۆسەپێن و دوژمنکار؟ یان ئایا لەبەرئەوە بوو، کاتێک رایخ دروستبوو، ئەوروپا یان گۆڕەپانی جیهان زۆر قەرەباڵغ و بە هاش و هووشبوو، هەروەها ئایا ئامانجەکانی فراوانخوازی لە نێوان دەسەڵاتە هەییەکانی ئەوروپادا پێشتر زۆر بە هێزبوونە، بە شێوەیەک سەرهەڵدانی دەسەڵاتێکی مەزنی دیکە بەسبوو بۆ ئەوەی ببێتە هۆی بە یەکدادانێکی مەزن و تەواوی سیستەمی جیهان بەرەو کاولی بەرێت؟ لەسەر بنچینەی دوا گریمانەدا لەوانەیە هەڵە بێت بە تەنها بەرپرسیارییەتی فەلاکەتەکە بخرێتە ئەستۆی بسمارک و خەڵکی ئەڵمانیا: لە راستیدا ناتوانی دوا فەلاکەت (Last straw) بخەیتە بەر گلەیی و گازندە.

وەلێ بڕیارێکی بابەتی لە هەمبەر دەسکەوتی بسمارک و چۆن کاریکردووە لە مێژوونووسەوە چاوەنوارێ وەلامێکی ئەم پرسیارانەیە، هەروەها دڵنیام لەوەی هێژ مێژوونووس ماویەتی بە یەکجاری وەلامی هەموو پرسیارەکان بداتەوە. ئەوەی دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە مێژوونووسی ١٩٢٠-ەکان لە مێژوونووسی ١٨٨٠-کان نزیکتر بووە لە بڕیاری بابەتی، هەروەها مێژوونووسی ئەمڕۆ نزیکترە لە

مێژووی ١٩٢٠-ەکان؛ لەوانەیە مێژوونووسی ساڵی ٢٠٠٠ هێژ نزیکتر بێت.

ئەمەش تێزەکەم روون دەکاتەوە، کە دەڵێ ناکرێ و نابێ بابەتگەرایی لە مێژوودا وابەستەی پێودانگی چەسپاو و نەلڤینباری بڕیاری هەیی (here and now) بێت، بەڵکو تەنها وابەستەی پێودانگێک دەبێ، کە لە داهاتوودا هەڵبگیردرێت و هەر کاتێکیش رەوتی مێژوو پەرەبسەنێ پێودانگەکەش پەرە بسێنێ.

مێژوو تەنها کاتێک پێویستی بە ماناو بابەتگەرایی دەبێت، کە پەیوەندییەکی تۆکمە لە نێوان رابردوو-و- داهاتوودا دابمەزرێنێ.

با ئێستاکە جارێکی تر بڕوانینە ئەم دوو لق چییەتییەی نێوان راستی و بەها.

ناتوانرێ بەهاکان لە راستییەکانەوە وەرگیرێن.

ئەم دەستەواژەیە تا رادایەک راستە، وەلێ تا رادەیەک هەڵەیە.

پێویستە سیستەمی بەها بەندو باوسەندووەکان لە هەر سەدەو وڵاتێکدا تاقی بکەیتەوە بۆ بەریەباکردنی ئەوەی تا چ ئەندازەیەک سیستەمەکە بە هۆی راستییەکانی ژینگەکە لە قاڵب دەدرێ.

لە گەڵاڵە نامەیەکی پێشتردا سەرنجمدایە گۆڕانی ناوەڕۆکی مێژوویی بەها- وشەکانی وەک ئازادی و یەکسانی، یان دادپەروەری.

یا ئەوەتا کڵێسەی مەسیحی وەک دەزگایەک وەربگرە، کە بە شێوەیەکی سەرەکی بایەخ بە بڵاوکردنەوەی بەها ئەخلاقییەکان دەدات.

هەریەک لەمانە لەگەڵ یەکتری بەراورد بکە: بەهاکانی مەسیحییەتی سەرەتایی و بەهاکانی پاپایەتی سەدەکانی ناوەڕاست، یان بەهاکانی پاپایەتی ناوەڕاست و بەهاکانی کڵێسە پرۆتستانتییەکانی سەدەی نۆزدەهەم.

یان بۆ نموونە بەراورد بکە لە نێوان ئەو بەهایانەی ئەمڕۆ کڵێسەی مەسیحی لە ئیسپانیادا بڵاویان دەکاتەوەو ئەو بەهایانەیش، کە کڵێسە مەسیحییەکان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بڵاویان دەکەنەوە.

ئەم جیاوازییەی بەهاکان لە جیاوازی راستییە مێژووییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت.

یان سەرنج بدە ئەو راستییە مێژووییانەی، کە لە سەدەو نیوی رابردوودا بوونە هۆی ئەوەی کۆیلایەتی و جیاوازی رەگەزی و ژێر بارخستنی کاری منداڵان بە شێوەیەکی گشتی وەک بێ ئەخلاقی

سەیر بکرێن- هەموو سەردەمەکانی پێشتر وەک کاری بێ لایەن لە رووی ئەخلاقی یانیش وەک کاری بە نێوبانگ قبووڵدەکران.

ئەو پێشنیارەی دەڵێ ناتوانرێ بەهاکان لە راستییەکانەوە وەربگیرێن بە لایەنی کەمەوە تاک لایەن و فریودەرە. یان بوارمان بدەن دەستەواژەکە پێچەوانە بکەینەوە. ناتوانرێ راستییەکان لە بەهاکان وەربگیرێن.

ئەم دەستەواژەیە تا رادەیەک راستە، بەڵام لەوانەیە فریودەر بێت، هەروەها پێویستی بە زەمینەسازکردنێک هەیە.

کاتێک دەمانەوێ راستییەکان بناسین، کاتێک دەمانەوێ ئەو پرسیارانە بزانین، کە دەیانکەین، هەروەها دواجار دەمانەوێ ئەو وەڵامانە بزانین، کە دردەستیان دەخەین، هەموو ئەمانە بە هۆی سیستەمی بەهاکانمانەوە فیتدەدرێن. وێنەی راستییەکانی ژینگەکەمان بە هۆی بەهاکانمانەوە لە قاڵب دەدرێ، واتە بەر هۆی ئەو کاتیگۆریانەوە، کە لە میانەیانەوە لە راستییەکان نزیک دەکەوینەوە؛ هەروەها ئەم وێنەیە یەکێکە لەو راستییە گرنگانەی دەبێ بایەخی پێ بدەین.

بەهاکان دەچنە نێو راستییەکانەوەو دەبنە بەشێکی جەوهەرییان.

بەهاکانمان وەک ئێمەی مرۆڤ بریتین لە بەشێکی جەوهەری کەرەستەکانمان.

لە میانەی بەهاکانمانەوەیە، کە دەتوانین خۆمان لەگەڵ ژینگەکەماندا بگونجێنین، هەروەها ژینگەکەمان لەگەڵ خۆماندا بگونجێنین بۆ ئەوەی سەردەستەیی بەسەر ژینگەکەماندا بەدەستبێنین، ئەو سەردەستەییەی مێژوو دەکاتە تۆماری پێشکەوتن.

وەلێ لە بەدراماکردنی کێشمەکێشمی مرۆڤ و ژینگەکەی دژیەکییەکی هەڵەو جیاکردنەوەیەکی هەڵەی نێوان راستی و بەهاکان دروست مەکەن.

پێشکەوتن لە مێژوودا لە میانەی پشت بە یەکتری بەستن و کارلێکی نێوان راستی و بەهاکانەوە دێتە ئەنجام. مێژوونووسی بابەتی ئەو مێژوونووسەیە، کە تا سەر ئێسقان لەم رەوتە ئاڵوگۆڕەدا قاڵ دەبێتەوە.

کلیلی پرسی راستی و بەهاکان لە میانەی بەکارهێنانی ئاسایی وشەی، راستییەوە دەستەبەر دەبێت، ئەو وشەیەی جیهانی بەهاکان و جیهانی راستییەکان لە یەکتری جیادەکاتەوەو لە سروشتەکانی هەردوو جیهانیش پێکدێت.

وەنەبێ ئەمە خەسڵەتێکی زمانی ئینگلیزی بێت، بەڵکو وشەکانی بەرامبەر (Truth) لە زمانە لاتینییەکاندا وەک Wahrheit لە زمانی ئەڵمان و Pravada[١٤٩] لە زمانی رووسیدا خودانی ئەم تایبەتمەندییە دوولایەنەن.

وا دیارە هەموو زمانێک لە پێناو راستییەکدا پێویستی بە وشەیەکی لەم جۆرە هەبێت، کە تەنها بریتی نییە لە روونکاری راستییەک و بڕیاری بەهایەک، بەڵکو هەریەک لە دوو سرشتەکە دەگرێتەوە.

رەنگبێ ئەوە راستییەک بێت، گەر بڵێم حەفتەی رابردوو رۆیشتمە لەندەن.

وەلێ لەوە ناچێ بە شێوەیەکی ئاسایی بە (Truth) نێوزەدی بکەی: چونکە هیچ ناوەڕۆکێکی بەهادارانە لە نێوخۆی ناگرێت.

لە لایەکی ترەوە، کاتێک دامەزرێنەرانی دامودەزگاکانی[****] وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە راگەیاندنی سەربەخۆییدا ئاماژەیان بە راستییەکی خۆیان (self-evident)دا، کە هەموو مرۆڤەکان بە یەکسانی دروستکراون، رەنگە هەست بەوە بکەیت ناوەڕۆکی بەهای دەستەواژەکە بەسەر ناوەڕۆکی راستییەکەدا زاڵە، ئینجا بەم حسابە دەستەواژەکە بە، راستی، لە قەڵەم نادەیت.

جیهانی راستیاری مێژوویی دەکەوێتە شوێنێکی نێوان ئەم دوو جەمسەرانە: جەمسەری باکووری راستییە بێ بەهاکان و جەمسەری باشووری ئەو بڕیارە بەهادارانەی هێز پرکێشی ئەوە دەکەن خۆیان بەرنە نێو راستییەکان.

هەروەک لە گەڵاڵە نامەی یەکەمدا گوتم، مێژوونووس پێوانەی نێوان راستی و شرۆڤەکان، و نێوان راستی و بەهاکان دەکات و ناتوانێ لە یەکتریان جیابکاتەوە.

گەر بێت و لە جیهانێکی چەقبەستوودا ژیان بگوزەرێنی، ئەوا ناچاری جیابوونەوەیەک لە نێوان راستی و بەهادا بدرکێنی.

وەلێ لە جیهانی چەقبەستوودا مێژوو شتێکی بێ مانایە. مێژوو لە جەوهەری خۆیدا بریتییە لە گۆڕان و لڤین، یان -ئەگەر نەتانەوێ تێبینی پڕوپووچ لە بارەی وشە کۆنەکەوە بورووژێنن- ئەوا بریتییە لە پێشکەوتن.

کە وابوو لە سەرەنجامدا دەگەڕێمەوە سەر وەسفی ئاکتن لەمەڕ پێشکەوتن، کە بەم چەشنە وەسفی دەکات: «بریتییە لە گریمانێکی زانستی پێویستە مێژوو لەسەر بنەمای ئەو گریمانە زانستییە بنووسرێ».

که وابوو گەر بتانەوێ دەتوانن لە میانەی وابەستکردنی مانای رابردوو بە هێزێکی سەربارەکی مێژوویی و سەرووی عەقلانییەتەوە مێژوو بکەنە تیۆلۆژیا.

هەروەها گەر بتانەوێ دەتوانن مێژوو بکەنە وێژە واتە کۆکردنەوەی چیرۆک و ئەفسانەکان دەربارەی رابردوو بەبێ ئەوەی ماناو گرنگییان هەبێت.

تەنها ئەو کەسانە دەتوانن مێژوو بە مانای پڕ بە پێستی خۆی بنووسن، کە مانای ئاڕاستەیەک لە خودی مێژوودا دەدۆزنەوەو قبووڵدەکەن.

ئەو بیروباوەڕەی دەڵێ ئێمە لە شوێنێکەوە هاتووین بەندیوارییەکی زۆر نزیکی لەگەڵ ئەو بیروباوەڕەدا هەیە، کە دەڵێ بە نیازین بەرەو شوێنێک بڕۆین.

ئەو کۆمەڵگەیەی باوەڕی بە توانای خۆی نەبێت بەوەی لە داهاتوودا پێش دەکەوێت، ئەوا خێرا خۆخەریککردنی بە پێشخستنی خۆی لە رابردوودا دەوەستێنێ.

هەروەک لە دەسپێکی گەلاڵە نامەی یەکەمدا وتم، تێڕوانینمان لە بارەی مێژوو تێڕوانینمان لە بارەی کۆمەڵگە رەنگدەداتەوە.

وا ئێستاکە لە میانەی ئاشکراکردنی باوەڕبوونم بە داهاتووی کۆمەڵگەو داهاتووی مێژوو دەگەڕێمەوە سەر خاڵی دەسپێکردنم.

## شەشەم

# ئاسۆیەكی بەرفراوان

ئەو چەمكەی لەم گەلاڵەنامانەدا وەک رەوتێکی بەردەوام لڤین بار لە بارەی مێژوو پێشکەشمکرد، بە مێژوونووسیشیەوە، کە لە نێو ئەم رەوتەدا دەجوولێ، وا دیارە دەربایستی چەند تێرامانکم بکات لە بارەی پێگەی هەریەک لە مێژوو-و- مێژوونووس لەم سەردەمەماندا. لە سەردەمێکدا ژیان دەگوزەرێنن- نەک بۆ جاری یەکەم لە مێژوودا- کە بەرینییەکانی فەلاکەتی جیهانی خەریکە بێنەدی و خەریکە نەیەنەدی، ئەمانەش قورسایی دەخەنە سەرشانی هەموو کەسێک.

ئەم بەرینیانە نەدەسەلمێندرێن و نە رەتدەکرێنەوە. وەلێ بە هەر چەشنێک بێت لەو بەرینییە کەمتر راستە، کە دەڵێ رۆژێک لە رۆژان هەموومان دەمرین؛ چونکە دڵنیایی بوون لەم بەرینییە لە دانانی نەخشەکانی داهاتوو یاساغمان ناکات، ئەوا لەسەر بنچینەی ئەو گریمانەی مەزنی جیهان بێت- لەو سەرکەشیانە رزگاری دەبێت، کە هەڕەشەمان لێدەکەن، هەروەها مێژوو بەردەوامدەبێت. دوای ئەوەی جیهانی چەرخەکانی ناوەڕاست بەرەو وێرانی رۆیشت و بناخەکانی جیهانی مۆدێرن لە سەدەکانی پانزەهەم و شانزەهەمدا دانران، لە ساڵانی ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا جیهان رەوتێکی گۆڕانی وای بە خۆیەوە بینی رەنگە لە هەر رەوتێکی دیکە قووڵتر و ئاودامانتر بووبێت، کە بەسەر جیهان هاتووە.

گومانی تێدا نییە لە سەرەنجامدا گۆڕان بەرهەمی دۆزینەوەو داهێنانە زانستییەکان و بەرهەمی بەرفرەی جێبەجێکردنی بێ ئەندازەیان و بەرهەمی ئەو پەرەسەندنەیە، کە لە سوونگەیانەوە سەرهەڵدەدات ئینجا چ راستەوخۆ بێت چ ناڕاستەوخۆ. بەرچاوترین لایەنی گۆڕان ئەو شۆڕشە کۆمەلایەتییەیە، کە دەشێ لەگەڵ ئەو شۆڕشەدا بەراورد بکرێ، کە لە سەدەکانی پانزەهەم و شانزەهەمدا چینێکی نوێی بنگرتوو لەسەر دارایی و بازرگانی و دواجار لەسەر پیشەسازی گەیاندە پایەی دەسەلات.

پێکهاتەی نوێی پیشەسازیمان و پێکهاتەی نوێی کۆمەڵگەکەمان پرسی ئەوەندەی بێشومار دەخەنەوە، کە ناتوانم لێرەدا باسیان بکەم.
وەلێ گۆڕان دوو لایەنی پەیوەندیدار بە بابەتەکەی منی هەیە- یەکێکیان ئەو لایەنەیە پێی دەڵێم گۆڕان بە قووڵی، ئەوەی تریان ئەو لایەنەیە، کە پێی دەڵێم گۆڕان لە پانتایی جوگرافیاییدا.
هەوڵ دەدەم بە کورتی باس لە هەریەکەیان بکەم.
مێژوو کاتێک دەستپێدەکات، کە مرۆڤەکان لە رووی زنجیرەی ئەو رووداوە تایبەتیانەوە بیر لە تێپەڕینی رۆژگار بکەنەوە، کە مرۆڤەکان بە شێوەیەکی هۆشیارانە تێوەیان دەگلێن و کاریان تێدەکەن، نەک لە رووی رەوتە سروشتییەکانی وەک خولی وەرزەکان و ماوەی ژیانی مرۆڤ. بورکهاردت دەڵێت: «مێژوو بە هۆی بێدارکردنەوەی وشیاری لەگەڵ سروشتدا ناتەبایە(١٥٠). مێژوو بریتییە لە کێشمەکێشمی درێژخایەنی مرۆڤ بۆ تێگەیشتن لە ژینگەو کارتێداکردنی بە هۆی بەکارهێنانی عەقڵییەوە».
وەلێ سەردەمی مۆدێرن بە شێوازێکی شۆڕشێگێڕانە کێشمەکێشمەکەی فراوانتر کردووە.
هەنووکە مرۆڤ بە دوای ئەوەدا وێڵە نەک تەنها لە ژینگەکەی تێبگات و بەرفەرمانی بکات، بەڵکو عەودالی ئەوەیە لە خودی خۆشی تێبگات؛ گەر دەستەواژەیەکی رەوابێ، ئەوا ئەم چەمکە رەهەندێکی نوێی بۆ عەقڵ و مێژوو زێدەکردووە.
ئەم چەرخەی ئێستا بە چەشنێکی مێژوویيانە لە هەموو چەرخەکان هشکارترە.
مرۆڤی مۆدێرن لە رووی رادەی هۆشیاری خودییەوە لە پێشەنگی مرۆڤەکانی پێشتردایە، کە وابوو لە بارەی مێژووشەوە هۆشیارە.
مرۆڤ بە تاسەوە دەنوارێتە ئەو زەردەو گزنگانەی لێوەیەوە هاتووە، بەو هیوایەی تیشکە لاوازەکانی ئەو تارماییە رامالێت، کە پێیدا گوزەر دەکات؛ بە پێچەوانەوە بەرزخوازی و گومانەکانی مرۆڤ لە بارەی ئەو رێگایەی لە بەردەمی دایە تێڕوانینەکانی بە نێو پەنهاندا خێرا دەکات.
هەریەک لە رابردوو، و ئێستا، و داهاتوو لە زنجیرەیەکی بێ کۆتای مێژوودا بە یەکەوە بەندیوار دەبن.
لەوانەیە بگوترێ گۆڕان لە جیهانی مۆدێرندا بە لە نێو خۆگرتنی پەرەسەندنی هۆشیاری مرۆڤ لە بارەی خۆیەوە لەگەڵ دیکارتدا دەستپێدەکات، دیکارت یەکەم کەس بوو پێگەی مرۆڤی وەک

بوونەوەرێک چەسپاند، کە نەک تەنها دەتوانێ بیربکاتەوە، بەڵکو دەتوانێ لە بارەی بیرکردنەوەی خودی خۆشییەوە بیربکاتەوە، مرۆڤ دەتوانێ لە کردەی چاودێری کردندا چاودێی خودی خۆی بکات، کە وابوو لە یەک کاتدا مرۆڤ خود و بابەتی هزر و چاودێری کردنە.

وەلێ تاوکو دوابەشی سەدەی هەژدەهەم پەرەسەندن بە تەواوی روون نەبووبوویەوە، کاتێک رۆسۆ قووڵاییە نوێکانی تێگەیشتنی خودی و هۆشیاربوونەوەی خودی مرۆڤی ئاوەڵاکرد و تێڕوانینێکی نوێی دەربارەی سروشتی جیهان و شارستانییەتی تەقلیدی بە مرۆڤ بەخشی.

دوتۆکڤی (de tocqueville) دەڵێ، شۆڕشی فەڕەنسی لە میانەی ئەو بیروباوەڕەوە سروشکرابوو، کە پێویست بوو رێسا سەرەتاییە سادە داتاشراوەکان لە مومارەسەی عەقڵی مرۆڤ و یاسای سروشتی جێگای ئەو نەریتە تەقلیدییە ئاڵۆزانە بگرنەوە، کە فەرمانڕانی سیستەمی کۆمەڵایەتی ئەم رۆژگارە دەکەن[١٥١].

ئاکتن لە تێبینییەکی دەستنووسی خۆیدا دەڵێ: تا ئەوسا مرۆڤ هەرگیز عەوداڵی ئازادی نەبوو، هەرگیز عەوداڵی ئەوە نەبوو بزانێ بە دوای چیدا عەوداڵ بووە[١٥٢].

لە تێڕوانینی ئاکتن-دا بە هەمان شێوەی تێڕوانینی هیگڵ، ئازادی و عەقڵ هەرگیز لە یەکتری جیاواز نەبوونە. هەروەها شۆڕشی فەڕەنسی بە شۆڕشی ئەمریکییەوە بەندیوار کردووە.

هەشتاو حەوت ساڵ بەر لە ئێستا باب و باپیرانمان نەتەوەیەکی نوێیان لەسەر ئەم کیشوەرەدا دروستکرد، نەتەوەیەک بە ئازادی وێناکرابوو، ئەمەش لەسەر ئەو بنەمایە بوو، کە مرۆڤەکان بە یەکسانی دروستدەکرێن. هەروەک دەستەواژەکانی لینکۆڵین پێشنیاریدەکات، رووداوێکی ناوازە بووە بۆ یەکەم جار لە مێژوودا مرۆڤەکان بە ئەنقەست و هۆشیاری خۆیان بکەنە نەتەوەیەک و دواجار بە هۆشیار و بە ئەنقەست مرۆڤگەلێکی دیکە لە نەتەوەدا لە قاڵب بدات.

- مرۆڤ لە سەدەکانی حەڤدەهەم و هەژدەهەمدا بە تەواوی لە هەمبەر جیهانی دەوروبەری و یاساکانی جیهانی بوو بە بوونەوەرێکی هۆشیار.

مرۆڤەکان لەوە زیاتر دەربایستی بڕیارە نادیارەکانی چاودێریکردنێکی پەنهان ئامێزی خودایی نەبوون، بەڵکو دەربایستی یاساکانی کەهێنباری عەقڵ بوو.

وەلێ ئەم یاسایانە یاساگەلێک بوون مرۆڤ ملکەچیان بوو، نەک دەسکردی خودی مرۆڤ بووبن.

لە قۆناغی دواتردا مرۆڤ بە تەواوی بوو بە بوونەوەرێکی هۆشیار لە بارەی دەستەڵاتی خۆی بەسەر

ژینگەی خۆیداو زاڵبوونی بەسەر خودی خۆیدا، هەروەها لە بارەی مافەکانی هۆشیاری دەردەست خست بۆ ئەوەی ئەو یاسایانە دابنێت، کە لە ژێر سایەیاندا دەژیت.

قۆناغی گواستنەوە لە سەدەی هەژدەهەمەوە بۆ جیهانی مۆدێرن قۆناغێکی درێژخایەن و بەرەبەرە بوو. هەریەک لە هیگڵ و مارکسی فەیلەسووف نمینەندەکاری ئەم گواستنەوەیە بوون، هەریەک لەم دوو فەیلەسووفانە پێگەیەکی دژیەک و دوو بەهایان داگیر کردبوو.

هیگڵ رەگ بە نێو ئەو یاسایانەی چاودێری یەزدانیدا دادەکوتێ، کە بۆ یاسای عەقڵ گۆڕاون رۆحی جیهانی هیگڵ چاودێری یەزدانی قایم بە دەستێک دەگرێت و عەقڵیش بە دەستەکەی تر.

هیگڵ لەمەدا لاسایی ئادەم سمیت دەکاتەوە.

«تاکە کەسەکان بەرژەوەندییەکانی خۆیان جێبەجێ دەکەن؛ وەلێ بەم پێوودانگە هەندێک شتی زێدەتر دەردەست دەکات، کە لە کردەوەکانیاندا هەیە، بەڵام لە هۆشیارییاندا نییە».

هیگڵ لە بارەی ئارمانجی عەقڵانی رۆحی جیهانەوە دەڵێ، مرۆڤەکان لە کاتی بەرپاکردنی ئەم مەبەستەدا، ئەم ئامانجە لەگەڵ تێرکردنی ئامانجەکانیاندا دەگونجێن، کە ماناکەی لە مەبەستەکە جیاوازە،.

بە شێوەیەکی سادەو ساکار ئەمە بریتییە لە هارمۆنیای ئامانج و بەرژەوەندییە وەرگێردراوەکان بۆ زمانی فەلسەفی ئەڵمانی[١٥٣].

هیگڵ دەستەواژەی،گزی عەقڵ «وەک هاوواتای، دەستی پەنهانی» ئادەم سمیت بەکاردەهێنێ، کە مرۆڤەکان هاندەدات بۆ ئەوەی ئەو ئامانجانە بە دەستبهێنن، کە لە بارەیانەوە هۆشیار نین. سەرەڕای ئەوەی هیگڵ فەیلەسووفی شۆڕشی فەرەنسی نەبوو، بەڵام یەکەم فەیلەسووف بوو جەوهەری راستییەتی لە گۆڕانی مێژوویی و پەرەسەندنی هۆشیاری مرۆڤ لە بارەی خودی خۆیەوە ببینێت.

پەرەسەندن لە مێژوودا مانای پەرەسەندن بوو بە ئاراستەی چەمکی سەربەستی.

وەلێ پاش ساڵی ١٨١٥ سروشکردنی شۆڕشی فەرەنسی تێکەڵ بە خاو و خلیسکییەکانی (Res- toration) کرا.

هیگڵ لە رووی سیاسییەوە زۆر ترسنۆک بوو، بەڵام لە ساڵانی ئاخیرو ئۆخری تەمەنیدا لە دامەزراوی رۆژگاری خۆیدا زۆر خۆڕاگرو یەک هەڵوێست بوو بۆ ئەوەی هەر مانایەکی بەرهەست بۆ گریمانە میتافیزیکییەکانی خۆی بئەفرێنێ.

هێـرتزن تیـۆرەکـانی هیگڵ وەک، جەبری شـۆڕش «ناقـۆک دەکـات، ئەم ناقۆکـەش بە رادەیەکی هەڵاویرە لە جێگای خۆیەتی.

هیگڵ نووسین بە کۆمـەڵێک هێـما فەراهەمـدەکات، بەڵام هیچ نێوەرۆکێکی پراکتـیکیـان پێ نابەخشێت.

ئەم کارە بۆ مارکس بەجێما بۆ ئەوەی ژمێرزانی لە هاوکێشە جەبرییەکانی هیگڵدا دابنێت.

مـارکس وەک قـوتابی هەریەک لە ئادەم سـمـیت و هیگڵ لە سـوونگەی ئەو چەمکەوە دەسـتی پێکردووە، کە دەڵێ جیهان لەلایەن یاسا عەقلانییەکانی سروشتەوە فەرکاری دەکرێت.

مارکس بە چەشنی هیگڵ، وەلێ ئەم جارەیان بە شێوەیەکی بەرهەست و پراکتیکی، گواستنەوە بۆ ئەو چەمکە دەئەفرێنی، کە جیهانێک هەیە بە هۆی ئەو یاسایانەوە فەرکاری دەکرێت، کە لە میـانەی رەوتێکی عەقلانی هاودەنگی دەسادەیی شۆڕشگێڕانەی مرۆڤەوە پەرەدەسێنن.

لە دوا پەرتووکی مارکس-دا مێژوو مانای سێ شتی گەیاندووە، هەریەک لەم شتانە بە یەکترییەوە بەندیوارن و تەکـووزییـەکی عـەقـلانی و سفت دروسـتـدەکەن: جـووڵەی بوویەرەکـان بە گـوێرەی یاسـا بابەتییەکان، یاسا ئابوورییەکان بە پلەی یەکەم؛ چوونیەککردنی پەرەسەندنی هزر لە میانەی رەوتێکی دایالێکتی؛ هەروەها چوونیـەککردنـی کـردەوەکـە لە شێـوەی خـەباتی چینایەتی بە شێـوەیەک تیـۆرو پراکتیسی شۆڕش تەباو یەکرێز بکات.

ئەوەی مارکس پێشکەشیدەکات بریتییە لە پێکهاتەیەکی یاسا بابەتییەکان و کردەوەی هۆشیاری بۆ ئەوەی بە پراکتـیسـیـان بکات، کـە بریتین لەو یاسایانەی جار بە جار (هەرچەندە بە شێـوەیەکی ریوودەر) پێیان دەووترێ قەزاو قەدەر و خۆویستی.

مـارکس بە شێـوەیەکی بەردەوام لە بارەی ئەو یاسـایانەوە دەنووسـێت، کـە تا ئێـسـتـا مـرۆڤ ملکەچیانە بەبێ ئەوەی هۆشیاری لە بارەیانەوە هەبێت؛ مارکس زیاتر لە جارێک سەرنجی داوەتە ئەو چەمکەی پێی دەڵێ، هۆشـیـاری هەڵە،ی ئەو کـەسـانەی کـەوتوونەتە داوی ئابووری سـەرمـایەداری و کۆمـەڵگەی سـەرمـایەداری: ئەو چەمکانەی دەربارەی یاسـاکانی بەرهەمـهێنان لە هزری کـارگوزەرانی بەرهەمهێنان و بەکاربردندا دروستبوونە بە شێوەیەکی تەواو لە یاسا راستەقینەکان جیاوازن»(١٥٤).

وەلێ مـرۆڤ چەندین نموونەی سـەرنجـڕاکـێش لە بارەی بانگەوازەکـانی کـردەوەی هۆشـیـاری شۆڕشگێڕی لە نووسینەکانی مارکسدا دەدۆزێتەوە.

مارکس له تێزه نێودارەکەیدا دەربارەی فۆیرباخ دەڵێ: «فەیلەسووفەکان بە شێوەیەکی جیاجیا جیهانیان شرۆڤە کردووە؛ وەلێ ئامانج گۆڕینی جیهانە».

مانیفێستی کۆمۆنیستی دەڵێ: «پرۆلیتاریا دەسەڵاتی سیاسی خۆی بۆ ئەوە بەکاردەهێنی هەنگاو بە هەنگاو سەرمایە لە چینی بوورژوازی دابماڵێ و هەموو هۆ و پێناوەکانی بەرهەمهێنان لەبەردەستی دەوڵەتدا چڕبکاتەوە».

هەروەها مارکس لە هەژدەهەمین برومێری لووی پۆناپارتدا دەڵێ: «خوودە هۆشاری رۆشنبیری بە هۆی رەوتی سەدەیەکەوە تەواوی ئایدیا تەقلیدییەکان تارومار دەکەن» پێویستە پرۆلیتاریا هۆشیاری هەڵەی کۆمەڵگەی سەرمایەداری تارومار بکات، و هۆشیاری راستەقینەی کۆمەڵگەی بێ چینایەتی دروست بکات.

وەلێ نشوستی شۆڕشەکانی ساڵی ١٨٤٨ کۆسپێکی دراماتیک و جدی بوو لە بەردەم ئەو پەرەسەندنانەدا، کە وا دیاربوو هاکا رووبدەن کاتێک مارکس دەستی بەکار کرد. بەشی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بە کەشی و هەوایەکدا گوزەریکرد، کە هێژ بووژانەوەو ئاشتەوایی تێیدا باوبوو. بە چەشنێک نەگەیشتە وەرچەرخانی سەدەکە، کە گواستنەوەمان بەرەو سەردەمی هاوکاتی مێژوو تەکووزکرد لە نێو ئەم سەردەمەدا ئەرکی سەرەکی عەقڵ چیتر بۆ تێگەیشتنی ئەو یاسا بابەتییانە نەبوو، کە فەرکاری ئاکارو رەوشتی مرۆڤ دەکەن لە کۆمەڵگەدا، بەڵکو بە شێوەیەکی دروستتر بۆ دووبارە دروستکردنەوەی کۆمەڵگەو ئەو کەسانەیە، کە کۆمەڵگە دروستدەکەن لە میانەی کردەیەکی هۆشیارانەوە.

هەرچەندە مارکس بە شێوەیەکی دروست پێناسەی «چین»ی نەکردووە، وەلێ بە چەمکێکی بابەتی دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی لە میانەی راڤەکردنی ئابوورییەوە بچەسپێ.

لینین لە جیاتی ئەوەی جەخت لەسەر «چین» بکات جەخت لەسەر «پارت» دەکات، کە پێی وایە پێشەنگی «چین» پێکدێنێ و سرشتی پێویستی هۆشیاری «چین» لەناو «چین»دا بڵاو دەکاتەوە.

مارکس «ئایدیۆلۆژیا» بە زاراوەیەکی نێگەتیف دادەنێت- بە بەرهەمی هۆشیاری هەڵەی سیستەمی سەرمایەداری کۆمەڵگەی داوەتە قەڵەم.

ئایدیۆلۆژیا لە لای لینین دەبێتە زارەوایەکی بێلایەن یان پۆزەتیف- بریتییە لەو بیروباوەڕەی دەستەبژێرێکی سەرکردە هۆشیارەکان لە بارەی چینەوە لە نێو ئەو کارگوزارانەیاندا بڵاوکردۆتەوە، کە بە

شێوەیەکی شاراوە هۆشیارییان لە بارەی چینەوە هەیە. چیتر لە قالبدانی هۆشیاری چینایەتی ڕەوتێکی ئۆتۆماتیکی نییە، بەڵکو کارێکە پێویستە لە ئەستۆ بگیرێ. بیرمەندێکی دیکەی مەزن، کە لەم سەردەمەماندا ڕەهەندێکی تازەی خستە سەر عەقڵ فرۆیدە.

فرۆید ئەمڕۆکە وەک کەسایەتییەکی بزر ماوەتەوە.

فرۆید بە هۆی چەشنی پەروەردەو پاشخانەکەیەوە تاکەکەسێکی لیبڕالی سەدەی نۆزدەهەم بوو، هەروەها بەبێ چەندو چوون ئەو گریمانە بەندو باوە فریودەرەی قبوولکردووە، کە دەڵێ دژایەتییەکی جەوهەری لە نێوان تاکەکەس و کۆمەڵگەدا هەیە.

فرۆید وەک بوونەوەرێکی بایۆلۆژی لە مرۆڤ دەکۆڵێتەوە، نەک وەک بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی، فرۆید دەیەوێ ژینگەی کۆمەڵایەتی لە ڕووی مێژووییەوە زێتر وەک شتێکی دیاریکراو دابنێت نەک وەک شتێک، کە لە لایەن خودی مرۆڤەوە لە ڕەوتێکی بەردەوامی ئەفراندن و گواستنەوە دابێت.

فرۆید هەمیشە بە هۆی نزیککردنەوەی پرسە بە ناو ڕاستەقینە کۆمەڵایەتییەکان لە تاکە کەسەوە کەوتۆتە بەر هێرشی مارکسییەکان، هەروەها بەم پێوودانگە وەک کەسێکی کۆنەپەرست تۆمەتبار کراوە؛ ئەم تۆمەتەی خراوەتە ئەستۆی فرۆید تەنها تا ڕادەیەک ڕاستە، هەروەها ئەم تۆمەتە بە شێوەیەکی تێروتەسەل لە لایەن قوتابخانەی نوێی فرۆیدیزمەوە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بەرپاساو کرا، قوتابخانەکە ئەوە گریمان دەکات، کە بەد گونجانەکان بە پێکهاتەی کۆمەڵگاوە سەرچاوە ناگرن، بەڵکو وەک شتێکی زگماکی لە تاکەکەسدا بوونیان هەیە، هەروەها خۆگونجاندانی تاکەکەس لەگەڵ کۆمەڵگەدا وەک ئەرکێکی جەوهەری دەروونناسی دادەنێت.

تۆمەتێکی بە هەرەمێنتری دیکە لە دژی فرۆید، ئەوەیە گوایە فرۆید ڕۆڵی ناعەقلانییەتی لە کاروبارەکانی مرۆڤدا بەرفرەکردووە، ئەمەش سەد دەر سەد هەڵەیەو وابەستەی تێکەڵ و پێکەڵکردنێکی سەرەتایی دەبێت لە نێوان دانان بە سرشتی ناعەقلانییەت لە ئاکارو ڕەوشتی مرۆڤداو ئاینزای ناعەقلانییەت. بە داخەوە لەم ڕۆژگارەدا ئاینزایەکی ناعەقلانییەت بە شێوەی لەکەدارکردنی دەسکەوت و توانستە شاراوەکانی عەقڵ لە جیهانی قسەکەر بە زمانی ئینگلیزیدا هەیە، ئەم ئاینزایە بەشێکە لە شەپۆلی ڕەشبینی ئێستەکی و پارێزیاری توندڕەو، کە دواتر باسیان لێوە دەکەم.

وەلێ ئەمە لە فرۆیدەوە سەرچاوە ناگرێت، کە کەسێکی ناشایستەو عەقڵ مەندێکی سەرەتاییتر

بوویێت. ئەوەی فرۆید کردوویەتی لە پێناو فراوانکردنی بواری مەعریفەو تێگەیشتنماندا بووە لە میانەی والاکردنی ریشە ناهۆشەکییەکانی ئاکارو رەوشتی مرۆڤ بەرەو ئاقاری هۆشیاری و لێکۆڵینەوەی عەقلانی.

ئەمە بریتی بوو لە بەرفرەکردنی کایەی عەقڵ و زێدەبوونی دەسەڵاتی مرۆڤ بۆ تێگەیشتن و کۆنترۆڵکردنی خودی خۆی و دواجار بۆ تێگەیشتن و کۆنترۆڵکردنی خودی ژینگەکەی؛ هەروەها ئەم کارە گوزارشت لە دەسکەوتێکی شۆڕشگێڕانەو پێشکەوتووخواز دەکات. لەم روانگەیەشەوە فرۆید کارەکەی مارکس تەکووز دەکات نەک دژایەتی بکات.

فرۆید بەو مانایە سەر بە جیهانی هاوچەرخە، کە سەرەڕای ئەوەی سەد دەر سەد لە دەست چەمکی چەسپاو و نەگۆڕی سروشتی مرۆڤ راناکات، کەرەستەکانی تێگەیشتنی قووڵتر لە ریشەکانی ئاکارو رەوشتی مرۆڤ فەراهەمدەکات و لە میانەی رەوتە عەقلانییەکانیشەوە کەرەستەی هەموارکردنی هۆشیاری تێگەیشتنەکە فەراهەمدەکات.

گرنگی تایبەتی فرۆید لە روانگەی مێژوونووسدا لە دوولایەنەوە سەرچاوە دەگرێت.

یەکەم، فرۆید دوا ئارمانجی وەهمە کۆنەکەی پێکاوە، کە دەڵێ ئەو پاڵنەرانەی مرۆڤەکان دەبێژن یان باوەڕ بە خۆیان دەهێنن، کە لە سوونگەیانەوە کاردەکەن و لە راستیشدا پڕاوپڕی راڤەکردنی کردەوەکانیانن: بریتییە لە دەستکەوتێکی نێگەتیڤی تا رادەیەک گرنگ، هەرچەندە هەندێک کەسی خوێن گەرم بە شێوەیەکی پۆزەتیڤ بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە لە میانەی میتۆدەکانی شیکردنەوەی دەروونییەوە تیشک بخرێتە سەر ئاکارو رەوشتی پیاوە مەزنەکانی مێژوو، وەلێ پێویستە ئەم بانگەشەیە بە پارێزەوە وەربگیرێت.

کردەی شیکردنەوەی دەروونی وابەستەی گەواهی ئەو نەخۆشە دەبێت، کە دەپشکنرێت: چونکە ناتوانی گەواهی لە مردوو وەربگری.

دووەم، فرۆید لەوەدا کارەکەی مارکس بە هێز دەکات، کە مێژوونووس لە سەر تاقیکردنەوەی هەریەک لەمانەی خوارەوە هان دەدات: تاقیکرنەوەی خودی خۆی و پێگەکەی لە مێژوودا، تاقیکردنەوەی ئەو پاڵنەرانەی- لەوانەیە پاڵنەرە شاراوەکان بن- کە بژاردەی بابەتەکەی یانیش سەردەم و هەڵبژاردن و شرۆڤەکردنی راستییەکان رێنمایی دەکەن، تاقیکردنەوەی ئەو پاشخانە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییەی، کە گۆشەنیگاکەیانی دیاریکردووە، تاقیکردنەوەی ئەو چەمکەی داهاتوو،

که چەمکی مێژوونووس لە بارەی رابردوو دروستبکات.

دوای ئەوەی مارکس و فرۆید لەم بارەیەوە نووسینەکانیان بە کۆتا هێنا، مێژوونووس هیچ پەلپێکی لە بەردەمدا نەما بۆ ئەوەی وەک تاکەکەسێکی پەتی لە دەرەوەی کۆمەڵگەو دەرەوەی مێژوودا بیر لە خودی خۆی بکاتەوە.

ئەم سەردەمەمان بریتییە لە سەردەمی هۆشیاری خودی؛ مێژوونووس دەتوانێ و دەبێ بزانێ چی دەکا.

ئەو گواستنەوەیەی بە گواستنەوە بۆ جیهانی هاوچەرخ نێوزەدم کرد- واتە بەرفرەکردنی ئەرک و دەستەڵاتی عەقڵ بەرەو ئاقاری بوارە نوێکان- هێژ ناتەواوە: ئەم گواستنەوەیە بەشێکە لەو گۆڕانە شۆڕشگێڕییەی، کە لە میانەیەوە جیهانی سەدەی بیستەهەم گوزەر دەکات.

پێویستە چەند ماکێکی سەرەکی گواستنەوەکە تاقی بکەمەوە. بوارم بدەن بە ماکە ئابوورییەکان دەستپێبکەم.

باوەڕبوون بە یاسا بابەتییە ئابوورییەکان، ئەوانەی فەرکاری ئاکارو رەوشتی ئابووریانەی مرۆڤ و نەتەوەکان دەکەن، هەروەها ئەوانەی تەنها بەرەنگاری زیانی خۆیان دەبنەوە تاوەکو ساڵی ١٩١٤ بە شێوەیەکی کردەیی هیچ مشتومڕێکیان لەسەر نەبوو.

خولە بازرگانییەکان و بەرزو نزمی نرخەکان و بێکاری لە میانەی ئەو یاسایانەوە دیاریدەکران.

ئەم تێڕوانینە تاوەکو کۆتایی ١٩٣٠-یەکان هێژ لە بەندو باو سەندندا بوو کاتێک داکشانەوەی گەورەی ئابووری دەستیپێکرد.

لەوسا بەولاوە بارودۆخەکان بە خێرایی دەگۆڕان. لە ١٩٣٠-یەکاندا خەڵک باسی لە «کۆتایی مرۆڤی ئابووری» دەکرد واتە ئەو مرۆڤەی بە گونجان لەگەڵ یاسا ئابوورییەکاندا بە بەردەوامی عەوداڵی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی بوو؛ ئینجا لەوساوە جگە لە کۆمەڵێکی کەم نەبێت بە ناوی (Rip van winkles)-ی سەدەی نۆزدەهەم، هیچ کەسێک بەم مانایە باوەڕ بە یاسا ئابوورییەکان ناهێنێت.

لەم رۆژگارەدا ماکە ئابوورییەکان یا ئەوەتا بوونەتە زنجیرەیەک هاوکێشەی تیۆری بیرکارییانە، یان ئەوەتا بوونەتە توێژینەوەی پراکتیکی چۆنیەتی فەرکارکردنی هەندێک کەس بە هەندێک کەسی دیکە.

بە شێوەیەکی سەرەکی گۆڕان بریتییە لە گواستنەوە لە سەرمایەداری تاکەکەسییەوە بۆ سەرمایەداری بەرفراوانی زۆربەی خەڵک.

مادام بەڵێندەرو بازرگانەکان سەردەستەبن، ئەوا هیچ کەسێک ناتوانێ ئابووری کۆنترۆڵ بکات، یان بە هیچ شێوازێکی گرنگ ناتوانێ کاریگەری بخاتە سەر ئابووری؛ هەروەها وەهمی رەوت و یاسا و ناتاکەکەسییەکان وەک خۆیان مایەوە.

تەنانەت «بانکی ئینگلیزی» لە رۆژانی ئەوپەڕی برەو و دەسەڵاتیدا وەک تۆمارکارێکی نیمچە ئۆتۆماتیکی ئاراستە ئابوورییەکان سەیری دەکرا نەک وەک میکانیک کارێک و دەسکاریکارێک، وەلێ ئەم وەهمە هەر لەگەڵ گواستنەوە لە ئابووری سەربەستەوە بۆ ئابوورییەکی بەڕێوەبراو بەرەو نەمان دەچێ (ئینجا چ ئابوورییەکی سەرمایەداری بەڕێوەبراو بێت چ ئابوورییەکی سۆشیالیستی بێت، ئینجا ئەم بەڕێوەبردنە چ لە لایەن سەرمایەیەکی بەرفرەوە بکرێ چ لە لایەن سەرمایەیەکی بە ناو تایبەتەوە بکرێ یان لە لایەن دەوڵەتەوە بێت).

رووندەبێتەوە کە خەڵکانی دیاریکراو لە پێناو ئامانجی دیاریکراودا بڕیاری دیاریکراو دەدەن، هەروەها ئەم بڕیارانە رەوتی ئابووریمان دیاریدەکەن. ئەم رۆژگارە هەموو کەسێک ئەوە دەزانێ، کە نرخی نەوت یانیش سابوون لە بەر خاتری یاسای بابەتی داخواست و وەبازارخستن ناگۆڕێت.

هەموو کەسێک دەزانێ، یان پێی وایە دەزانێ، کە بێ بازاڕی و بێکاری دەسکردی مرۆڤن: حکومەتەکان بڕیار دەدەن، یان لە راستیدا بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە ئەوان دەزانن چۆن ئەم چەشنە پرسانە چارەسەر بکەن.

گواستنەوە لە ئابووری سەربەستەوە بۆ پلاندانان و لە ناهۆشیارییەوە بۆ هۆشیاری خودی و لە باوەڕبوون بە یاسا بابەتییە ئابوورییەکانەوە بۆ باوەڕبوون بەوەی مرۆڤ بە هۆی کردەوەی خۆیەوە دەتوانێ ببێتە سەروەری چارەنووسی ژینگەکەی خۆی، ئەنجامدرا.

سیاسەتی کۆمەڵایەتی شانبەشانی سیاسەتی ئابووری هەنگاوی ناوە: لە راستیدا سیاسەتی ئابووری لەگەڵ سیاسەتی کۆمەڵایەتیدا یەکتریان گرتووە.

با بڕگەیەک لە دوا بەرگی چاپی یەکەمی مێژووی کێمبرجی هاوچەرخ وەربگرم، کە لە ساڵی (١٩١٠)-دا بڵاوکراوەتەوە، بڕگەکە لێدوانێکی گرنگی نووسەرێکە، کە بە هیچ شێوەیەک مارکسی نەبووەو رەنگە هەرگیزیش لە بارەی لینینەوە نەیبیستبێ:

باوەڕبوون بە توانستی چاکسازی کۆمەڵایەتی لە میانەی کۆششی هۆشیارانەوە ئاراستەیەکی بەندووباوی هزری ئەوروپییە؛ ئەم بیروباوەڕە وەک دەرمانی هەموو دەردێک جێگەی باوەڕبوون بە

ئازادی گرتۆتەوە... برەوی ئەم بیروباوەڕە لەم سەردەمەدا بە قەد باوەڕبوون بە مافەکانی مرۆڤ لە سەردەمی شۆڕشی فەڕەنسیدا گرنگ و پڕ مانایە[١٥٥]. پەنجا ساڵ دوای نووسینی ئەم بڕگەیەو زیاتر لە چڵ ساڵ دوای شۆڕشی رووسی و سی ساڵ دوای داکشانەوە ئابوورییە مەزنەکە، وا لەم رۆژگارەدا ئەم بیروباوەڕە بۆتە شتێکی ئاسایی؛ هەروەها گواستنەوە لە یاسا ئابوورییە ملکەچ کراوەکانەوە بۆ ئەو یاسا بابەتییە ئابووریانەی، هەرچەندە لە رووی گریمان کردنەوە عەقلانین، کە لە توانای مرۆڤدا نەبوونە لە میانەی کردەی هۆشیارانەوە باوەڕ بە توانای مرۆڤ بهێنن بۆ ئەوەی چارەنووسی ئابووری خۆی کۆنترۆڵ بکات، ئەم کردە هۆشەکییە لای من وەک پێشکەوتنێک دەردەکەوێ لە بواری کردەیی عەقڵ لە هەمبەر کاروبارەکانی مرۆڤدا، هەروەها گوزارشت لە توانای زێدەبووی مرۆڤ دەکات بۆ تێگەیشتن و سەروەریکردن بەسەر ژینگەو خودی خۆیدا، بە شێوەیەک گەر پێویستبکات دەبێ ئامادەگیم هەبێ بە نێوە کۆنەکەی پێشکەوتن نێوزەدی بکەم.

بوارم نییە بە درێژی باس لە رەوتە هاوچەشنە کارکەرەکانی بکەم لە بوارەکانی دیکەدا.

تەنانەت زانست هەروەک بینیمان هەنووکە ئەوەندەی بە دروستکردنی ئەو گریمانانەوە خەریکە، کە رەنگە لە میانەیانەوە مرۆڤ بتوانێ سروشت بۆ مەبەستەکانی خۆی دەستەمۆ بکات و ژینگەکەی بگۆڕێ، ئەوەندە بە لێکۆڵینەوەو دامەزراندنی یاسا بابەتییەکانی سروشتەوە خەریک نییە.

لەوەش گرنگتر مرۆڤ لە میانەی پیادەکردنی عەقڵەوە نەک تەنها دەستی بە گۆڕینی ژینگەکەی کرد، بەڵکو دەستی بە گۆڕینی خودی خۆیشی کرد.

مالتووس لە پەرتووکێکی هەرەگرنگدا هەوڵیدا ئەوە بچەسپێنێ، کە یاسا بابەتییەکانی دانیشتوان بە چەشنی «یاساکانی بازاڕی» ئادەم سمیت کاردەکەن بەبێ ئەوەی هیچ کەسێک هۆشیاری لە بارەی رەوتەکەوە هەبێت.

لەم رۆژگارەدا هیچ کەسێک باوەڕ بەم چەشنە یاسا بابەتییانە ناکات؛ بەڵکو کۆنترۆڵی دانیشتوان بۆتە دۆزێکی عەقلانی و هۆشیاری سیاسەتی کۆمەڵایەتی.

لەم سەردەمەماندا بە هۆی کۆششی مرۆڤەوە درێژکردنەوەی تەمەنی مرۆڤ وگۆڕینی هاوسەنگی نێوان وەچەکانمان بینی لە نێو دانیشتوانماندا.

هەروەها لە بارەی ئەو دەرمانانەمان بیست، کە بە چەشنێکی هۆشیارانە بۆ کارکردنە سەر ئاکارو رەوشتی مرۆڤ بەکارهێنراون، هەروەها گوێبیستی ئەو کردە نۆژدارییانە بووین، کە بە ئامانجی گۆڕینی

رووخساری مرۆڤ ئەنجامدراون.

بە بەرچاوی ئێمەوە هەریەک لە کۆمەڵگەو مرۆڤ لە میانەی کۆششی هۆشیارانەی مرۆڤەوە گۆڕاون و گۆڕێندراون.

وەلێ گرنگترینی ئەم گۆڕانانە رەنگە ئەوانە بن، کە بە هۆی پەرەسەندن و بەکارهێنانی میتۆدە مۆدێرنەکانی قایلکردن و هینکرنی هزرەوە ئەفرێندراون.

ئەمرۆکە هینکەرەکان لە هەموو ئاستێکا بە شێوەیەکی هۆشیارانە زێتر بەوەوە خەریک دەبن بەشداربن لەوەی کۆمەڵگە لە قاڵبێکی تایبەتیدا دروستبکەن، هەروەها هەڵوێست و دڵسۆزی و بۆچوونە رابینەکانی ئەو چەشنەی کۆمەڵگە لە هزری وەچەی رابووندا بچەسپێنن: سیاسەتی پەروەردەیی بریتییە لە بەشێکی تەکووزی هەر سیاسەتێکی رەنگرێژکراوی کۆمەڵایەتی لە رووی عەقڵانییەتەوە.

ئەرکی سەرەکی عەقڵ لە رووی بەندیواربوونی بە مرۆڤەوە لە نێو کۆمەڵگەدا چیتر بە تەنها بۆ لێکۆڵینەوە نییە، بەڵکو بۆ گۆڕینیشە؛ هەروەها ئەم ئاستە بەرزەی هۆشیاری دەسەڵاتی مرۆڤ بۆ چاککردنی بەڕێوەبردنی کاروبارە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی لە میانەی پراکتیسکردنی رەوتە عەقڵانییەکانەوە، لای من وەک یەکێک لە لایەنە سەرەکییەکانی شۆڕشی سەدەی بیستەم دەردەکەوێ.

ئەم بەرفراوانبوونەی عەقڵ تەنها بەشێکە لەو رەوتەی، کە لە گەلاڵەنامەیەکی پێشتردا بە رەوتی «بە تاکەکەس کردن» نێوزەدم کرد- واتە هەمەجۆرکردنی زەبرەدەستی و کارو هەل و دەرفەتەکانی تاکەکەس، ئەمەش بریتییە لە پێداویستی هەر شارستانییەتییەکی پێشکەوتنخواز. رەنگە سەرەنجامدارترین ئاکامی شۆڕشی پیشەسازی زێدەبوونی پێشکەوتنخوازی بووبێت لە ژمارەی ئەو کەسانەدا، کە فێردەبن بیربکەنەوە فێردەبن عەقڵیان بەکاربهێنن.

لە بەریتانیای گەورەدا سەوداسەریمان بۆ گۆڕانی بەرەبەرە (Gradulism) لە چەشنی ئەو بزووتنەوەیەدایە، کە هەندێک جار بە دەگمەنی رەچاو دەکرێ.

بە درێژایی سەدەیەک وابەستەی چەپکە سەرەتاییەکانی فێرکردنی جیهان بووین، هەروەها ئەم ساتەشی لەگەڵ بێت هێژ بەرەو فێرکردنی باڵای جیهانی هەنگاوی خێراو بەرفراوانمان نەنانەوە.

ئەمەش مادام رێبەری جیهانمان کردبێت دۆزێکی ئەوەندە گەورە نەبووە، وەلێ کاتێک دەبێتە

دۆزێکی گەورە، کە کەسانی دیکە بە خێراییەکی زیاتر پێشمان بکەونەوە، هەروەها کاتێک پێشبرکێکە لە هەموو شوێنێکدا بە هۆی گۆڕانی تەکنۆلۆژییەوە خێرا بوو بێت.

لەبەر ئەوە شۆڕشی کۆمەڵایەتی و شۆڕشی تەکنۆلۆژی و شۆڕشی زانستی چەند بەشێکی بەندیوار بووی هەمان ڕەوتن.

گەر نموونەیەکی ئەکادیمی ڕەوتی بە تاکەکەسکردنت گەرەکە، ئەوا هەمەجۆر بوونی مەزنی پەنجا شەست ساڵی رابردووی مێژوو، یان زانست، یان هەر زانستێکی تایبەتی، بخە ژێر هزرو رامانەوە، هەروەها لە هەمەجۆری بێ شوماری زێدەبووی ئەو پسپۆڕییانەی تاکەکەس وردبەرەوە، کە بە تاکەکەسکردن فەراهەمی دەکات.

وەلێ لە ئاستێکی جیاوازدا نموونەیەکی زۆر سەرنجڕاکێشترم هەیە.

زیاتر لە سی ساڵ پێش ئێستا ئەفسەرێکی پایە بەرزی سەربازی ئەڵمانی سەردانی یەکیەتی شوورەوی کردو لە ئەفسەرێکی شوورەوی تایبەت بە دروستکردنی چەکی ئاسمانی سووپای سوورەوە گوێبیستی چەند سەرنجێکی ڕۆشنکەرەوە بوو: ئێمەی رووس هێژ ناچارین پشت بە مەتریاڵی سەرەتایی مرۆڤ ببەستین. ناچارین بزوێنەری فڕۆکە لەگەڵ ئەو جۆرە فڕۆکەوانەدا بگونجێنین، کە لە بەردەستماندا هەیە. ئەوەندەی لە پەرەپێدانی جۆرێکی نوێی مرۆڤدا سەرکەوتووبین، ئەوەندەش پەرەسەندنی تەکنیکی ماددەکە تەکووز دەبێت.

هەردوو فاکتەرەکە یەکتری مەرجدار دەکەن. ناتوانرێ مرۆڤە سەرەتاییەکان لە نێو بزوێنەرو کەرەستە ئاڵۆزەکاندا دابنرێن(١٥٦).

ئەمڕۆکە تەنها وەچەیەک دواتر، دەزانین، کە بزوێنەرە رووسییەکان چیتر سەرەتایی نین، هەروەها بە ملیۆنەها ژن و پیاوی رووسی ئەم بزوێنەرانە نەخشە دەکێشن و دروستدەکەن و کارپێدەکەن، کە هەریەکەیان چیتر سەرەتایی نین.

وەک مێژوونووسێک زێتر تامەزرۆی دیاردەی دواترم.

بە عەقڵانیکردنی وەبەرهێنان مانای شتێکی زۆر گرنگتر دەگەیەنێت- ئەویش بریتییە لە بە عەقڵانیکردنی مرۆڤ. ئەمڕۆکە مرۆڤە سەرەتاییەکان لە سەرتاسەری جیهاندا فێری چۆنیەتی بەکارهێنانی بزوێنەرە ئاڵۆزەکان دەبن، بەم پێودانگە فێردەبن بیربکەنەوەو عەقڵیان بەکاربهێنن.

ئەو شۆڕشەی ڕەنگە هەر زوو بە زوو ئێوە بە شۆڕشی کۆمەڵایەتی نێوزەدی بکەن، وەلێ من لەم

پێشاژوەی ئێستادا بە فراوانبوونی عەقڵ نێوزەندی دەکەم، کتومت تەنها لە دەستپێکدایە.

وەلێ ئەم شۆڕشە لە پێشبڕکێییەکی فەرکوسیدا بەرەوپێش دەچێت بۆ ئەوەی لەگەڵ پێشکەوتنە تەکنۆلۆژییە فەرکوسییەکانی وەچەی رابردوودا لە یەک ئاستا بێت.

ئەم جۆرە بەرەوپێش چوونە لای من وەک یەکێک لە لایەنە سەرەکییەکانی شۆڕشی سەدەی بیستەمان دەردەکەوێ. گەر لێرەدا ئاماژە بە لایەنە گۆنگ و مەترسیدارەکانی رۆڵی بەرمەبەستی عەقڵ نەدەم لە جیهانی هاوچەرخدا، ئەوا بێگومان هەندێک رەشبین و گومانبەر گوناحبارم دەکەن.

لە گەڵاڵەنامەیەکی پێشتردا ئاماژەم بە زێدەبوونی تاکەکەس کردندا، بەو مانایە وەسفم کردبوو، کە دیاردی بە هیچ لاوازکردنێکی فشارە کۆمەڵایەتییەکان نەدابێت بۆ تەبایی و یەکریزی.

لە راستیدا ئەمە یەکێکە لە پارادۆکسەکانی کۆمەڵگەی هاوچەرخی ئاڵۆز.

پەروەردەکردن، یەکێکە لە ئامرازە بەهێزو پێویستەکانی بەهێزکردنی بەرفرەیی دەرفەت و تواناکانی تاکەکەس و دواجار کەرەستەیەکی بەهێزو پێویستی زێدەکەری بە تاکەکەسکردنە، هەروەها لە هەمان کاتدا ئامرازێکی بەهێزە لە بەردەستی ئەو گروهانەدا، کە تامەزرۆی بەهێزکردنی تەبایی کۆمەڵایەتین.

ئەو راڤەکردنانەی لە هەمبەر دەزگا بەرپرسەکانی پەخش و تەلەفزیۆندا دەبیسترێن، یان لە هەمبەر رۆژنامەوانی بەرپرسدا دەبیسترێن، بە پلەی یەکەم لە دژی ئەو دیاردە نێگەتیڤە دیاریکراوە ئاراستە دەکرێن، کە تۆمەتبارکردنی کارێکی ئاسانە.

وەلێ بە خێرایی دەبنە راڤەکردنی بەکارهێنانی ئەم ئامرازە بەهێزانەی قایلکردنی جەماوەر بۆ ئەوەی بۆچوونە بە چێژو چێژە خوازیارەکان (لە نێو خەڵکدا) بڵاو بکەنەوە- پێوەدانگی خوازیاریەتیش لە بۆچوون و چێژە قبووڵکراوەکانی کۆمەڵگەدا دەدۆزرێتەوە.

ئەم چەشنە شاڵاوانە لە تێڕوانینی ئەو کەسانەدا، کە پایەبەرزیان دەکەن بریتین لە کۆمەڵێک رەوتی هۆشەکی و عەقڵانی بەرئامانج بۆ دارشتنی، کۆمەڵگە لە ئاراستەیەکی خوازیاردا بە هۆی دارشتنی بچمی ئەندامە تاکەکەسەکانی کۆمەڵگەوە.

نموونە پرشنگدارەکانی دیکەی ئەم مەترسییانە لە لایەن راگەیەنەری بازرگانی و چاوەڕاوکەری سیاسییەوە فەراهەم دەکرێن.

لە راستیدا هەردوو رۆڵەکە بە زۆری دوو ئەوەندەی خۆیان رۆڵدەگێرن؛ چونکە پارت و کاندیدکراوەکان راگەیەنەرە پیشەکارەکان بۆ مسۆگەرکردنی سەرکەوتنی خۆیان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی

ئەمریکادا بە ئاشکرایی و لە بەریتانیای مەزندا بە شێوەیەکی خەجاڵەتمەندانەتر بەکاردەهێنن.

ئەم ڕێبازە تەنانەت ئەگەر بە شێوەیەکی ڕەسمی لە یەکتری جیاوازبن، ئەوا بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش لە یەکتری دەچن. ڕاگەیەنەرە پیشەکارەکان و سەرۆک بەشی چاوەڕاوکەری پارتە گەورەکان کەسانی زۆر زیرەکن، چونکە تەواوی سەرچاوەکانی عەقڵ لە پێناو کارەکەی خۆیاندا بەکاردەهێنن.

هەرچۆنێک بێت، عەقڵ هەروەک لە چەند نموونەیەکی تردا تاقیمانکردەوە تەنها بۆ دۆزینکاری بەکارناهێنرێت، بەڵکو بە شێوەیەکی ئاواکەرەوە بەکاردەهێنرێت، تەنها بە شێوەیەکی چەقبەستوو بەکارناهێنرێت، بەڵکو بە شێوەیەکی دینامیکی بەکاردەهێنرێت.

ڕاگەیەنەرە پیشەکارو بەڕێوەبەری هەڵمەتەکان بە شێوەیەکی سەرەکی خۆیان بە ڕاستییە هەییەکانەوە خەریک ناکەن.

ئەوان بایەخ بەوە دەدەن، کە بەکاربەر یان دەنگدەر لەم ساتەدا باوەڕی پێیەتی، یان تەنها تا ئەو ئەندازەییە باوەڕ بەو ڕووداوانە دەکەن، کە دەچێتە ئەنجامی کۆتاییەوە، واتە تا ئەو ئەندازەییەی لە میانەی مامەڵەی کارامەوە دەتوانرێ دەنگدەر یان بەکاربەر تەفرە بدرێ تاوەکو باوەڕی پێبکات یان حەزی لێی بێت. سەرەڕای ئەوە توێژینەوەکانیان لە بارەی دەروونناسی جەماوەرەوە پێشانیانیداون، کە خێراترین ڕێگەی دەستەبەرکردنی تێڕوانینەکانیان لە میانەی پەنابردنە بەر سرشتێکی ناعەقڵانی لە پێکهاتەی کڕیار یانیش هەڵبژێرەردا دێتەدی، بە شێوەیەک ئەو وێنەیەی، کە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە وێنەیەکە تیایدا دەستەبژێرێکی پیشەسازکارەکان یانیش سەرکردەی پارتەکان لە میانەی ڕەوتە عەقڵانییە هەرە پەرەسەندووەکانەوە، کە لە ڕەوتی هەر سەردەمێکی پێشتر پێشکەوتووترن بە هۆی تێگەیشتن و بازرگانی کردن بە ناعەقڵانییەتی جەماوەرەوە ئامانجەکانی بەدەستدەهێنێ.

هاوار بردنەکە بە پلەی یەکەم بۆ بەر عەقڵ نییە: بەڵکو بە شێوەیەکی سەرەکی دەسادەیی ئەو میتۆدە دەکات، کە ئۆسکار وایلد بە، لێدانی ژێرەوەی هزر «نیوزەدی کردووە». تا ڕادەیەک لە وێنەکەدا زێدەڕۆییم کردووە، نەوەکو لەمەڕ لەکەدارکردنی مەترسییەکەوە تۆمەتبار بکرێم[١٥٧].

وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا وێنەیەکی ڕاستەقینەیە، هەروەها بە ئاسانی بەسەر بوارەکانی تردا جێبەجێ دەبێت.

لە هەموو کۆمەڵگەیەکدا گروهە فەرمانڕەواکان لە پێناو ڕێکخستن و کۆنترۆڵکردنی ڕای

جەماوەردا کەمتر یا زیاتر ڕێوشوێنە زۆرەملێکان دەگرنەبەر.

وا دیارە ئەم میتۆدە لە میتۆدەکانی تر خراپتر بێت، چونکە خراپ بەکارهێنانێکی عەقڵ لە نێوخۆ دەگرێت.

لە وەڵامدانەوەی ئەم تۆمەتبارکردنە جدی و چەسپاوەدا تەنها دوو پاساوم هەیە.

پاساوی یەکەمیان پاساوێکی ئاساییە، دەڵێ هەموو داهێنانێک و هەموو نڤارێک و هەموو تەکنیکێک، کە لە ڕەوتی مێژوودا دۆزرابێتەوە لایەنی نێگەتیڤ و لایەنی پۆزەتیڤی هەیە.

باربوەکەش هەمیشە لە لایەن کەسێکەوە لە ئەستۆ دەگیرێت.

نازانم دوای داهێنانی چاپ چەندی خایاندووە، کە ڕەخنەگرەکان دەستیاندایە ئاماژەدان بەوەی ئەم داهێنانە بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوونە هەڵەکانی ئاسانکردووە.

لەم ڕۆژگارەدا شین و ڕۆڕۆکردن بۆ مردووەکانی سەر ڕێگا بە هۆی داهێنانی ئۆتۆمبێلەوە شتێکی ئاساییە؛ تەنانەت هەندێک لە زانایان پەژارە بۆ ئەوە دەخۆن، کە ڕێگەو هۆ و پێناوەکانی بڵاوبوونەوەو هەڵدانی وزەی ئەتۆمیان دۆزیوەتەوە، ئەمەش بە هۆی بەکارهێنانە فەلاکەتبارەکانی لێی کەوتۆتەوەو لێی دەکەوێتەوە.

ئەم گازاندانە لە رابردوودا سوودیان نەبووە، پێناچێ لە داهاتووشدا سوودیان هەبێت بۆ ئەوەی پێشکەوتنی دۆزینەوەو داهێنانە نوێکان بووەستێنن.

ئەوەی لە تەکنیک و توانستە شاراوەکانی چاوەڕاوی جەماوەر فێری بووینە ناتوانرێ بە ئاسانی هەمشفبکرێت. گەڕانەوە بۆ دیموکراسی تاکەکەس گەرایی بەرتەسکی لۆژکیان یانیش تیۆری لیبراڵی چیتر شیاو نییە، کە لە ساڵانی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا لە بەریتانیای گەورە هاتەدی، هەروەها گەڕانەوە بۆ سەردەمی کەروبار (horse and buggy) یانیش بۆ سەرمایەداری سەربەستی سەرەتایی بە هەمان شێوە چیتر شیاو نییە.

وەلێ وەڵامی ڕاست ئەوەیە، کە ئەم خراپەکارییانە لەگەڵ خۆیاندا چارەسەری خۆیان هەڵدەگرن.

چارەسەرەکە لە پەرستشی ناعەقڵانییەت یانیش لە دەست لە خۆبەردانی ڕۆڵی بەرفرەی عەقڵدا نییە لە کۆمەڵگەی مۆدێرندا، بەڵکو چارەسەرەکە لە گەشەسەندنی هۆشیارییەکدایە، کە عەقڵ دەتوانێ لە ژێرەوەو سەرەوەدا بگیرێت.

ئەمەش خەوبینینێکی خەیاڵی نییە، لە کاتێکا زیادبوونی بەکارهێنانی عەقڵ لە هەموو

ئاستەکانی کۆمەڵگەدا بە هۆی شۆڕشی تەکنەلۆژی و زانستیمانەوە تەنگمان پێهەڵدەچنێت.

ئەم پێشکەوتنەش وەک هەموو پێشکەوتنە گەورەکانی تر لە مێژوودا بەهاو و زیانەکانی خۆی هەیە، کە پێویستە بدرێن، هەروەها مەترسییەکانیشی، کە رووبەرووی دەبنەوە.

سەرەڕای گومانبەرو گاڵتەچییەکان و پەیامبەرانی فەلاکەت، بە تایبەتی لە نێو رۆشنبیرانی ئەو وڵاتانەی، کە پێگەی ئیمتیازاتی پێشوویان بەرەو لاوازی دەڕوات، ئەوا خۆم بە شەرمەزار نازانم وەک نموونەیەکی زەق و زۆر پێشکەوتن لە مێژوودا حسێبی بکەم.

رەنگە ئەم دیاردەیە سەرنجڕاکێشترین و شۆڕشگێڕترین دیاردە بێت لەم سەردەمەماندا.

لایەنی دووەمی شۆڕشی پێشکەوتنخواز، کە لە میانەیەوە گوزەردەکەین بریتییە لە شێوەی گۆڕاوی جیهان.

سەردەمی مەزنی سەدەکانی پانزە و شانزە، کە تیایاندا سەرەنجام جیهانی چەرخی ناوەڕاست لەبەریەک هەڵوەشاو بناخەکانی جیهانی مۆدێرن هەڵنران، بە دۆزینەوەی کیشوەرە نوێکان و گوێزرانەوەی مەڵبەندی جیهانی گرنگ لە کەنارەکانی دەریای ناوەڕاستەوە بۆ کەنارەکانی ئەتلەنتێک جیادەکرایەوە. تەنانەت هەڵچوونی کەمتری شۆڕشی فەرەنسا دەرئەنجامی جوگرافیایی خۆی هەبوو لە راڤەکردنی ئەوەی جیهانی نوێ قەرەبووی هاوسەنگی جیهانی کۆن بکاتەوە.

وەلێ ئەو گۆڕانکارییانەی بەهۆی شۆڕشی سەدەی بیستەمەوە روویاندا لە هەر شتێکی دیکە ئاودامانتربوون، کە دوای سەدەی شازدەهەم روویاندا.

دوای چوارسەد ساڵێک مەڵبەندی جیهانی گرنگ بە شێوەیەکی بەرچاو لە ئەوروپای رۆژئاوا دوورکەوتەوە، ئەوروپای رۆژئاواو بەشە دوورەکانی قسەکەر بە زمانی ئینگلیزی بوونە تیلمەیەکی کیشوەری ئەمریکای باکوور، یان گەر بتەوێ، بوونەتە بارستەیەک تیایدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەم وەک سەرچاوەی وزەو هەم وەک کەلووی کۆنترۆڵ کاردەکات.

وەنەبێ ئەمەش تاکە گۆڕان بێت، یان لەوانەبێ گرنگترین گۆڕان بێت.

بە هیچ شێوەیەک دیارو بەرچاو نییە، کە مەڵبەندی جیهانی گرنگ ئۆقرە دەگرێت، یان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەردەوام دەبێت تاوەکو ئۆقرە بگرێت لە جیهانی قسەکەر بە زمانی ئینگلیزی و پاشکۆکەی لە ئەوروپای رۆژئاوادا.

وا دیارە بەشی گەورەی وشکانی ئەوروپای رۆژهەڵات و ئاسیا لەگەڵ درێژبوونەوەکانی بۆ ئەفریقا،

ئەو بەشە بێت، کە ئەمڕۆکە کاروبارەکانی جیهان بەڕێوە دەبات. دەستەواژەی، ڕۆژهەڵاتی نەگۆڕ، ئەمڕۆکە بریتییە لە دەستەواژەیەکی کەونارا.

بوارمان بدەن تێڕوانینێکی خێرا لە بارەی ئەو ڕووداوانەوە بدەینە دەست، کە لەم سەدەیەدا لە ئاسیادا ڕوویاندا. چیرۆکەکە بە هاوپەیمانییەتی ئەنگلۆ- ژاپۆنی ساڵی ١٩٠٢ دەستپێدەکات- ئەمەش بریتی بوو لە یەکەم قبووڵی وڵاتێکی ئاسیایی لە بازنەی سەرنجڕاکێشی دەسەڵاتە مەزنەکانی ئەوروپادا.

ڕەنگە ئەمە وەک ڕێکەوتێک سەیر بکرێ، کە ژاپۆن بە هۆی بەربەرەکانی کردن و تێکشکاندنی ڕووسیاوە پێگەی خۆی بەرزکردەوەو بەم پێوودانگە یەکەم بڵێسەی داگیرساند، کە شۆڕشی مەزنی سەدەی بیستەمی لێکەوتەوە. شۆڕشەکانی ١٧٨٩-و - ١٨٤٨-ی فەرەنسا لاساییکەرەوەکانیان لە ئەوروپادا پەیدا کرد.

شۆڕشی یەکەمی ڕووسیا لە ساڵی ١٩٠٥-دا لە ئەوروپادا دەنگی نەدایەوە، بەڵکو لە ئاسیادا لاساییکەرەوەکانی خۆی پەیدا کرد: لە چەند ساڵێکی دواتردا چەند شۆڕشێک لە ئێران و تورکیاو چیندا ڕوویاندا.

بە شێوەیەکی ڕاست و دروست جەنگی جیهانی یەکەم جەنگێکی جیهانی نەبوو، بەڵکو جەنگێکی ئەهلی ئەوروپی بوو- بەو گریمانەی بوونگەیەک بە ناوی ئەوروپاوە هەبوو- خودانی کۆمەڵێک سەرەنجامی بەرفرەی جیهانی بوو؛ ئەم سەرەنجامانە هاندانی پەرەسەندنی پیشەسازی تێدابوو لە زۆربەی وڵاتانی ئاسیادا، هەروەها هاندانی هەستی دژە بێگانەی لە چیندا تێدابوو، هەروەها هاندانی نەتەوەخوازی هیندی و لەدایکبوونی نەتەوەخوازی عەرەبییان لە نێوخۆ دەگرت.

شۆڕشی ڕووسیای ساڵی ١٩١٧ تەوژمێکی دیکەو یەکلاییکەرەوەی بەخشی.

ئەوەی لێرەدا گرنگ بێت ئەوەبوو سەرکردەکانی شۆڕشی بە بەردەوامی بەڵام بەبێ ئاکامی لە ئەوروپادا بە دوای لاساییکەرەوەکاندا دەگەڕان، وەلێ سەرەنجام لە ئاسیادا دۆزییانەوە.

ئەمەش ئەوروپا بوو، کە بوو بە «نەگۆڕ» بەڵام ئاسیا لە گۆڕاندا بوو.

پێویستیم بەوە نییە تا ئەم کاتە درێژە بەم چیرۆکە بەندوباوە بدەم.

هێژ بە دەگمەن مێژوونووس لەو ئاستەدایە، کە ئامانج و گرنگی شۆڕشی ئاسیاو ئەفریقا هەڵبسەنگێنێ. وەلێ بڵاوبوونەوەی ڕەوتە پیشەسازی و تەکنەلۆژییە مۆدێرنەکان و بڵاوبوونەوەی

سەرەتاکانی هۆشیاری سیاسی و پەروەردەکردن بە نێو ملیۆنەها خەڵکی ئاسیاو ئەفریقیادا رووکاری ئەو کیشوەرانە دەگۆڕێت؛ هەروەها لە کاتێکدا ناتوانم چاو ببرمە داهاتوو، ئەو لە بارەی هیچ پیوودانگێکی ئەو بڕیاردانەوە نازانم، کە بوارم دەدات ئەم گۆڕانە وەک هەر شتێک دابنێم تەنها پەرەسەندنی پێشکەوتنخواز نەبێت لە روانگەی جیهانی مێژوودا. شێوەی گۆڕاوی جیهان، کە لە سوونگەی ئەم رووداناوە سەرچاوەی گرتووە بۆتە هۆی لاوازبوونێکی رێژەیی کێش لە کاروبارەکانی جیهاندا، بێ گومان لەم وڵاتەدا، رەنگە بە شێوەیەکی گشتیش لە وڵاتی ئینگلیزی زمانەکاندا ئەمە بەدی بکرێت.

وەلێ لاوازبوونەکە لاوازبوونێکی رەها نییە؛ هەروەها ئەوەی هەراسانم دەکاو دەمترسێنێ کشانی پێشکەوتن نییە لە ئاسیا و ئەفریقادا، بەڵکو ئامالْ کەوەی گروهە قەڵەمڕەوەکانە لەم وڵاتەدا- هەروەها رەنگە لە شوێنێکی تردا- بۆ خۆ لە گێلی دان یانیش چاونووقاندن لە ئاستی ئەم رووداوانەداو بۆ هەڵبژاردنی هەڵوێستێک لە بەرامبەریاندا، کە لە نێوان بێ متمانەیی بە سووک سەیرکردن و نەرم و نیانی خۆش دوورییدا دەشەکێ، هەروەها بۆ رۆچوون بە ناخی بیرکردنێکی ئیفلیج کەری رابردوو.

ئەوەی لە شۆڕشی سەدەی بیستەمماندا بە فراوانبوونی عەقڵ نێوزەدمکرد لە هەمبەر مێژوونووسدا کۆمەڵێک دەرئەنجامی تایبەتی هەیە؛ فراوانبوونی عەقڵ بە شێوەیەکی جەوهەری واتە سەرهەڵدانی گروه و چینەکان و سەرهەڵدانی خەڵکان و کیشوەرەکان لە ناو مێژوودا ئەوانەی هێژ لە دەرەوەی مێژووبوونە.

لە گەلاڵەنامەی یەکەممدا پێشنیاری ئەوەم کرد، کە ئامالْ کەوەی مێژوونووسانی چەرخی ناوەڕاست بۆ تێڕوانینی کۆمەڵگەی چەرخی ناوەڕاست لە میانەی دیمەنەکانی ئاییندا بە هۆی تایبەتمەندی پاوانکراوی سەرچاوەکانییانەوە بوو.

دەمەوێ تۆزێکی تر ئەم راڤەکردنە درێژە پێ بدەم. پێم وایە، هەرچەندە بە زێدەڕۆییەوە، وەلێ بە شێوەیەکی دروست دەگوترا، کە کڵێسەی مەسیحی «دامەزراوەیەکی عەقلانی چەرخەکانی ناوەڕاست بووە» (١٥٨).

مادامێک کڵێسە دامەزراوەیەکی عەقلانی بووبێت، ئەوا دامەزراوەیەکی مێژوویش بووە؛ کەوابوو کەوتۆتە بەر ئەو رەوتە عەقلانییەتەی پەرەسەندن، کە مێژوونووس دەیتوانی لێی تێبگات.

کۆمەڵگەی دنیایی لەلایەن کڵێسەوە لە قاڵب دەدراو ڕێکدەخرا، هەروەها ژیانێکی عەقڵانی خودی خۆی نەبوو. زۆرینەی خەڵک بە چەشنی خەڵکانی پێش مێژوو ئامالکەوەیان زیاتر بە لای سروشت دابوو نەک بە لای مێژوودا.

کاتێک مێژووی مۆدێرن دەست پێدەکات، کە خەڵکی بە چەشنێکی بێشوومار باڵاگەردانی هۆشیاری سیاسی و کۆمەڵایەتی بن، هەروەها وەک بوونەوەرێکی مێژوویی خودان ڕابردوویەک و داهاتوویەک لە گروهەکانیان شارەزابن، و بە تەواوی بچنە ناخی مێژووەوە.

تەنها لە دووسەد ساڵی ڕابردوودا بە شێوەیەکی سەرەکی تەنانەت لە چەند وڵاتێکی پێشکەوتووشدا هۆشیاری سیاسی و کۆمەڵایەتی و مێژوویی تا ڕادەیەک بە نێو زۆرینەی دانیشتواندا بڵاوبوویەوە.

تەنها لەم ڕۆژگارەدا بۆتە شتێکی ئاسایی، کە جیهانێکی ئاودامانی پێکهاتوو لەو خەڵکانە وێنا بکرێت، کە بە مانای وشە چوونەتە ناو مێژووەوەو بایەخ بە مێژوونووس دەدەن، نەک قەڵەمڕانی کۆڵۆنیالی یانیش ئەنترۆپۆلۆژیستێک.

ئەمەش لە چەمکی مێژووماندا بریتییە لە شۆڕشێک.

مێژوو لە سەدەی هەژدەهەمدا هێژ مێژووی دەستەبژێرەکان بوو.

لە سەدەی نۆزدەهەمدا مێژوونووسە بەریتانییەکان لێرەو لەوێ بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ وەک مێژووی سەرلەبەری کۆمەڵگەی نەتەوەیی بە پیر تێڕوانینێکی مێژووەوە دەچوون.

جێی. ئاڕ. گرین، کە مێژوونووسێکی سادەبوو، بە هۆی نووسینی یەکەم «مێژووی گەلی ئینگلیز» ناوبانگێکی زۆری بەدەستهێنا.

لە سەدەی نۆزدەهەمدا هەموو مێژوونووسێک ماستاوی بۆ ئەم تێڕوانینە دەکرد؛ وەلێ هەرچەندە کردار و گوفتار لە یەکتری جیاوازن، ئەوا زۆر لەسەر ئەم کەموکوڕییانە ناوەستم، چونکە منیش وەک مێژوونووسەکان لە دەرەوەی ئەم وڵاتەو لە دەرەوەی ئەوروپای ڕۆژئاوادا بە نسکۆکانمانەوە خەریکم.

ئاکتن لە ڕاپۆرتی ساڵی ١٩٨٦-یدا بە شێوەیەک لە بارەی مێژووی ئاودامانییەوە دوواوە «کە لە مێژووی لێکدراو جیاوازە».

هەروەها دەڵێ: بە چەشنێکی دوابەدوای یەکتر دەجووڵێ، کە لە هەمبەریدا نەتەوەکان دەبنە شتی لاوەکی. هەروەها مێژووی ئەم نەتەوانە لەبەر خاتری خۆیان ناگێڕدرێتەوە، بەڵکو بە گوێرەی

بەندیواربوون و دواکەوتەیی زنجیرە باڵاکان و بە گوێرەی ئەو پلە و کاتەی، کە بەشداری لە چارەنووسی هاوبەشی مرۆڤایەتیدا دەکەن دەگێردرێتەوە[١٥٩].

هەروەها گومانی تێدا نییە، کە مێژووی ئاودامانی هەروەک ئاکتن وێنای کردووە جێگەی بایەخی هەر مێژوونووسێک بووە.

کەوابوو لەم ساتەدا بۆ ئاسانکردنی ڕێبازی مێژووی ئاودامان چی بکەین؟

نیازم وانەبوو لەم گەلاڵەنامانەدا باسی خوێندنی مێژوو بکەم لەم زانکۆیەدا: وەلێ ئەم بابەتە چەشنە نموونەگەلێکی سەرنجڕاکێشم بۆ فەراهەم دەکات، ڕەنگە ترسنۆکی لە منەوە بێت، گەر خۆمی تێنەهاوێم.

لە چل ساڵی رابردوودا شوێنێکی سەرەکیمان لە مەنهەجەکەماندا بۆ مێژووی وڵاتە یەکگرتووەکان تەرخانکردبوو.

ئەمەش بریتییە لە پێشکەوتنێکی گرنگ، وەلێ ئەمە مەترسییەکی تایبەتی توندوتۆڵکردنی بیرتەسکی مێژووی ئینگلیزی لەگەڵ خۆیا هێنا، کە پێشتر لەسەر مەنهەجەکەمان وەک وەقفێک وابوو، هەروەها بیرتەسکییەکی گزیبارتر و وەک یەک مەترسیداری جیهانی ئینگلیزی زمانی هێنایە ئاراوە.

بێگومان لە چوارسەد ساڵی رابردوودا جیهانی ئینگلیزی زمان سەردەمێکی مەزنی مێژووبووە.

وەلێ سەیرکردنی وەک چەقی مێژووی ئاودامانی و لە دەرەوە دانانی هەموو شتێکی تر لە هەمبەریدا بریتییە لە شێواندنێکی پەژارەداری تێڕوانینەکە.

پێم وایە فێرگەی مێژووی مۆدێرن لەم زانکۆیەدا لە گوێ پێنەدانی ئەم ئەرکەدا کەم و کورتی زۆری هەبووە. بێگومان شتێکی هەڵەیە بواری ئەوە بە کاندیدێک بدرێ، کە داوای بەدەستهێنانی پلەی باڵا بکات لە مێژوودا لە زانکۆیەکی گرنگدا بەبێ ئەوەی جگە لە ئینگلیزی مەعریفەیەکی تەواوی لە هەر زمانێکی تری مۆدێرندا هەبێت؛ بوارمان بدەن پەند لەوە وەربگرین، کە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد دا چی بەسەر دیسپلینی کۆن و ڕێزداری فەلسەفەدا هات کاتێک کارمەندەکانی گەیشتنە ئەو دەرئەنجامەی توانیویانە بە هۆی ئینگلیزی سادەی ڕۆژانەوە کاری خۆیان زۆر بە ڕێکوپێکی ئەنجام بدەن.

بێگومان شتێکی هەڵەیە ئاسانکاری پێشکەش بە کاندید نەکرێ بۆ ئەوەی جگە لە ئاستی مەنهەج مێژووی مۆدێرنی هەر وڵاتێکی کیشوەری ئەوروپا بخوێنێ.

ئەو کاندیدەی هەندێک زانیاری لە بارەی کاروبارەکانی ئاسیا و ئەفریقا، یان ئەمریکای لاتینیدا هەیە لەم ساتەدا دەرفەتێکی زۆر بەرتەسکی هەیە بۆ ئەوی ئەو زانیاریە لە پەیپەرێکی نێوزەدکراو بە سەرفرازی مەزنی سەدەی نۆزدەهەمی، فراوانبوونی ئەوروپا، بڵاوبکاتەوە. بە داخەوە ناوونیشانەکە پڕ بە پێستی نێوەڕۆکەکانە: کاندیدەکە داوای لێناکرێ هیچ شتێک تەنانەت لە بارەی وڵاتە گرنگ و مێژوو بەڵگەدارەکانی چەشنی چین و ئێران بزانێ، جگە لەوەی کاتێک ئەوروپییەکان هەوڵیانداوە دەستیان بەسەردا بگرن.

دەزانم، لەم زانکۆیەدا گەلاڵەنامە لە بارەی مێژووی رووسیا و فارس و چین پێشکەش دەکرێن- وەلێ لە لایەن ئەندامانی بەشی مێژووەوە نا.

ئەو بیروباوەڕە پتەوەی پرۆفیسۆری چینی پێنج ساڵ بەر لە ئێستا لە دەسپێکی گەلاڵەنامەیەکدا گوزارشتی کردبوو، کە ناتوانرێ چین لە دەرەوەی ڕێڕەوی سەرەکی مێژووی مرۆڤایەتی دابنرێت»(١٦٠) وەلێ ئەم گووتەیە نەچوویە گوێی مێژوونووسانی کامبریجەوە.

ئەوەی لەوانەیە لە داهاتوودا بە گەورەترین کاری مێژوویی زانکۆی کامبریج دابنرێت لە ماوەی دەیەی رابردوودا لە دەرەوەی بەشی مێژوو هەروەها بەبێ هیچ یارمەتییەکی ئەو بەشە نووسراوە: بۆ نموونە ئاماژە بەم پەرتووکە دەدەم (دکتۆر نیدهام، زانست و شارستانییەت لە چیندا).

ئەمە هزرێکی سەنگینە.

نەدەبوو ئەم ژانە دەروونییانە بخەمە بەرچاوی سەراپای خەڵک، وەلێ پێم وایە ئەوانە تیپیکاڵی زۆرترینی زانکۆکانی تری بەریتانیاو بە گشتی تیپیکاڵی رۆشنبیرە بەریتانییەکان بن لە ناوەڕاستی ساڵانی سەدەی بیستەمدا.

ئەو نوکتە کەونارایییەی دەربارەی دوورگەی سەردەمی ڤیکتۆریایە، رەشەباکان لە کۆنەوە هەڵدەکەن- کیشوەری کەنارگیر، ئەمڕۆکە نقێمێکی قێزەوەنی هەیە.

جارێکی تر رەشەباکان لە جیهانی ئەودیووەوە هەڵدەکەن؛ لە کاتێکدا ئێمە مانان لە وڵاتانی ئینگلیزی زماندا بە یەکەوە هەڵپە دەکەین و بە ئینگلیزی سادەی رۆژانە ئەوە بە خۆمان دەڵێین وڵات و کیشوەرەکانی تر بە هۆی هەڵسوکەوتی نائاساییانەوە لە پیت و بەرەکەتی شارستانییەکەمان دابڕاون، ئەوەش وا دیارە هەروەک بڵێی ئێمە لە میانەی نەتوانایی و ناویستەکی تێگەیشتنەوە لەوەی بە راستی لە جیهاندا روودەدات دابڕابووین.

له دەسپێکی دەستەواژەکانی گەلاڵەنامەی یەکەمدا سەرنجم دایە جیاوازی بەهێزی ئەو تێڕوانینەی، که سالانی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم لە سالانی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم جیادەکاتەوە.

له کۆتاییدا دەمەوێ ئەم دژیەکییە پەرەپێبدەم؛ هەروەها گەر لەم پێشاژۆوەدا هەریەک لە وشەکانی «لیبرال» و «پارێزیار» بەکاربهێنم، ئەوا بە ئاسانی دەبێت لەوە تێبگەین، کە وەک ناو و ناتۆرەیەک لە مانایاندا بۆ پارتە بەریتانییەکان بەکاری ناهێنم.

کاتێک ئاکتن لە بارەی پەرەسەندنەوە دوواوە، بە گوێرەی چەمکی «هەنگاوگەرایی» بە هەرەمێنی بەریتانی بیری نەکردۆتەوە.

«شۆڕش» یان هەروەک دەڵێین لیبرالیزم، بریتییە لە دەستەواژەیەکی گرنگی نامەکەی ۱۸۸۷.

ئاکتن دە ساڵ دواتر لە گەلاڵەنامەیەکدا دەربارەی مێژووی هاوچەرخ وتوویەتی «میتۆدی پێشکەوتنی هاوچەرخ بریتی بووە لە شۆڕش»؛ هەروەها لە گەلاڵەنامەیەکی دیکەدا لە بارەی، هاتنە ئارای ئەو هزرە گشتیانە دوواوە «کە پێیان دەڵێین شۆڕش».

ئەمە لە یەکێک لە تێبینییە دەستنووسە بڵاونەکراوەکانیدا راڤە دەکرێت: (ویگ «چاکسازی» لە میانەی سازشەوە قەڵەمڕەوی کردووە: لیبراڵی فەرمانڕانی ئایدیاکان دێنێتە ئاراوە[١٦١].

ئاکتن باوەڕی وابووە، کە «فەرمانڕانی ئایدیاکان» مانای لیبرالیزم بووە، لیبرالیزمیش مانای شۆڕش بووە.

له سەردەمی ئاکتندا لیبرالیزم هێژ هێزی خۆی وەک داینامیکێکی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لەدەست نەدابوو.

لەم رۆژگارەماندا، ئەوەی لە لیبرالیزم بەجێ دەمێنێ دەبێتە فاکتەرێکی پارێزیار لە کۆمەڵگەدا.

رەنگە بێ مانابێ ئەم رۆژگارە گوتار بۆ گەڕاوەی ئاکتن بدەین.

وەلێ مێژوونووس یەکەم جار بایەخ بەوە دەدات لە کوێدا ئاکتن وەستاوە، دووەم جار پێگەکەی لەگەڵ پێگەی بیرمەندە هاوچەرخەکاندا بەراورد دەکات، سێیەم جار لەو سرشتانە دەکۆڵێتەوە، کە لەوانەیە هێژ لە هەڵوێستەکەیدا ئەمرۆ بەکاربن.

بێگومان وەچەی ئاکتن دووچاری متمانە بەخۆبوونێکی بێ رادەو گەشبینی بوویەوە، هەروەها بە تەواوی سروشتی گوماناوی ئەو پێکهاتەیەی بەرپەبا نەکرد، کە باوەڕەکەی وابەستەیەتی.

وەلێ دوو شتی هەیە، کە تا سەر ئێسقان پێویستیمان پێیانە: هەستی گۆڕان وەک فاکتەرێکی

پێشکەوتنخواز لە مێژوودا، هەروەها باوەڕبوون بە عەقڵ وەک ڕێنیشاندەرمان بۆ تێگەیشتنی ئاڵۆزییەکانی.

بوارمان بدەن هەنووکە گوێبیستی هەندێک دەنگی ١٩٥٠-کان بین.

لە گەڵاڵەنامەیەکی پێشتردا گوزارشتەکەی سێر لویس نامیەرم لە بارەی قایل بوونەوە وەرگرت، دەڵێ «لە کاتێکدا هەردوو پارتەکە پڕۆگرام و ئایدیالەکان لەیاد دەکەن، ئەوا بە دوای چارەسەری کردەیی پرسە بەرهەستەکاندا گەڕاون» هەروەها ناڤۆکی نامیەر وەک نیشانەیەکی «پێگەیشتنی نەتەوەییە»[١٦٢].

من بەم لەیەکچوونانەی نێوان ژیانی تاکەکەسەکان و ژیانی نەتەوەکان ئەویندار نابم؛ وەلێ گەر پەنا ببرێتە بەر وێکچوونێکی لەم چەشنە، ئەوا مرۆڤ وا لێدەکات بپرسێت کاتێک قۆناغی «پێگەیشتنمان» پەڕاند چی بە دوادا دێت.

وەلێ ئەوەی سەرنجم رادەکێشێت دژیەکی دژواری نێوان کردەیی و بەرهەستە، کە ستایش دەکرێن، هەروەها بەرنامەڕێژی و ئایدیالەکانە، کە تۆمەتبار دەکرێن. بێگومان بەرزکردنەوەی کاری کردەیی بەسەر بە تیۆریکردنی ئایدیالیدا نیشانەیەکی بەرچاوی پارێزیارییە (Conservatism).

ئەمە لە هزری نامیەردا گوزارشت لە دەنگی سەدەی هەژدەهەمی بەریتانا دەکات بە بۆنەی هاتنە سەر دەسەڵاتی جۆرجی سێیەمەوە، کە دژی هاکا رووبداو هاکا روونەدای شۆڕشی ئاکتن و فەرمانڕانی ئاییدیاکان بێزاری دەربڕی.

وەلێ هەمان گوزارشتی رامی پارێزیاری راشکاو لەم رۆژگارەماندا لە شێوەی ئەزموونگەرایی راشکاودا تا سەر ئێسقان بە هەرەمێنە.

رەنگە بە هەرەمێنترین شێوەی ئەم چەشنە لە تێبینییەکەی پرۆفیسۆر تریڤۆر- رۆپەردا بدۆزرێتەوە، کە دەڵێ، کاتێک رادیکاڵەکان دەڵێن بێگومان سەرکەوتن هی خۆیانە، پارێزیارە هۆشیارەکان لە لووتیان دەدەنەوە[١٦٣](*****).

پرۆفیسۆر ئۆکشۆت کۆپییەکی ئاڵۆزتری ئەم ئەزموونگەرییە بە هەرەمێنەمان دەداتێ: پێمان دەڵێ لە کاروبارە سیاسییەکانماندا لە دەریایەکی بێ سەرو بندا دەریاوانی دەکەین، کە لەم دەریایەدا نە خاڵی دەستپێکردن و نە خاڵی کۆتایی هەیە، هەروەها تێیدا ئامانجمان ئەوەیە تەنها بەسەر ئاوکەوتوویی لە ناو کەشتییەکی ئارامگرتوودا بمێنینەوە[١٦٤].

پێویستیم بەوە نییە بە دوای کەتەلۆگی ئەو نووسەرە نوێیانە دابچم، کە «یۆتۆپیاگەرایی» و «مێسیانیزمی» (******) سیاسییان تۆمەتبارکردووە؛ ئەمانە بوونەتە ناووناتۆرەی ئایدیا فرە ئەنجامەکانی رادیکالی دەربارەی داهاتووی کۆمەڵگە.

وەنەبێ هەوڵی تاووتوێکردنی ئاراستە نوێکانیش بدەم لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، کە لەوێدا مێژوونووس و بیردۆزدانەرە سیاسییەکان کەمتر لە هاورێکانیان لەم وڵاتەدا سڵ دەکەنەوە بۆ ئەوەی بە راشکاوی هاوسۆزی خۆیان بۆ پارێزیاری چاوەڕاو بکەن. تەنها تێبینییەک وەردەگرم، کە لە لایەن بەناوبانگترین و مامناوەندیترین مێژوونووسی پیارێزیاری ئەمریکییەوە نووسراوە، ئەویش پرۆفیسۆر سەمۆئیل موریسنە لە زانکۆی هارڤەرد-دا، مۆریسن لە گوتاری سەرۆکایەتی خۆیدا بۆ کۆمەڵەی مێژوویی ئەمریکی لە دیسەمبری ١٩٥٠-دا پێی وابوو کاتی بەرپەرچدانەوەی ئەوە هاتووە، کە پێی دەوت هێڵی جێفەرسۆن- جاکسن- ئێف. دی. رووزڤێڵت، هەروەها راڤەی مێژوویەکی کرد بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە لە روانگەی پارێزیارییەکی ماقووڵانەوە نووسرابێت(١٦٥).

وەلێ بە هەر کلۆجێک بێت، ئەوە پرۆفیسۆر پۆپەرە لە بەریتانیای گەورەدا زیاتر لە جارێک ئەو تێڕوانینە مقاتانەی پارێزیاری لە راشکاوترین و رەقترین شێوەیدا گوزاشت کردووە.

هەروەها پۆپەر بە رەنگدانەوەی نامیەر لەمەڕ رەتکردنەوەی «بەرنامەڕێزی و ئایدیالەکان» هێرش دەکاتە سەر ئەو سیاسەتانەی ئامانجیان دووبارە داڕشتنەوەی «سەرلەبەری کۆمەڵگەیە» بە هاوسازی پلانێکی روون و بەرچاوی دیاریکراو، لە کاتێکدا پەسنی ئەوە دەکات، کە پێی دەڵێت «ئەندازەی هەنگاو بە هەنگاوی کۆمەلایەتی» (*******) هەروەها بە شێوەیەکی راشکاوانە لە تاوان خستنە پاڵ، لە کۆڵ خۆکردنەوەی بەرە بەرە (piecemeal tinkering)، و (mudding through) (********)(١٦٦) پاشگەز نابێتەوە.

لە راستیدا لە لایەکەوە پێویستە ستایشی پرۆفیسۆر پۆپەر بکەم، چونکە پارێزگارێکی بەهێزی عەقڵە، هەروەها لەگەڵ هیچ رەوتێکی ئێستا و رابردوو بەرەو ناعەقڵانییەت تێکەڵاو نەبووەو نابێت.

وەلێ گەر بڕوانینە رێسای، ئەندازەی هەنگاو بە هەنگاوی کۆمەلایەتی «پۆپەر» ئەوا دەبینین ئەو رۆڵەی بۆ عەقڵی دیاری دەکات چەندە سنووردارە.

هەرچەندە پێناسەی پۆپەر لە بارەی «ئەندازەی هەنگاو بە هەنگاو» زۆر راست و دروست نییە، ئەوا بە شێوەیەکی تایبەتی دەڵێین، کە خۆی لە رەخنەگری «ئامانجەکان» نادات؛ هەروەها ئەو نموونە

وریاکەرەوانەی لەمەڕ کردەوە شەرعییەکانییەوە بە دەستیانەوە دەدات- وەک «چاکسازی دەستووری» و مەرامی یەکسانکردنی زیاتری داهاتەکان،- بە ئاسانی ئەوە پیشان دەدەن، کە دەیەوێت لە چوارچێوەی گرێیانەکانی کۆمەڵگەی هەییماندا کاربکەن(١٦٧).

لە راستیدا، پێگەی عەقڵ لە بەرنامەی پرۆفیسۆر پۆپەردا دەربارەی شتەکان زێتر لە پێگەی کارمەندانی دەوڵەتی بەریتانیا دەچێت، کە ئامادە دەکرێ بۆ ئەوەی لە کاتی دەستەڵات بە دەستەوەگرتندا سیاسەتەکانی حکوومەت بەڕێوەبەرێت و تەنانەت بۆ ئەوەی پێشنیاری چاکسازییە کردەییەکانیش بکات تاوەکو ئەو سیاسەتانە باشتر کاربکەن، وەلێ بۆی نییە پرسیار لە بارەی پێشینە گریمانی ئەسڵیانەوە یانیش لە بارەی ئامانجەکانی کۆتاییەوە بکات.

ئەمەش کارێکی بە سوودە: هەروەها من لە کاتی خۆیدا کارمەندی دەوڵەت بووم.

وەلێ پێم وایە ئەم بە پاشکۆکردنەی عەقڵ بۆ گریمانەکانی پیرۆزی هەیی بە شێوەیەکی تەواو شیاوی قبووڵ نییە. ئەمە چۆنییەتی هزری ئاکتن نییە لە بارەی عەقڵ کاتێک هاوکێشەکەی پێشنیار کرد: شۆڕش= سەربەستی= فەرمانڕانی ئایدیاکان.

پێشکەوتن لە کاروبارەکانی مرۆڤدا، چ لە زانستدا بێت، چ لە مێژوودا بێت، چ لە کۆمەڵگەدا بێت، بە شێوەیەکی لە میانەی گەڕانی مرۆڤەکان بە دوای چاکسازی بەرەبەرەی چۆنیەتی بەڕێوەچوونی شتەکانەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو لە میانەی ئامادەگی ئازایانەی مرۆڤەکان و وەبەرچاوخستنی مەیدانخوازییە بنچەکییەکان بە ناوی عەقڵەوە سەرچاوی گرتووە لە هەمبەر بەڕێوەچوونی شتەکان و ئەو گریمانە ئاشکراو پەنهانانەی، کە وابەستەیان دەبێت.

دەنوارمە ئەو کاتەی تیایا مێژوونووس و کۆمەڵناس و بیرمەندە سیاسییەکانی جیهانی ئینگلیزی زمان لە پێناو ئەو ئەرکەدا دووبارە ئازایەتی بۆ خۆیان دەگێڕنەوە. هەرچۆنێک بێت، ئەوەی بە زۆری شپرزەم دەکات لاوازبوونی باوەڕبوون بە عەقڵ نییە لە نێو رۆشنبیر و بیرمەندە سیاسییەکانی جیهانی ئینگلیزیدا، بەڵکو لە دەستدانی ئەو هەستە بەندوباوەیە، کە دەڵێ جیهان لە جووڵەیەکی هەمیشەییدایە.

هەر لە سەرەتادا ئەم تێڕوانینە دژیەک دەردەکەوێ؛ چونکە زۆر بە کەمی تاووتوێی ئەوەندە سەرپێی دەربارەی گۆڕانکارییەکانی دەوروبەرمان بیستراوە.

وەلێ ئەوەی گرنگ بێت ئەوەیە، کە چیتر گۆڕان وەک دەسکەوت، و وەک دەرفەت، و وەک

پێشکەوتن سەیری ناکرێت، بەڵکو وەک چاوگی مەترسی سەیری دەکرێت. کاتێک زانا سیاسی و ئابوورییەکانمان ئامۆژگاری پێشکەش دەکەن، هیچیان لە هەگبەدا نییە پێشکەشمانی بکەن جگە لە هۆشیارکردنەوە نەبێت لەوەی، کە متمانە بە ئایدیا ریشەیی و فرە ئەنجامەکان نەکەین، هەروەها ئەوەی بۆنی شۆڕشی لێبێت لێی دووربکەوینەوە: ئینجا گەر پێویست بوو پێشکەوتن ئەنجام بدەین، ئەوا چەندەی بتوانین لە سەرخۆ و مقیاتانە ئەنجامی بدەین.

لە کاتێکدا جیهان شێوەی خۆی خێراترو ریشەییتر لە هەر کاتێکی چوارسەد ساڵی ڕابردوودا دەگۆڕێت، ئەمە لای من کوێرایەتییەکی ناوازەیە، چونکە زەمینە نەک تەنها بۆ ترس و بیمی ئەوە سازدەکات، کە جووڵەی فراوانی جیهانی بوەستێ، بەڵکو زەمینەسازی ئەوە دەکات ئەم وڵاتە- و رەنگە وڵاتانی دیکەی ئینگلیزی زمانیش- بە دوای پێشکەوتنی گشتیدا دووچاری هەناسەبڕکێ بن، هەروەها بەبێ هاریکاری و نەگلیداری بەرەو رابردوو دەگێڕنەوە.

سەبارەت بە خۆم، هەروەک کەسێکی گەشبین دەمێنمەوە؛ هەروەها کاتێک سێر لویس نامیەر لەوە وشیارم دەکاتەوە حاشایی لە بەرنامەڕێزی و ئاییدیالەکان بکەم، هەروا پرۆفیسۆر ئۆکشۆت پێم دەڵێت مەبەستمان شوێنێک نییە بە تایبەتی و ئەوەی گرنگیش بێت ئەوەیە هیچ کەسێک کەشتییەکە نەلەرزێنێ، هەروەها پرۆفیسۆر پۆپ دەیەوێ ئۆتۆمبیلە کۆکەیەکی بەهۆی ئەندازەیەکی کەمی بەرەبەرەوە لەسەر جادەکە بمێنێتەوە، هەروەها پرۆفیسۆر تریڤۆر- پۆپەر لە لووتی رادیکاڵە بانگ راهێڵەکان دەداتەوە، هەروەها پرۆفیسۆر موریسن داوای مێژوویەک دەکات، کە بە رۆحێکی پارێزیاری ماقووڵانە نووسرابێت، وا دەنوارمە جیهان، کە لە پاشاگەردانی و ژان و ئازاردا بێت، بە وشە کۆنەکانی زانایەکی مەزنیش وەڵام دەدەمەوە: «لەگەڵ ئەوەشدا- ئەو دەجولێت».

# پەراوێزەکان

1- The cambridge Modern History: its Origin, Authorship and production (1907), pp. 10-12.

2- The New cambridge Modern History: (1957), pp. xxiv-xxv.

3- Quoted in the Listener, 19 June 1952, p. 992.

4- M. Manilii. Astronomicon: Liber Primus (2 nd ed, 1937). P.87.

5- T. Parsons and E-shils, Towards a Genaral - theory. of Acton (3 rd, ed, 1954). p. 167.

6- Lord Geoge Sanger, seventy years a showman (2 nd ed, 1926), pp. 188-9.

7- Dr. kitson ciark, The making of victorian England (1962).

* باگۆزە: مشار.

8- J. B. Bury, seiected Essays (1930), p. 52.

9- G. Barraciough, History in a changing world (1955). p. 14.

10- Lytton strachey, preface to Eminent victorians.

(**) چیرۆک نووسی درێژدادڕ (dry-as-dust): دوای چیرۆکە درێژ دادڕەکانی دکتۆر چۆنز، ئەو کەسە چیرۆک نووسەی سێروالتەر سکۆت نووسەری سکۆتلاندی لە ١٨٣٢-دا هەندێک لە نۆڤلەکانی خۆی بۆی تەرخانکرد، بریتییە لە بابەتی دوور و درێژ (mintiae).

11- Quoted in G.p Gooch, History and Historians in the Nineteenth century, p. 383.

دواتر ئاکتن لە بارەی ئاکتنەوە دەڵێت، بەهرەیە وای لێکردووە فەلسەفەی مێژووی لەسەر گەورەترین ئیستقرا دروستیکان(١) کە هەمیشە لای مرۆڤ فەراهەمن.

(History of freedom and other essayes, 1907, p. 435).

12- Cambridge modern History, (1902), p.4.

13- Gustav stresemann, His Diaries, Letters and Papers. i (1935), Editor's

Note.

14- H.Butterfieid, The whig interpretaion of History (1931). P. 67.

15- AL. Rowse, The end of an epoch (1947), pp. 282-3.

١٦- دەقی ئەم گوتە بەناوبانگەش بەم شێوەیەیە: پێداویستیە پراكتیەكان، كە هەموو بڕیارێكی مێژوویی ناچار دەەن تایبەتمەندی «مێژووی هاوچەرخ» بدەنە تەواوی مێژوو، چونكە هەرچۆنێك بێت دووركەوتنەوە لەكاتی ڕووداوەكان دووبارە نوێكردنەوەیان واپێدەچێ ئەوە بێنێتە بوون، لە ڕاستیدا مێژوو ئاماژە بەپێداویستییەكانی ئێستاو ڕەوشی ئێستا دەدات كە ئەو ڕووداوانەیان تێدا دەلەرنەوە.

(B. Groce, Histoy as the story of liberty. transi. 1941. P. 19).

17- Atlantic Monthly, October 1910, p. 528.

18- M. Oakshott, Experience and it's Modes (1933). p. 99.

19- G.m. trcvelyan, An autobiograhy (1949), p.11.

20- J. Burckharat, Judgments on History and Historions (1959), p. 199.

21- Introduction to. J.Burtkardt, Judgements on history and Historians (1959).p.17.

٢٢- تێڕوانینی نیتچە دەربارەی مێژوو بەراورد بكە: كارەكانی مرۆڤی كۆن لە كلتوری مێژووییدا بۆ سەردەمی كۆنی حەزكردنی بەرابردووەو كۆكردنەوەی وەسف و حیسابەكانی و گەڕان بەدوای لە یادكردنی یادگارییەكانی ڕابردوو، دەگەڕێتەوە.

(Thoughts out of season, Eng. trans., 1909. ii. pp. 65-6).

23- R. collingwood, The Idea of History (1946), P.Xii.

24- Beyond Good and Eyli, ch.i.

25- Devotions upon Emergent Occasions, No. Xvii.

26- J.s. Mill, A system of logic, vii, I.

٢٧- دووركهایم لە توێژینەوە بەناوبانگەیدا دەربارەی خۆكوژی وشەی (anomie) بەكارهێنا بۆ ئاماژەدان بەرەوشی تاكەكەسێكی لە كۆمەڵگەكەی - حاڵەتێكە بەتایبەتی ڕێنوێنی كەری شڵەژانی هەست و سۆزو خۆكوشتنە؛ هەروەها پیشانی داوە كە خۆكوشتن بەهیچ شێوەیەك لە هەلومەرجە كۆمەڵایەتییەكان دابڕێنە.

٢٨- شایانی باسكردنە تاكە نووسەرێكی تری پارێزگاری بەبایەخی بەریتانی، كە لە نێوان هەردوو

جەنگەکەدا تایبەتمەندی پاشخانێکی نا بەریتانی هەبوو، بریتیبوو لە تی. ئێس ئیلیۆت؛ هەر کەسێک پێش ساڵی ١٩١٤ لە بەریتانیای گەورە پەروەردە ببوایە نەیدەتوانی بەتەواوی لە دەست کاریگەرییەکانی یاساغ کردنی تەقلیدی لیبرالی رابکات.

٢٩- دەقی رەخنە ئەسڵییەکە لە گوتارێکی نادیاردا هاتووە بەناوی، تێڕوانینی نامیەر لە بارەی مێژوو، کە لە رۆژنامەی تایمز (The times literary) لە ٢٨ ئۆگستی ١٩٥٣-دا بڵاوکراوەتەوە بەم شێوەیەی خوارەوە: داروین بە رامالینی ئاوەز لە مرۆڤ تۆمەتبارکرا؛ سێر لویس بەزیاتر لە مانەیەک داروینی مێژووی سیاسی بوو.

30- L. Namier, personalities and powers (1955), pp. 5,7.

٣١- لێرەدا قەرزاری راڤەکردنە سەرکەوتووەکەی دکتۆر دەبڵ یوو. ستارک - م دەربارەی پەرەسەندنی ماینەکە لە پێشەکییەکەیدا بۆ وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەی (DieIdee de stqqtsa-son)، کە لەژێر ناوی ماکیاڤیلیزم لە ١٩٥٧-دا بڵاوکراوەتەوە؛ لەوانەیە دکتۆر ستار لە سروشتی سەرووی عەقلانیەت لە سێیەم سەردەمی ماینەکەدا زێدەڕۆیی بکات.

32- H. Butterfieild, The whig interpretation of History (1931):

لەلاپەڕەی ٦٧-دا نووسەر دادەنێت بە، جۆرە گومانێکی تەندروست لە بارەی پاساو گیانێکی لە جەستە جیاکراوە.

33- H. Butter fieild, The whig interpretation of History (1931), pp. 11-13, 2.

34- H. Butter feild, The Englishmun and His History (1944), pp. 2-4-5.

٣٥- مارکوس ئۆریلیوس لە ئاوابوونی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا خۆی بەرەنگدانەوەی ئەوە ماتەمبارکرد، چۆن هەموو رووداوەکانی ئێستا روودەدەن لە رابردووشدا روویان داوە، و لە داهاتووشـــدا روودەدەن (To Himself, x. p. 27.)؛ هەروەک باش دەزانرێ توینبی ئەم بیروباوەڕەی لە کتێبەکەی شینگەر بەناوی، لەبەریەک هەڵوەشانی رۆژئاوای وەرگرتووە.

36- Preface, dated 4 December 1934, to A History of Europe.

37- Acton, Lectures on modern History (1906). P.33.

38- American Historical Review, I vi, No (Jan 1951), P.270.

39- C.V. wedgwood, The king's peace (1955). P. 17.

40- A.L. Rowse, The England of Elizabeth (1950), pp. 261-2, 282.

جێگای خۆیەتی ئاماژە بەوە بدەم، کە لە گوتارەکەی پێشتر دکتۆر راوز ئەو مێژوونووسانە تۆمەتبار

دەکات، کەوا بیردەکەنەوە بوغ بۆ لە دووبارە دامەزراندنەوەی پادشایەتیی لە دوای ساڵی ١٨٧٠ لە فەڕەنسا کتو مت و بەهۆی شوێنکەوتنی هنری پێنجەم بەدوای ئاڵایەکی سپی بچووکەوە شکستی هێناوە، (The English of an Epoch, 1949, p. 275)

رەنگە دکتۆر راوز ئەم جۆرە روونکردنەوە کەسیانە. بۆ مێژووی ئینگلیز هەڵبگرێ.

41- I. Berlin, Historical inervitability (1954). p.42.

٤٢- سەرەرای ئەوە سایکۆلیستە هاوچەرخەکان ئەم هەڵەیە تۆمەتبار دەکەن. سایکۆلۆژیستەکان وەک گروهێک تاکەکەس بەیەکەیەک دانانێن لە سیستەمێکی کۆمەلایەتی کارکەردا، بەلکو بەپێچەوانەوە بەبوونەوەرێکی مادی دادەنێن، کە دواجار وەک پێشینەیەک قایل بووە بۆ دروستکردنی سیستەمە کۆمەلایەتییەکان.

کەوابوو ئەوان بەتەواوی وەسفی ئەم مانایە سەیرەیان نەکردووە، کە تێیدا پۆل و چەشنەکانیان و بەتین.

(Professor Talcott parsoms in the introduction to Mark weber, The Theory of Social and economic or ganization, 1947, p.27).

هەروەها بڕوانە سەرنجەکان دەربارەی فرۆید، ل ١٣٨ ، دواتر.

43- Home and Foreign Review, January 1863, p.219.

٤٤- هەربەرت شپێنسەر لە شێوازە سامناکەکەی لە کتێبی، توێژینەوەی کۆمەڵناسی، بەشی دووەمدا ئەم هزرەی بەدرێژی تاوتوێکردووە: گەر دەتەوێ پێودانگی عەقڵی هەرکەسێک هەڵبسەنگێنی، ئەوا باشترین رێگە بریتییە لە تێبینیکردنی رێژەی گشتاڵیەتییەکانی گفتوگۆی خۆی بۆ کەسەکان - ئایا تا چەند راستییە هەڵێنجراوەکان لە ئەزموونە زۆرو زەبەندەکانی مرۆڤ و شتەکان جێگەی ئەو راستییە سادەو ساکارانە دەگرنەوە، کە دەربارەی تاکەکەسانن. هەروەها کاتێک زۆرینەیان دەخەیتە بەر پێوانەوە، کێشەکان دەدۆزیتەوەو وەلێ کەمێکی پەرش و بلاو لەوانەیە هەر شتێک زیاتر لە تێروانینی بایۆگرافی کاروبارەکانی مرۆڤ بگرنە ئەستۆ.

45- H. E. Trevor- Roper, Historical Essays (1957). P. 281.

46- Marx- Engles: Gesamtausgabe, I, iii, p. 625.

(***) مێردەزمە: دێوەزمە، پیرەڤۆک، مۆتەکە، کابوس (night mare).

47- Hisoroy of the french revolution, III, iii, ch.I.

48- Lenin, Seiected works, vii,p. 295.

49- Clarendon, A Brief view g survey of the dangeroms g pernicious Er-

rors to church g state in Mr Hobbes, book entitled Leviathan (1676), p. 320.
50- L. Tolstoy, war and peace. ix, ch. I.
51- H. Butterfield, the Englishman and his History (1944). p.103.
52- B.W. Tuchman, the zimmer man Telegram (N.y., 1938), p.: وەرگـــیـــراوە لە
180.
53- I. Berlin, Historical inevitability (1954):p.7 دەستەواژەکە وەرگیراوە لە
- کە بەگوێرەی ئەم زاراوانە وادیارە نووسینی مێژوو دەست پێکا.
54- A. J p. Taylor, From ivapoiean to Stalin (1950), p. 74.
55- Gibbon, Dicline and Fall of the Roman Empire, Empire, ch. lxx.
56- V.G. childe, History (1947), p.43.
57- philosophy of right (English fransli. 1942), p. 295.
58- F. R. Leavis, The great tradition (1948), p.2.
59- J. Burckhardt, Judgement on History and on Historians. (1955), p.
158.
60- B. Rusell, portraits from Memory (1958), p. 20.
٦١- لە ئاخیرو ئۆخری ساڵی ١٨٧٤، برادلی بەو بیانوو زانستی لە مێژوو جیادەکردەوە، کە بێ کات و، جێگیرە.
(F.H. Bradley, collected Essays, 1933, i. p. 36).
62- Thoughts and Details on society (1975), in the works of Edmund
Burke (1846), iv, p.270. بێرکە گەیشتۆتە ئەو دەرئەنجامەی ، کە لە توانای دەوڵەتدا نییـــە وەک دەوڵەت، یانیش تەنانەت لە توانای دەوڵەمـــەندەکـــاندا نەبووە وەک دەوڵـەمـــەند بۆ یارمـەتیدانی کەسێکی هەژار لەڕووی ئەو پێداویستـیـیـانەی، کە بایەخی خـوداوەندی ئارەزووی لێیەتی بۆ ئەوەی ساتێک لەبەرچاویان بیشارێتەوە.
63- M.R. cohen and E. Nagel, introduction to Logic and scientific Method
(1934), p. 596.
64- sir charlies Ellis in trinty Review (cambridge, Lant term. 1960), p. 14.
65 Marx - Engels: Gesamtausgabe, I, vi, p. 179.
66- W. sombart, The Quintessence of capitalism (Engl. transl. 1915), p.

354.

67- G. Sorel, Matêriaux dune thêorie du polêtarait (1919), p.7.

68- Dr. Ziman in the Listener, 18 August 1960.

69- Poetics, ch. ix.

70- R. G. Collingwood, Historical imagination (1935), p. 5.

71- Leviathan, I. iv.

72- Decline and Fall of the Roman Empire, ch. xx, ch. 1.

73- History of the french revoliution, I. V. ch. 9, III, i, ch. 1.

74- J. Burckhardt, Judgments on History and Historians (1959), 34.

75- Cambridge modern History, ii (1958), p. 20.

76- Marx and Engels, works (Russian ed), xv, p. 378.

ئەو نامەیەی، کە ئەم بڕگەیەی لێ وەرگیراوە لە ڕۆژنامەی Otechestvennye zapiski, 1877.- دا بڵاوکراوەتەوە.

وادیارە پرۆفیسۆر پۆپەر مارکس لەگەڵ ئەوەدا بەندیوار بکات، کە پێی دەڵێ، هەڵەی ناوەندی هیستریپۆسیزم، ئەو باوەڕەی، کە پێی وایە مەبەستە مێژووییەکان یان ئاراستەکان، دەتوانرێ ڕاستەوخۆ تەنها لە یاسا گشتییەکانەوە وەربگیرێن،

(The poverty of Historicism, 1957, pp. 128 - 9) :

ئەمەشیان بریتییە لەوەی مارکس بەشێوەیەکی وردو دروست ڕەتیدەکاتەوە.

٧٧- وادیارە ئەمە تێڕوانینی پرۆفیسۆر پۆپەر بێت.

(The open society, 2nd ed.. 1952, ii. p. 322) بەداخەوە نموونەیەک دەربارەی یاسای کۆمەڵناسی دەخاتە بەردەست: لەهەر کوێیەک ئازادی بیرکردنەوەو، ئازادی پەیوەندی بیرکردنەوە بەشێوەیەکی چالاک لەلایەن دامەزراوە یاساییەکانەوە بپارێزرێ و دامەزراوەکان گشتاڵیەتی گفتوگۆکردن دەستەبەر بکەن، ئەوا لەوێدا پەرەسەندنی زانستی هەیە. ئەم وتەیە لە ١٩٤٢ یان ١٩٤٣ نووسراوەو بەشێوەیەکی ئاشکراش بەهۆی ئەو باوەڕەوە سروشکرابوو کە دیموکراسی ڕۆژئاوا بەهۆی ڕێکوپێکی دامەزراوەییەکانی لە پێشەنگی پێشکەوتنی زانستیدا دەمێنێتەوە باوەڕێک، کە بەهۆی پەرەسەندنەکان لە یەکیەتی سۆڤیەتدا دواجار تارومارکرا یان بەڕەقی هەموارکرا. ئەمەش نەک هەر یاسا نییە، بەڵکو تەنانەت گشتاندنێکی شەرعیش نەبوو.

78- K. Mannheim, Ideology and Vtopia (Engl. tramsl. 1936). p. 228.

79- Cours de phlosophie positive, p.51.

80- K. mannheim, Ideolgy and Utopia (1936). p. 130.

٨١- نووسەر ئەم گفتوگۆیەی لەم کتێبەدا پەرەپێدا:
The Bolshevik Revolution, 1917-1923, i (1950), p. 42.

82- M.C. D. Aarcy, The sense of History: secular and Sacred (1959), p. 164.

وەلێ پۆلیبیۆس بەم وتەیە پێش دارسی دەکەوێ، کە: لە هەرکوێدا گونجا هۆکاری ئەوەی روودەدا بدۆزرێتەوە، پێویست ناکا یەکێک پەنا بباتە بەر خوداوەندەکان، دەستەواژەکە لەم کتێبە وەرگیراوە:
K. Von Fritz, The theory of the mixed constiution in Antiquity, N.Y. 1954, p. 390.

83- Rosebery. Napoleon: The last phase, p. 364.

84- Acton, Historical Essays and studies (1907), p. 505.

85- Survey of international affairs, ii. 3.

86- I. Berlin, Historical Inevitability, pp. 76-70.

هەڵوێستەکەی سێر ئیسیاه تێڕوانینەکانی فیتزجامز ستێفنی قازی سەرسەخت و کۆنە نەریت پارێزی سەدەی نۆزدەهەم دێنێتەوە یاد: یاسای تاوانکاری پشت بەو بنەمایە دەبەستێ، کە بێزاندنی تاوانبارەکان لەڕووی ئەخلاقییەوە شتێکی راستە... شتێکی زۆر ویستراویشە، کە پێویستە تاواباران ببێزێندرێن، بەشێوەیەک ئەو سزایانەی بەسەریاندا جێبەجێدەکرێن لە ئاستی گوزارشتکردنی ئەو رق و کینەیە بێت، هەروەها بۆ ئەوەی بەئەندازەی ئامادەگی گشتی هۆو پێناوەکان بەر پاساوی بکات و بتوانێ قایلکردنی ویژدانێکی سروشتی تەندروست هانی بدات و بەرپاساوی بکات، (A History of criminal law of England, 1883, ii. op. 81-20. quoted in L. Radzinowicz, sir James Fitzjames stephen, 1957. p/ 30).

ئەم تێڕوانینانە چیتر لەلایەن تاوان ناسانەوە جێگای قبووڵ نین؛ بەڵام راجیاییم لەگەڵ ئەواندا لێرەدا ئەوەیە، کە بەچاوپۆشین لە شەرعیەتیان لە بوارەکانی دیکەدا، ئەوانە لەگەڵ بڕیارەکانی مێژوودا ناگونجێن.

87- D. knowles, The Historian and character (1955), pp. 4-5, 12-19.

88- B. Groce, History as the story of Liberty (Ehgl. trnsil, 1941). P. 47.

89- Peuples et civilizations, vol- xiv, Napolêon. 58.

90- Max weberi Essays in sociolagy (1947), p. 58. وەرگیراوە لە

91- Boswell, life of Doctor Johnson, 1776 (Every man ed. ii, p. 20).

ئەم گووتەیە شیاویەتییەکی بێ پێچ و پەنای هەیە، بورکهاردت لە (کتێبی بڕیارەکانی دەربارەی مێژوو - و - مێژوونووسان، ل٨٥) فرمێسک بەسەر، ناڵە بێدەنگەکانی قوربانیانی پێشکەوتندا دەڕێژێ، کە جگە لە (parta tueri) هیچ شتێکی تریان نەدەویست، وەلێ ئەو خۆی دەربارەی ناڵەی قوربانیانی رژێمی کۆن بێ دەنگ بوو، کە بەشێوەیەکی گشتی هیچیان نەبوو بیپارێزن.

٩٢- نامەی ٢٤- شوباتی ١٨٩٣ بۆ دانیلسن لە کارل مارکس و فردریخ ئەنگلس:

correspondence 1846-1895 (1934), p.510.

93- G.P. Snow, the two cultures and the Scientific Revolution (1959), pp. 4-8.

94- De l'esprit des Iois, preface and ch,I.

95- Memorials of Alfred Marshall, ed. A.G. pigou (1925), p. 428.

96- H. Poincare¯, La Science et l'hypothe¯se (1902), pp. 202-3.

97- B. Russel, mysticism and Logic (1918), p. 188.

98- The Education of Henry Adams (Boston, 1928), p. 224.

99- The Poverty of Historicism:

یەکەم جار لە شێوەی پەرتووک لە ساڵی ١٩٥٧-دا بڵاوکرایەوە، بەڵام لە ئەسڵدا لەو گوتارانە پێکهاتبوو، کە لە ١٩٤٤ و ١٩٤٥-دا بڵاوکراونەتەوە.

١٠٠- جگە لە یەک دوو شوێن نەبێت، کە وردی و دروستیان نەدەویست خۆم لە بەکارهێنانی وشەی (Historicism) دوورخستۆتەوە، چونکە نووسینە پڕ خوێندنەوەکانی پرۆفیسۆر پۆپەر دەربارەی ئەم بابەتە زاراوەی مانای وردو دروستیان پووچەڵکردۆتەوە. رشتبوونی بەردەوامی لەسەر پێناسکردنی زاراوەکە کارێکی زانایانەیە. وەلێ پێویستە مرۆڤ ئەوە بزانێ یەکێک لە بارەی چییەوە دەدوێ، هەروەها پرۆفیسۆر پۆپەر (Historicism) وەک سەبەتەیەکی بڵاوکراوەکان بۆ هەر بۆچوونێک دەربارەی مێژوو بەکاردەهێنێ، کە حەزی لێناکا، هەندێکیان لای من راست دەردەکەون، هەندێکی تریشیان وا گومان دەبەم لە لایەن هیچ نووسەرێکی جدییەوە لەم رۆژگارەدا باوەڕیان

پێنەکرێ. هەروەک دان بەوەدا دەنێت (Poverty of Historicism, p.3)، کە چەند بەڵگەیەکی، (Historicist) داهێناوە پێش ئەو هەرگیز لە لایەن هیچ (Historicist)-ێکی زاندراوەوە بەکارنەهێنراوە. لە نووسینەکەیدا (Historicism) هەریەک لەو دوو پێڕۆیە دەگرێتەوە، کە مێژوو دەبەنە نێو زانستەوە، هەروەها ئەو پێڕۆیەش، کە بە توندی هەردووکیان لە یەکتری جیادەکاتەوە. لە کتێبی کۆمەڵگەی کراوەدا، چونکە هیگڵ خۆی لە بەربینیکردن دوورخستۆتەوە، وەک ئوولەوەرێکی باڵای دادەنێت؛ لە پێشەکی کتێبی «نەداری هیستۆریسیزم» هیستۆریسیزم وەک ڕێبازێی زانستە کۆمەڵایەتییەکان وەسف دەکرێت، ئەوەش گریمان دەکات بەربینیکردنی مێژوویی ئامانجی سەرەکیانە، تا بە ئەمڕۆش دەگا (historicism) بە شێوەیەکی گشتی وەک وەرگێڕانە ئینگلیزییەکەی (Historicism) ئەڵمانی بەکارهێنراوە، کە وابوو شڵەژانێکی تر دەخاتە سەر بەکارهێنانە شڵەژاوەکەی پێشتری زاراوەکە.

M.C.D' Arcy, the sense of History: secularand and sacred (1959), p.11.

دارسی وشەی (historicism) وەک وشەیەکی هاوڕێک لەگەڵ فەلسەفەی مێژوو-دا بەکاردەهێنێ.

١٠١- هەرچۆنێک بێت، یەکێکی زانکۆی ئۆکسفۆرد لە زنجیرەیەک پەخشی رادیۆییدا بەو بیانووە هێرشی دەکردە سەر ئەفلاتوون، کە گوایە یەکەم فاشیستە. R.H. crossman, plato. today (1937).

102- C .Kingsely, the limits of exact science as applied to History (1860), p. 22.

103- Determinism...

واتە... ڕاستییەکان بریتین لەوەی هەن، هەرچییەک ڕوودات بە شێوەیەکی دیارو سنووردار ڕوودەدات و ناکرێ جیاوازبن.

باوەڕکردن بەوەی دەکرێت، تەنها مانای ئەوەیە، کە تەنها ئەگەر ڕاستییەکان جیاوازبووبن.

(S.W. Alexander in Essays presented to Ernest Cassirer, 1936, p. 18.

104- K. R. Popper, the open society (2nd ed: 1952), ii, p. 197.

١٠٥- لە لایەن جیهانەوە یاسای هۆکارگەرایی بەسەر ئێمەدا، ناسەپێنرێ، بەڵکو لەوانەیە دەهەنبەر ئێمە گونجاوترین میتۆدی خۆگونجاندمان بێت لەگەڵ جیهاندا.

(J. Ruff, from the physical to the social science, Baltimore, 1929, p. 52)

پرۆفیسۆر پۆپەر لە (the logic of scientific Enquiry, p. 284.)-دا خۆی باوەڕبوون ب

هۆکاریگەرایی بەم شێوەیە ناوزەد دەکات: پەتیکردنێکی ئایدیالی ئەودیوو سروشتی ڕێسایەکی تەواو بەڕیاساوکراوی میتۆدۆلۆژییە.

106- Decline and fall of the Roman Empire, ch, 1xiv.

108- W. churchill, the world crisis: the after math (1929), p. 386.

109- L. trotsky, my life (Eng. transl., 1930), p. 425.

دەربارەی گفتوگۆی بیری دەرباری ئەم خاڵە بڕوانە:

The IÒea of progress (1920) pp. 303-4.

110- Decline and fall of the Roman Empire, ch, xxxiii.

جێگای خۆش سەرنجێکە تێبینی ئەوە بکەین، دوای ئەوەی گریگەکان کەوتنە ژێر دەستی ڕۆمەکانەوە، هەروەها لە گەمەی ئەگەر و مەگەرەکانی مێژوویيدا قووڵبوونەوە، کە باشترین ماتەمی تێکشکاوەکانە دەیانگوت: گەر ئەسکەندەری گەورە بە گەنجی نەمردایە، هەر خۆیان بە خۆیان دەوت، ئەوا لەوانەیە ڕۆژئاوای داگیر بکردایە و ڕۆما دەبوویە هەواداری پاشاکانی یۆنان.

(K. von fritz, the theory of the mixed Constitution in Antiquity, N. Y., 1954, p. 395).

١١١- هەردوو گوتارەکە لەم پەرتووکەدا چاپکراونەتەوە:

J.B. Bury, selected Essays (1930);

دەربارەی ڕەخنەکانی کۆلینگ وود لەمەڕ تێڕوانینەکانی بیری بڕوانە:

The Idea of History. pp. 148-50.

دەربارەی بڕگەکە بڕوانە ل٤٣ و دواتری.

١١٢- بە شایەت وەرگرتنی وتەکەی فیشەر لە لایەن توینبییەوە لە کتێبی (A study of History, V, p. 414.)-دا لە یەک تێنەگەیشتنێکی تەواو دەردەخات: ئەو چەمکەکە بە بەرهەمێکی بیروباوەڕی هاوچەرخی ڕۆژئاوا دادەنێت لە توانای سەرلەبەری بەختدا، کە ژیانی کردۆتە بەر سیاسەتی سەربەستی. دانەرای تیۆری سەربەستی (laissez- faire) باوەڕیان بە بەخت نەبوو، بەڵکو باوەڕیان بەو دەستە پەنهانە هەبوو، کە سوودمەندی پێوەرە ڕێکەکان لەسەر جۆراوجۆریەتی ئاکاری مرۆڤ دەسەپێنێ؛ هەروەها سەرنجەکەی فیشەر بەرهەمێکی لیبرالیزمی (laissez- faire) نەبوو، بەڵکو بەرهەمی لە کارکەوتنی بوو لە ١٩٢٠-ەکان و ١٩٣٠-یەکاندا.

١١٣- ئەو بڕگانەی پەیوەندییان بە بابەتەکەوە هەیە لە لایەن دەبڵ یوو سارکەوە وەرگیراون لە پێشەکییەکەیدا بۆ:

F. meincke, machiavellism, pp. xxxv- xxxi.

114- Marx and Engels, works (Russian ed), xxvi, p. 108.

١١٥- تۆلستۆی لە (War and peace, Epilogue i)-دا «بەخت» و «لێهاتوویی» وەک دوو زاراوەی خۆدەربڕی نەتوانایی مرۆڤ لە تێنەگەیشتنی دوا هۆکارەکان هاوسەنگ دەکات.

116- L. trotsky, my life (1930), p. 422.

١١٧- تۆلستۆی ئەم تێڕوانینەی هەبووە: «ناچارین بۆ راڤەکردنی رووداوە ناعەقلانییەکان، واتە ئەو رووداوانەی لە عەقلانییەتیان تێناگەین پەنا ببەینە بەر چارەنووسازی قەزا و قەدەرەکان».
(War and peace, BK ix, ch. i);

هەروەها لە ل١٠١، پەراوێزی (٣) بڕوانە دەقی بڕگەکە.

118- L. Paul, the Annihilation of man (1944), p. 147.

١١٩- پرۆفیسۆر پۆپەر لە چرکە ساتێکدا بەسەر ئەم خاڵەدا دەکەوێ، وەلێ ناتوانی لێی تێبگات. پۆپەر فرەیی ئەو شرۆڤەکردنانەی گریمانکردووە، کە بە شێوەیەکی بنچینەیی لە هەمان ئاستی پێشنیازییەتی و بڕیار سەپاندن-دان (ئینجا مانای شاراوەی ئەم دوو وشەیە هەرچییەک بێت)، پۆپەر لە نێوان دوو کەوانەدا بە شێوەیەکی سەربارەکی دەڵێ، رەنگە هەندێکیان لە میانەی بە پیت و بەرەکەتییانەوە جیابکرێنەوە- ئەم خاڵە تا رادەیەک گرنگە، (The poverty of Historicism, p. 151).

ئەم خاڵە گرنگییەکی نییە، بەڵکو تەنها ئەو خاڵەیە، کە ئەوە دەسەلمێنێ، «Historicism» (بە مانایەک لە ماناکان) ئەوەندە نەدار نییە.

120- Kausalitaten und werte in der Geschichte (1928), trnslated in F, Stern, Varieties History (1957), pp. 268-273.

121- J. Huizinga, translated in Varieties of History, ed. F. Stern (1957), p. 293.

122- The baldwin age, ed. John Raymond (1960), p. 246.

123- F. Powicke, modern History and the study of History (1955), p. 174.

124- History Passes over into theology, as toynbee triumphantly asserted (Civilization on Trail, 1948, preface).

125- De retrum natura, iii, ll. 992-5.

126- Gibbon, the Decline and fall of the Roman Empire, ch. xxxviii;

هۆکاری ئەم پێوەچوون و لە باس لادانەش دارمانی ئیمپراتۆریەتی رۆژئاوابوو.
لە ١٨-ی نۆڤەمبەری ١٩٦٠-دا رەخنەگرێک لە پاشکۆی رۆژنامەی تایمزدا ئەم برگەیە وەردەگرێت و دەپرسێت ئایا گیبۆن کتومت مەبەستی ئەوەبووە. بێگومان مەبەستی ئەوە بووە؛ زیاتر پێدەچێ تێروانینی نووسەر ئەو سەردەمە رەنگبداتەوە، کە تێیدا ژیاوە نەک ئەو سەردەمەی دەربارەی دەنووسێت- ئەم رەخنەگرە راستییەکی باش روونکردۆتەوە، ئەو بە دوای ئەوەدا دەگەرێ گومانگەرایی ناوەراستی سەدەی بیستەمی خودی خۆی بۆ نووسەرێکی ئاخر و ئۆخری سەدەی هەژدەهەم بگوازێتەوە.

127- Cambridg Modern History: its origin, Authorship, and production (1907), p.13; Cambridge modern History, i (1902), p. 4; xii (1910), p. 791.

128- B. Russel, portraits From memory (1956), p. 17.

129- J. B. Bury, the Idea of progress (1920), pp. vii-viii.

130- B. Russell, portraits from memory (1956), p. 124.

131- The observer 21 June 1959.

132- T. Arnold, An Inaugural Lecture on the study of modern History (1841), p.38.

133- Action, lectures on modern History (1906), p.51.

134- K. Mannheim, Ideology and Utopia (Engl. transl, 1936), p.236,
هەروەها کارل منهایم ویستی مرۆڤ بۆ دروستکردنی مێژوو بە توانای خۆیەوە بەندیوار دەکات بۆ تێگەیشتن لە مێژوو.

135- F.H. Bradley, Ethical studies (1876), p.293.

١٣٦- بۆ دیاریکردنی رەوشێکی لەم جۆرە بروانە:
R.S. Lynd, knowledge for what? (N.Y., 1939), p.88:
لە چاندنی ئێمەدا بە زۆری خەلکی بەسالاچوو رووەکەنەوە رابردوو، رووەکەنەوە کاتی توانا و دەسەلاتیان، بەلام وەک مەترسییەک بەرەنگاری داهاتوو دەبنەوە.
هەروەها لەوانەیە سەرلەبەری چاندێک لە قۆناغێکی پێشکەوتووی لەدەستدانی هێزو لەبەریەک هەلوەشانی رێژەییدا رووبکاتە سەردەمێکی زێرینی لەدەست چوو، لە کاتێکدا ژیان بە درێژایی سەردەمی ئێستا بە شێوەیەکی خاو و خلیسک بەرێوە دەروات.

137- Foreign Affairs, xxviii, No.3 (June 1950), p.382.

138- J. B. Bury, the Idea of progress (1920), p.ix.

139- H. Butterfield, The whig Interpretation of History (1931), p.58.

ئەم دەستەواژەیە لەگەڵ دەستەواژەیەکی فراوانتردا بەراورد بکە:
یەکباری تەوەزەلی و جووڵە، چەقبەستوویی و دینامیکی بریتین لە کاتیگۆری بنچینەیی بەمانەش ڕێبازی تێگەیشتنی کۆمەڵناسی لە مێژوو دەستپێدەکات... مێژوو تەنها بە مانایەکی ڕێژەیی یەکباری تەوەزەلی دەناسێت: پرسیاری گرنگ و یەکلاییکەرەوە ئەوەیە ئاخۆ یەکباری تەوەزەلی یانیش گۆڕان سەردەکەوێ. گۆڕان لە مێژوودا سرشتێکی پۆزەتیف و ڕەهایە، بەڵام یەکباری تەوەزەلی سرشتێکی خوودی و ڕێژەییە لە مێژوودا.

A. Von martin, The sociology of the Renaissance (Engl. transl., 1945), p.i.

140- De tocqueville, preface to Democracy in America.

141- J. B. Bury, the Idea of progress (1920), p.5.

142- L. B. Namier, conflicts (1942), p.70.

143- Quoted in J. Huizinga, men and Ideas (1959), p.50.

144- Gobbon, The Decline and fall of the Roman Empire, ch.IV.

145- R. H. Tawney, The Agrarian problem in the sixteenth century (1912), p.177.

146- Lectures on Philosophy of History (English transl,1884), p.40.

147- T. Carlyle, the french Revolution, I, i, ch. 4; I, iii, ch.7.

148- Broad cast on political Judgement, in the B.B.C. Third programme, 19 June 1957.

١٤٩- بە تایبەتی حاڵەتی Pravada جێگای سەرنجە، چونکە وشەیەکی دیکەی کۆنی ڕووسی istina لە(1) بەرامبەری truth هەیە.
وەلێ جیاکردنەوەکە لە نێوان truth وەک ڕاستی و truth وەک بەها نییە؛ Pravada لە هەریەک لە دوولایەنەکەوە ڕاستیارییەکی مرۆڤە، istina لە هەریەک لە دوو لایەنەکەوە ڕاستیارییەکی یەزدانییە-واتە ڕاستیاری دەربارەی یەزدان و ڕاستیارییەک یەزدان دەریدەخا.

(****) founding fathers: واتە داهێنەرانی دەزگایەک یان بزووتنەوەیەک هەروەها بریتین لە ئەندامانی (*) کۆنگرەی دەستووری ئەمریکا لە (١٧٨٧)-دا. (وەرگێڕ).

150- J. Burckhand, Reflections on History (1959), p.31.

151- A. de Tocqueville, De l'Ancien Re¯gime, III, ch. I.

152- Cambridge University library: Add. MSS: 4870.

153- The quotation are from Hegel's philosophy of History.

154- Capital, iii (Engl. transl. 1909), p.369.

155- Cambridge modern History, xii (1910), p.15;

نووسەری بەشەکە ناوی، ئێس لیتس بوو، کە یەکێکە لە نووسەرانی مێژووەکە و کۆمیسیاری سەربازی مەدەنی.

156- Vierteljahrshefte fur Zeitgeschichte (munich), i (1953), p.38.

١٥٧- لە بارەی نشووستی گفتوگۆکە بڕوانە ئەم پەرتووکەی نووسەر

The New Society (1951), ch.4 passim.

158- Von martin, The sociology of Renaissance (Engl. transl., 1945), p.18.

159- Cambridge Modern History: its origin, Authership and production (1907), p.14.

160- E. G. pulleyblank, chinese History and world History (1955), p36.

١٦١- بۆ ئەم بڕگانە بڕوانە:

Acton, selection from correspondence (1971), p.278; Lectures on modern History (1906), pp.4, 32; Add MSS.4949 (in Cambridge university Library).

ئاکتن لە نامەی ساڵی ١٨٨٧-دا، کە پێشتر شایەتی پێدرا گۆڕان لە سوونگەی ویگە «کۆن» و «نوێکانەوە» (واتە لیبڕالییەکان) وەک، دۆزینەوەی ویژدان «تێبینی دەکات»: (ویژدان لێرەدا بە شێوەیەکی روون و بەرچاو بە پەرەسەندنی «هۆشیارییەوە» بەندیوارە (بڕوانە ل. )، هەروەها هاوڕێکی «فەرمانڕەوایی ئایدییاکانە». ستەبز مێژووی مۆدێرنی بۆ دوو سەردەم دابەشکردووە، کە شۆڕشی فەرەنسی دەکەوێتە نێوانیانەوە: «یەکەم مێژووی دەستەڵات و هێز و نەوەچڕکەکانە؛ دووەم ئەو مێژووەیە، کە تێیدا ئایدیاکان جێگەی ماف و شێوەکان دەگرنەوە)

(W. Stubbs, seventeen Lectures on the study of mediaval and modern History, 3rd. 1900. p.239.

١٦٢- بڕوانە ل.

163- Enconnter, vii, No.6, June 1957, p.17.

(*****) لە لووتدانەوە:

164- M. Oakeshott, political Education (1951), p.22.

(******) مێسیانیزم (messianism): واتە باوەڕبوون بە مێسیا؛ بە تایبەتی بریتییە لە بزووتنەوەیەکی ئایدیۆلۆژی یانیش پیرۆزی ئایدیاکان، کە لە میانەی هاتنە سەر دەسەڵاتی میسیاوە رزگاربوونی مرۆڤ رادەگەیەنێ، رەنگە میسیا کەسێک بێت یان چینێک بێت، یان ئایدیایەک بێت. (وەرگێڕ).

165- American Historical review, No. 1vi, No.2 (January 1951), pp.272-3.

(*******) ئەندازەی هەنگاو بە هەنگاوی کۆمەڵایەتی (Piecemeal social engineering): واتە بەڕێوەبردنی مرۆڤەکان بە گوێرەی شوێن و ئەرک و فەرمانیان لە کۆمەڵگەدا. (وەرگێڕ)

(*) (muddling through): بەدەستهێنانی ئەندازەیەک سەرکەوتن بەبێ دانانی پلانێکی گرنگ و یەک لایەنیکەرەوە. (وەرگێڕ)

166- K. Popper, the poverty of Historicism ( 1957), pp.67,74.

167- ibid. pp,64, 68.

(********) ئۆتۆمبێلە کۆنەکە (T- model): لە نێوان ساڵانی ١٩٠٩-١٩٢٧ لە لایەن کۆمپانیای فۆردەوە دروستکراوە. (وەرگێڕ)

جیهانی مێژوونووس کۆپییەکی فۆتۆگرافی جیهانی ڕاستەقینە نییە، بەڵکو دروستکردنی مۆدێلێکە، کە کەمتر یان زێدەتر بەشێوەیەکی چالاکانە وزە دەبەخشێتە مێژوونووس ئەو بەشە لە ڕووداوەکانی ڕابردوو دەپاڵێنێ، کە پێیوایە بەکەڵکی ڕاڤەو شرۆڤەکردن دێن.

توێژینەوەی مێژوو بریتییە لە توێژینەوەی هۆکارەکان. مێژوونووس بەبەردەوامی دەپرسێت، بۆچی؟ مادامێکیش هیوای بەوەڵامێک هەبێت ناتوانێ ئارام بگرێ، مێژوونووسی گەورە، ئەو کەسەیە لە بارەی شتە نوێکان یان لە کۆنتێکستە نوێیەکاندا بپرسێت بۆچی؟

مێژوونووس نە کۆیلەیەکی داماوەو نە سەروەرێکی ستەمکاری ڕاستیەکانیشیەتی. پەیوەندی نێوان مێژوونووس و ڕاستییەکانی بریتییە لە پەیوەندییەکی یەکسانی بەخشین و وەرگرتن. مێژوونووس و ڕاستییەکانی مێژوو هەریەک بۆ ئەوەی تریان پێویستە... لەبەرئەوەی یەکەم وەڵام بۆ پرسیاری، مێژوو چییە؟ ئەوەیە، کە مێژوو پرۆسێسێکی بەردەوامی نێوان ئێستاو ڕابردووە.

دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەی موکریانی
mukriyani@yahoo.com